



| | |
|---|---|
| ناوی کتێب بە عەرەبی | طب القلوب لإبن قيّم الجوزية |
| ناوی کتێب بە کوردی | پزیشکیی دڵان |
| ئامادەکـــــــار | صالح احمد الشامی |
| وەرگێڕانی بۆ فارسی | عبدالعزیز سلیمی |
| وەرگێڕانـــــــــی لەفارســـییەوە بـــۆ کـــــــــوردی | خوبەیب کەمال هەورامی |
| تایـــــــــــپ | ڕیاز مەحموود کاکە مەحموود |
| نەخشەسـازی نـاوەوە | کۆمپیوتەری نارین (محمد علی) |
| نـۆرەو سـاڵی چـاپ | دووەم ٢٠١٤ |
| ژمـــارەی سـپاردن | (١٤٨٦)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە |

دەزگای

چاپو پەخشی نارین

هەولێر: بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

website:www.nareenpub.com

E-mailnareenpub@gmail.com

تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

# پێشەکی

بەناوی خودای گەورە و بێ هاوتا

پێش هەموو شتێ پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کەوا ئەوەی کە بووە هۆکار و پاڵنەرێ بۆم، بۆ ئەوەی ئەم پەرتووکە دەستنیشان بکەم و وەریگێڕمە سەر زمانی پاراوی کوردی چەند شتێ بوو لەوانە: یەکەم، خودی نوسەرەکە، چونکە یەکێ لەو هۆکارانەی کە وا دەبێتە هۆی بەپێزی و ناوازە بوونی هەر پەرتووکێ، بەدڵنیاییەوە نوسەرەکەیەتی و ئایا نووسەری ئەو پەرتوکە تاچەندە لای خەڵکی و بەتایبەتی چین و توێژی خوێنەران و ڕۆشنبیران ناسراوە و ناوبانگی هەیە. دیارە ئیمام (ئیبن قەییمی جەوزی)ش یەکێکە لەو کەڵە پیاو و نوسەر و خامە ڕەنگینانەی کەوا خزمەتێکی بەرچاوی بە مرۆڤایەتی کردووە بە تایبەتی لە بواری ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا.یەکێکی تر لەو هۆکارانە ناونیشانی کتێبەکە بوو بەناوی (طب القلوب) واتە: (پزیشکیی دڵان)، کە وا هەر لە خودی ناوەکەیەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم پەرتووکە باس لە بەشێکی گرنگ و کاریگەری جەستە دەکات کە ئەویش (دڵە). کە بە فەرمانڕەوا و هەڵسوڕێنەری تەولوی ئەندامانی تری جەستە دادەنرێ و لە ئیسلامدا و لە فەرموودە شیرین و ناوازەکانی پێغەمبەریشماندا موحەممەد (ﷺ) باس لەو بەشەی جەستە کراوە و گرنگی پێدراوە. هەر وەك چۆن لە فەرموودەیەکیدا پێشەوا و تاجی سەرمان موحەممەد (ﷺ) فەرموویەتی:"...الا و ان فی الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد کله و اذا فسدت فسد الجسد کله الا و هی القلب". واتە:"ئاگادار بن لە ناو لاشەی ئادەمیزادا پارچە گۆشتێك هەیە ئەگەر ئەم پارچە گۆشتە باش بوو هەموو لاشەو ئەندامانی ئادەمیزا باش ئەبێ، ئەگەر خراپ بوو هەموو لاشە خراب و نارێك ئەبێ، ئەم پارچە گۆشتە (دڵە)".

لە ڕوانگەی ئەم فەرموودەیەوە دەتوانین ئەوە بڵێین کە وا، ئێمەی مرۆڤ کە یەکێکین لە بوونەوەر و دروستکراوەکانی پەروەردگار، گەر بمانەوێ لە ژیانا

خۆشبەخت و کامەران بین و بەدوور بین لە قەلەقی و دڵەڕاوکێ و ناڕەحەتی و چەرمەسەریەکانی ژیان، پێویستە گرنگیەکی ئەوتۆ و بەرچاو بە دڵمان بدەین، کە بە سەنتەر و سەرچاوە و هەڵسوڕێنەری تەواوی حەرەکە و سەکەناتی جەستەمان دادەنرێ. هەر وەك چۆن لە و فەرموودەیەدا باس لەوە کراوە کەوا گەر بێت و دڵی ئادەمی ساغ و سەلامەت و تەندروست بێت ئەوا تەواوی ئەندام و کارەکانی چاك و سەلامەت و باش دەبن. کە واتە ئێمەی مرۆڤ بە هۆی ئەوەی کە بوونەوەرێکی جوڵەجوڵکەر و عەجوول و لاوازین و بەردەوام لە بزاوتن و هەڵەکردنداین، "...و خلق الانسن عجولا (اسراء ئایەتی١١)"، "...و خلق الانسن ضعیفا (النساء ئایەتی ٢٨) " پێویستە گرنگیەکی باش بەو ئەندامەی جەستەمان (دڵ) بدەین و بەجوانی پەروەردەی بکەین و ڕاییهێنین لەسەر شتی چاك و کاروکردەوەی باش بۆ ئەوەی بە سەلامەتی و ساغی بمێنێتەوە، جونکە گەر ئەو ئەندامەی جەستەمان ساغ و تەندروست بێت ئیدی تەواوی جەستە و ئەندامانی جەستەشمان ساغ و سەلامەت و تەندروست دەبن و گەر بێت و ساغ و سەلامەت و تەندروست نەبێ ئەوا تەواوی جەستە و ئەندامەکانیشی لە ساغی و سەلامەتی بێبەش دەبن و ئیدی ژیان لەو جۆرە جەستە و لەوکەسانەشی کە خاوەنی ئەو جۆرە دڵ و جەستە نەخۆش و ناساغەن تاڵ دەبێت و لە ژیانی حەقیقی و ڕاستەقینە دوور دەکەونەوە و چێژی لێوەرناگرن.

هەر وەك چۆن سەردارو پێشەوامان موحەممەد (ﷺ) وەك پێشەوایەکی خەمخۆر و دڵسۆز فێری کردوین و داوای لێکردوین کەوا هەمیشە لە پەروەردگار بپاڕێینەوە و بڵێین: "یا مقلب القلوب ثبت قلبی علی دینك" واتە: "ئەی ئەو کەسەی کەوا گۆڕین و گۆڕاندنی دڵەکانت بەدەستە، داوات لێدەکەین دڵەکانمان سەقامگیر و ڕاوەستاو بکەیت لە سەر دینەکەت."لە کۆتایشدا داواکارم لە پەروەردگار ئەم کارەم بۆ بکاتە توێشوێکی خێر بۆ دوارۆژم و هۆکارێ بێ بۆ خۆم و بۆ ئەو خوێنەرە بەڕێزانەشی کە دەیخوێننەوە، بۆ ئەوەی لە ڕێگەیەوە بتوانین چاکتر و باشتر دڵمان پەروەردە بکەین و

شارەزای ئەو شتانە بین کەوا دەبنە هۆی نەخۆش خستن و لاوازکردنی دڵمان و خۆمانی لێ بپارێزین و لێیان دوور بکەوینەوە.

کەماڵی و تەواوی و بێ غەل و غەشی و بێ کەم وکوڕی، تەنیا بۆ خودایە و بەس.

وەرگێڕی کوردی

١٣/زیلقەعدەی١٤٣١ ك

٢١/١٠/٢٠١٠ ز (خورماڵ)

# پێشەکی ئامادەکار

بسم الله الرحمن الرحیم

**الحمد لله رب العالمین، حمداً طیباً مبارکاً فیه، وافضل الصلاة واتم التسلیم علی سیدنا محمد النبی الأمثل، وعلی آله وصحبه اجمعین.**

ئێمە لە سەردەم و باروودۆخێکدا ئەژین کە زانستی ماددیی مرۆڤ بە شێوەیەکی ئێجگار بەرفراوان پێشکەوتووە، ئامراز گەلێکی ئاسوودە بەخش و کەیف خۆشی جۆراو جۆری بۆ مرۆڤ بەرهەم هێناوە، بەردەوام بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێ، وە هەموو ڕۆژێ بەرهەمێکی تازەتر پێشکەش دەکات.

شوێنهات و شوێنەمای ئەم هەنگاوە خێرایانە لە گۆڕەپانی پێشکەوتنی ماددیدا، پەلەکردنی مرۆڤە بۆ بەدەست هێنانی هۆکاری ئاسوودەیی و کامەرانی ڕۆژ و کەڵك وەرگرتن لێیان، بەڵام هیچ کات ناگات بەو ئارەزووەی خۆی، چونکە تواناکان و بەرهەمە تازەکان بە بێ وەستان و بەبێ وچان دەکەونە بازاڕەوە!

پەلەکردن لە بەرهەم هێناندا کە پەلە کردن لە بەکارهێنانیشیدا بەدواوەوەیە.!

شوێنەما و ئەنجامی ئەم دیاردەیە، چاو لە دوو بوون و زگ برسییەتی بەدواوەیە، چونکە بەرهەمهێنەر بەردەوام بەدوای نواندن و پێشکەشکردنی کاڵای تازەوەیە و بەکارهێنەریش ڕادەکێشێ بەدوای بەدەست هێنانی بەرهەمە تازەکانی خۆیدا.

شتێ کە لەم نێوەندەدا سەرسوڕهێنەرە ئەمەیە کە هیچ یەکێ لەوانە ناتوانن بۆ تازەکردنەوەی نەفسی خۆیان تەنانەت تۆزێکیش بووەستن و کۆتایی پێ بهێنن.

پێشکەوتنی ماددیی مرۆڤ ئەمڕۆکە هاوکاتە لەگەڵ بەرز بوونەوەی ڕێژەی جۆرەها نەخۆشی کە مرۆڤ زیاتر پێیان ئاشنا نییە و لەلای مرۆڤ نامۆن.! دیاردەیەك کە بە سەرچاوەی سروشتی پێشکەوتن و شارستانییەتی ماددیی دەزانین و هەموو ڕۆژێ هەواڵی دۆزینەوەی نەخۆشییەکی تازە دەبیستین!

چالاکی شەو و ڕۆژی تاقیگاکان و ناوەندە پزیشکی و تەندروستییەکان سەبارەت بەدۆزینەوەی دەرمانگەلێکی نوێ کە نەخۆشییە تازەکان؟! چارەسەر بکات، ئەو ڕێکخراو و دامەزراوانەشی لە ڕێگەی پەلەکردنی بێ ئاکام و چاو لە دوو و شت ویستن بەجۆرێکی تر جێگیر کردووە.!

نەخۆشییەکانی دڵ – هەر وەکو بەشەکان و ئەندامەکانی تری جەستە – زیاتر و فراوانتر بووە و ژمارەی تووش بووان بەو نەخۆشییە گەیشتووەتە ژمارەیەکی سەرسوڕهێنەر. ئەمە بارودۆخی مرۆڤی ئەمڕۆیە.

گرنگی دانی زیاتر بە نەخۆشییەکانی دڵ لەبەر ئەوەیە کە دڵ ناوەند و تەوەرەی ئەساسی جەستەی مرۆڤە و ئەندامێکە کە ئەگەر تەواو تەندروست بێت تەواوی جەستە تەندروست و لەکاتێکدا ئەگەر ناتەواو و ناساغ بێت تەواوی جەستە نەخۆش دەکەوێت، وە تەواوی ئەندامانی جەستە پێی کاریگەرن. بەڵام نەخۆشی تری ئەندام تایبەتییە و پەیوەستە بە هەمان ئەندامی دیاری کراوەوە.

ڕێژەی پزیشکانی دڵ و نەشتەرگەرەکانی دڵ تەواو زۆربوون و دەرمانگەلێکی زۆریش بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی بەرهەم هاتوون، وە بەهۆی نەشتەرگەرییە پێشکەوتووەکانەوە تا ڕادەیەك ئازارو نەخۆشییەکانی کەمیان کردووە. ئەمە بارودۆخی دڵی مرۆڤەکانە لەم سەردەمەدا.!

بەڵام نابێ ئەوەش لە بیر بکەین کە مرۆڤ – جگە لە دڵی ماددیی – (واتە ئەو دڵەی کە بەر یەکێ یا چەند هەستێ لە هەستەکانی مرۆڤ دەکەوێ، وەکو هەستی بینین، دەست... وەرگێڕی کوردی) خاوەنی دڵێکی ترە کە نابینرێ. کە ڕۆڵ و گرنگی ئەویش کەمتر نییە لەو دڵەی کە باسمان کردو قسەمان لەسەر کرد، هەمان ئەو دڵەیە کە قورئانی پیرۆز باسی دەکات و ناوی هێناوە لە چەند ئایەتێکی زۆردا و لەبارەیەوە دواوە و باسی کردووە.

کاتێ کە بە لە کارکەوتنی دڵی ماددیی ڕووبەڕووی مردن و لەدەست دانی ژیان دەبینەوە، بە لەناو چوون و لەکار کەوتنی دڵەکەی تر بە مردنی هەمە لایەنەی مرۆڤایەتی مرۆڤ و لەدەست دانی سەربەرزی دونیاو بەختەوەری دواڕۆژ کۆتایی پێ دێت. دەبێتە ئەو دڵەی کە قورئانی پیرۆز باسی لێوە دەکات و دەفەرمووێت: ﴿...خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَٰلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ﴾ سوورەتی حەج ١١.

واتە: هەندێك لە خەڵکی هەیە لە یەك حاڵەتدا خواپەرستی دەکات (ئەویش ئەو حاڵەتەیە کە دونیا بە دڵی ئەو بێت) ئەگەر تووشی خێر و خۆشی بوو دڵی پێی خۆشە، خۆ ئەگەر تووشی تاقیکردنەوەیەك هات، سواری سەری خۆی ئەبێت و هەڵدەگەڕێتەوە، ئا بەو حاڵەتەی، دونیا و قیامەت لەدەست خۆی ئەدات و زەرەرمەندی هەردوولایە و هەر ئەوەشە خەسارەتمەندو زەرەرمەندی ڕوون و ئاشکرا.

گرنگی باس و بە دواداچوون لەبارەی دڵی نەبینراو و نادیارەوە لێرەوە سەرچاوە دەگرێ. کێشە و گرفتی سەرەکی لە پەیوەندی لە گەڵ دڵدا ئەمەیە کە خاوەنەکەی ئاگاداری نەخۆشییەکەی نییە، چونکە وەکو دڵی ئاشکرا و دیار خاوەنی نیشانە و کاریگەری دیار و بەرچاو نییە بەسەر جەستەوە.

لەبەر ئەوە هەندێ جار دڵی نادیار و شاراوە بەبێ ئەوەی خاوەنەکەی ئاگای لێ بێت تووشی جۆرەها نەخۆشی خراپ و زیان بەخش ئەبێت، لەم بارەوە ئەرکی زانایانە کە لە گۆڕەپانی گەشە و برەودانی پەروەردەکردن و داهێنانە تەندروستیە مەعنەوییەکانو پێدانی زانیاری بە خەڵکی و بەرز کردنەوەی ئاستی بەرچاو ڕوونیان (لێرەدا مەبەستی چاوی ناخە) لەبارەی کاروبارەکانی خۆیانەوە و بەرگریکردن لە تووش بوونیان بە نەخۆشییە هەست پێنەکردنەکان دڵ و کەسایەتی بە ئەرکی خۆیان هەڵسن... و زانایانی موسڵمانی ڕابردوو بەجوانی ئاگایان لەو ئەرك و بەرپرسیاریەتییە بووە.

ئەگەر چی پسپۆڕانی نەخۆشییەکانی دڵ لەم سەردەمەی ئێمەدا کەمن، بەڵام دەرگاکانی نۆرینگەی پزیشکەکان و کارزانەکانی ڕابردوو بەردەوام کراونەتەوە و

هەمیشە بەبێ چاوەنوواڕی چارەسەری نەخۆشییەکانیان کردووە و لەم پێناوەدا تەنیا چاویان لە پاداشتی پەروەردگار بووە و بەس، وە بۆ زانیاری و بەئاگا هێنانەوەی خەڵکی پەرتووك گەلێکی پێویستیان خستووەتە خزمەتی هەمووانەوە.

هەندێ لەو پسپۆڕە دڵسۆزانە کە نۆرینگەکانیان هەمیشە بەڕووی نەخۆشەکاندا کراوەن، بریتین لە:

حەسەنی بەصری، حارس محاسبی، جەنید بەغدادی، ئیمام موحەممەدی غەزالی، سەلامی خوایان لێ بێت و چەندانی تر...

ئیمام ئیبن قەییمیش (ڕەزای خوای لەسەر بێت) یەکێکە لەو پسپۆڕانە لەم گۆڕەپانەدا، کە زۆرێك لە زانایان و گەورەکان لەسەر کارزانی و لێهاتوویی و زانایی و ئاشنایەتی ئەو کەڵە پیاوە شایەتیان داوە. شایان و شایستەی ئەوەیە کە بە مەبەستی کەڵك وەرگرتن لە زانیاری و کارزانی ئەو سەردانی نورینگەکەی بکەین و سوودو کەڵکی پێویستی لێ وەربگرین.

ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە وا گرنگی بە کۆکردنەوە و ئامادەکردنی بابەتەکانی ئەم پەرتووکە بدەم.

ئومێدەوارم کە پەروەردگاری پایەبەرز ئەم کارەم پاك بکاتەوە و جێگەی ڕەزامەندی خۆی بێت و لێم قەبووڵ بکات. چونکە چاکترین بارەگا بۆ قبووڵ کردنی نزاو داواکان بارەگای پەروەردگاری بەدەسەڵاتە!

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

٦/شوال، ساڵی ١٤٢١ك

٢٠٠١/١/١ز

صالح احمد الشامی

# ژیاننامەی ئیمام ئیبن قەییمی جەوزی

زانای فەرموودەناس شەمسەدین (عبدالله) موحەممەدی کوڕی ئەبووبەکری کوڕی ئەیوب کوڕی سەعد کوڕی حەریز زەرعی دیمەشقیە، ناسراوە بە (ئیبن قەییمی جەوزی)).

جەوزی ناوی قوتابخانەیەکە کە یوسف کوڕی عبدالرحمن جەوزی دروستی کردووەو باوکی ئیمام ئیبن قەییم سەرپەرشتیار و چاودێریکەری بووە، لەبەر ئەوە بە ئیبن قەییمی جەوزی ناسراوە.

ئیمام ئیبن قەییم لەساڵی (٦٩١) ھ.ق لەگوندی (ازرع) سەر بە ناوچەی (حوران)ی وڵاتی سوریا لەدایك بووە، لە سەردەمی لاویدا چووەتە دیمەشق و لە خزمەت زانایانی ئەو شارەدا دەستی بە خوێندن کردووە و خوێندن فێر بووە. دوای گەڕانەوەی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە لە میسرەوە بۆ دیمەشق لەساڵی (٧١٢) تا کاتی مردنی ئەو لە ساڵی (٧٢٨) ھ.ق لە نزیکان و هاوڕێیانی ئیبن تەیمیە بوو. ئەم هاوڕێیەتییە بواری بۆ ئیبن قەییمی جەوزی ڕەخساند تاوەکو لە نزیکەوە شارەزای بۆچوون و ئیجتیهاداتی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە بێت و هێشووچنی خەرمانی زانستی ئەو بێت، وە تەنانەت لەگەڵ شێوەکانی بەڵگە هێنانەوەی ئەو لەکاتی موناقەشە و باس و وتوو وێژدا ئاشنا بێ و بکەوێتە ژێر کاریگەری چۆنییەتی نووسینی کتێب و شێوەی نووسینەوەی مەسەلەکان.

گرنگترین وانەیەك کە ئیبن قەییمی جەوزی لە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەوە فێر بوو بانگ کردن بۆ زانایی و پەیڕەوکردن لە کتێبی پەروەردگار و سوننەتی ڕاستی بوو بە شێوەی سەلەفی ساڵح.

ئەویش هەر وەکو مامۆستاکەی ڕووبەڕووی ئەزییەت و ئازارێکی زۆر بوویەوە و هاوڕێ لەگەڵ ئەودا لە بەندیخانەی قەلعەی دیمەشق بەندکرا و تەنیا دوای وەفاتی

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە بوو کە ئەویش ئازاد کرا. دوای وەفاتی مامۆستاکەیشی هەرخۆشی دەویست و لە زانست و ڕەوشتیدا شێوەی ئەوی هەڵدەبژارد.

ئیمام ئیبن قەییمی جەوزی زۆر ئەهلی پەرستش و شەو نوێژ بوو و نوێژەکانی زۆر بە درێژی دەخوێند، تا ئەو شوێنەی کە (ئیبن کەسیر) لەبارەیەوە دەڵێت: (لەم سەردەمەدا کەسێك شك نابەم کە بە ئەندازەی ئەو ئەهلی پەرستش بێت.! ئەو لە بەجێهێنانی نوێژدا خاوەنی شێوەیەکی تایبەت بەخۆی بوو و خوێندن و کڕنووش و سەجدەکانی زۆر درێژ بوون، ئەگەر چی هەندێ جار لەلایەن هاوڕێیانییەوە سەبارەت بەمە و بەهۆی درێژ کردنەوەی نوێژەوە دەکەوێتە بەر لۆمە و سەرکۆنەکردنەوە، بەڵام ئەو شێوەی خۆی نەدەگۆڕی، (درووود و ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت).!

کەسانێ کە لە بارەی ژیانی ئەوەوە شتێکیان نووسیوە، سەبارەت بە پەرستشی زۆر و پارێزگاری و ڕاستگۆیی ئەو لە قسە و کرداردا شت گەلێکی زۆریان باس کردووە.

ئەو خاوەنی چەندین بەرهەمە کە تەنیا نزیکەی (٣٠) پەرتووکی بە چاك گەیەندراون.

ئیمام ئیبن قەییمی جەوزی لە مانگی ڕەجەبی ساڵی (٧٥١) هـ. ق کۆچی دوایی کردو لە مزگەوتی گەورەی دیمەشقدا نوێژی لەسەر کرا.!

بۆ زیاتر ناسینی کەسایەتی ئیبن قەیوم، جێی خۆیەتی کە باس لە بۆچوون و ڕووانگەی هەندێ لە زاناکان لەم بارەیەوە بکەین:

ئیبن حەجەر عەسقەلانی لەبارەیەوە دەفەرموێت: (ئیبن قەییمی جەوزی زۆر ئازا و بوێر بوو زانست و زانیارییەکی زۆری هەبوو و شارەزاییەکی باشی لەبارەی جیاوازی و مەزهەبەکان و بۆچوونی سەلەفەوە هەبوو).

عەلامە ئیبن رەجەب حەنبەلی دەفەرموێت: (هیچ کەسێکم زاناتر لەو نەناسیوە، وە لە گۆڕەپانی زانایی و ئاشنایەتی واتای قورئان و فەرمووده و ڕاستییەتی ئیمام هیچ کەسێکی پێ ناگات، ئەگەرچی بێ تاوان نەبوو بەڵام کەسێکی وەك ئەوم نەبینیبوو).

قـازی بورهـان الـدین زەرعـی دەڵێـت: (لـە ژێـر میـچی (سـەقف)ـــی ئاسمانـدا لـە سەردەمی خۆمدا کەسێکم پەیدا نەکردووە کە لە ئەو زاناتر بێت).

حافز عمادالدین ئیبن کەسیر دەڵێت: (شـەو و ڕۆژ بـە خوێندنـەوە و لێکۆڵینـەوەوە سەرقاڵ بوو نوێژ و خوێندنەوەی زۆر، ڕەوشت جوان و نـەرم و نیـان و میهرەبـان بـوو نیشانەیەك لە ڕق و کینە و بەخیلی تێدا پەیدا نەدەبوو).

ئـیبن العمـاد حەنبـەلی دەڵێـت: (ئـیبن قـەییمی جـەوزی زانایـەکی ئـایینی تـەواو ڕافەکەری قورئانی پیرۆز؛ نەحو اصول، ئەهلی کەلام و لە زانـستی ئیـسلامیدا ئـەهلی سـەرگەرمی و داهێنـان بـووە و لـە ڕافـەکردنی قورئانـدا بـێ هاوتـا و لـە ئوصـولی بیروباوەڕی ئایینی سەرچاوە و قسەی کۆتایی لەلای ئەو بـوو. لـە تێگەیـشتن و زانـایی دروستی فەرمودەکان و هەڵێنجانە وردەکان لێیان خاوەنی بـیرورِاو بلیمەتییـەکی بـێ وێنە بوو و لە فقهو ئوصولی فقهدا بێ هاوتا و لەزمان و ئەدەبیاتی عەرەب و زانـستی کـەلام و گـەلێکی تـر لـە زانـستەکانی تـر بـالاَ دەسـت بـوو و لـە زانـستی ڕەوشـت و عیرفانیشدا بێ هاوتا و بێ وێنە بوو).

## سەبارەت بەم پەرتووکە (١)

کاتێ کە دەگەڕێینەوە بۆ ژیاننامەی ئیمام ئیبن قەییمی جەوزی و تەماشای دەکەین، لە نێو ئەو پەرتووکانەیدا کە داینوان ڕووبەڕووی کتێبێ دەبینەوە بەناوی (پزیشکیی دڵان).

زۆربەی کەسانێ کە ژیاننامەی ئەویان نووسیوەتەوە باسیان لەو پەرتووکە کردووە[١] بەڵام تاکو ئێستە دەستنووسی ئەو کتێبە نەدۆزراوەتەوە. ئەگەر چی لە زانکۆی ئیسلامی موحەممەدی کوڕی سعودی ڕیاز (پایتەختی عەرەبستان) وێنەیەك لەدەست نووسی پەرتووکخانەی (برلین باشوری) بوونی هەیە، بەڵام لەڕاستیدا شتێ جگە لە بەش گەلێك لە پەرتووکی (زاد المعاد)ی ئەو نییە، وە ئەو لاپەڕانەی کە لەژێر ناونیشانی (پزیشکی دڵان) بوونی هەیە بە کتێبێکی سەربەخۆ لە قەڵەم نادرێ.[٢]

ئەگەر چی دەستنووسەکانی ئەو کتێبە تاکو ئێستە نەدۆزراونەتەوە، بەڵام ئیمام ئیبن قەییمی جەوزی لەم پەرتووکانەی خوارەوەدا سەبارەت بە بابەتی (پزیشکی دڵان) خاوەنی بابەت گەلێکی دوور و درێژە:

١. مدارج السالکین.

٢. طریق الهجرتین.

٣. الداء والدواء (الجواب الکافی لمن سأل عن الدواء الشافی).

٤. اغاثە اللهفان.

٥. الفوائد و...

---

١ بۆ نموونە تەماشای کتێبی (التقریب لفقه ابن قیم الجوزیة) نووسینی دکتۆر بکر ابو زید، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٢٢١بکە.

٢ پەرتووکی (رسالة ابن قیم الی احد إخوانه) لێکۆڵینەوەی شیخ عبدالله المدیفر، لاپەڕە ٧٦.

ئیمام ئیبن قەییمی جەوزی لەو پەرتووکانەدا سەبارەت بە نەخۆشییەکانی دڵ — سەرچاوەگر لە دوو دڵی و هەوەس — وە دەرمان و ڕێگە چارەکانی ئەو نەخۆشییانە قسەی کردووە.

کۆکردنەوەی بابەتە پەیوەستەکان بەم مەبەستەوە و لە بەردەست دانانیان کارێکی سوودمەندە و دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی هەوڵ و کۆشش و کاتی خوێنەر.

کاتێ کە لە چوارچێوەی تەرح کردنی لە بەردەست دانانی میراتی فیکری و زانستی ئیمام ئیبن قەییمی جەوزیدا، بڕیارمدا بۆ بە کردەیی کردنی ئەم کارە دوای کەمێك لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون زانیم کە لە بەشی سەرەتای کتێبی (اغاثه اللهفان فی مصايد الشيطان) بابەت گەلێ بوونی هەیە کە دەتوانێ ببێتە بناغە و پایەیەك بۆ ئەم کارە. وە لە پەرتووکەکانی تریشیدا بابەت گەلێك و مەسەلە گەلێکم دۆزییەوە کە دەتوانن بۆ تەواو کردنی بابەتەکە هاوکاریم بکەن.

کاتێ کە کەرەستە و بابەتە پێویستییەکانم کۆکردەوە، بڕیارمدا کە ڕێك و پێکیان بکەم و ڕیزیان بکەم و پەروەردگاریش هۆکارەکانی ئەو کارەی بۆ دەستەبەرکردم و لەکۆتاییدا ئەم پەرتووکەی لێ درووست بوو.

## سەبارەت بەم پەرتووکە ( ٢ )

لە گەورەیی باسکردنی بابەتێکی زۆر گرنگی وەك (پزیشکی دڵان و پاك کردنەوەی نەفس) کە ئیمام ئیبن قەییمی جەوزی لە ژمارەیەك لە کتێبەکانیدا سەبارەت بەوە قسەی کردووە، جێی خۆیەتی کە خوێنەرانی ئازیز لە چوارچێوە و شێوەی ڕێکخستنی بابەتی پەرتووکەکە ئاگادار بکەینەوە و شارەزای بن، شتێ کە دەبێتە هۆی ئەوەی کەوا خوێنەر بۆچوونێکی گشتی لەبارەی بابەتەکەوە هەبێ.

بەشی سەرەتای پەرتووکەکە – وەکو پێش زەمینەیەکی گشتی – سەبارەت بە گەورەیی و مەزنی دڵ لە مرۆڤدا دەدوێ و دواتر لە ڕووی سەلامەتی و نەخۆشیەوە بە:

* دڵە ساغ و سەلامەتەکان.
* دڵە دەردەدار و نەخۆشەکان.
* وە دڵە مردووەکان، دابەش و خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی هەریەکێ لەوانەی باس کردووە.

بەشی دووەمی کتێبەکە تایبەتە بە خستنە ڕووی نیشانەکانی هەر یەکێ لە دڵە سەلامەت و نەخۆشەکان و خراپەکاری کە دەبێتە هۆی لەناو بردن و نەخۆش خستنیان.

لە بەشی سێیەمدا حەقیقەتی ناساغی و نەخۆشی دڵ تاوتوێ دەکات و ئەم بابەتە وە بیر دێنێتەوە کە دڵ لە پەیوەندی لەگەڵ نەخۆشی و دەرمانە چارەسەرکارەکان، وەکو جەستەی مرۆڤ وایە.

بەم جۆرە لە سێ بەشی سەرەتای پەرتووکەکەدا، خوێنەر لەگەڵ چەمکە گشتییەکانی تایبەت بە دڵ لە ڕووی سەلامەتی و نەخۆشی و ئامراز و هۆکارێ کە تووشیان دەبێ، ئاشنا دەبێت، وە ئەم ئاشنایەتییە هاوکاری خوێنەر دەکات بۆ دووری کردن لە هۆکاری نەخۆشی و ئاگادار بوون لە بوونی ئەو نەخۆشییە لەکاتی سەر هەڵدانی نیشانەکاندا.

پێویست بە بیرهێنانەوە دەکات کەوا دڵ لەلایەن سێ دوژمنی (نەفس، شەیتان و گوێبەند (فیتنە و تاوان)) هەمیشە لە بۆسەی مەترسیدایە.

لە بەشی چوارەمی کتێبەکەدا ئیمام ئیبن قەییمی جەوزی باس لە چۆنیەتی بەرگری کردن لە زاڵ بوونی هەوا و ئارەزوو دەکات بەسەر دڵی مرۆڤدا.

لە بەشی پێنجەمدا لەبارەی چۆنیەتی پارێزراوی لە زاڵ بوونی شەیتان بەسەر دڵدا دەدوێ.

لەبەشی شەشەمیشدا باس لە مەترسییەکان و زیانەکانی گوێبەند و تاوانەکان و ئاسەوارەکانی دەکات بەسەر دڵەوە.

بەخوێندنەوەی بابەتە تەرح کراوەکان لەو بەشانەدا خوێنەر ئاگاداری ناوەندە مەترسی دارەکان دەبێتەوە و ئاشنای بارودۆخ و حاڵی خۆی دەبێت و ئەگەر بیەوێ دەتوانێ چاودێری کردنە پێویستییەکان بەجێ بهێنێ.

ئەگەر چی لەم پەرتووکەدا قسە لەسەر چارەسەرکردنی دڵەکان دەکرێ. تەنیا ئەو دڵانە شایانی چارەسەر کردنن کە ژیانێکیان تێدا ماوە، بەڵام دڵە مردووەکان بەهیچ شێوەیەك چارەسەر ناکرێن و دەوا و دەرمان کاریگەرییان لەسەر نابێ، لەبەر ئەوە لە بەشی حەوتەمەدا لەبارەی نیشانەکانی دڵە زیندووەکانەوە قسە دەکەین و دەدوێین.

دوای دڵنیا بوون لە بوونی ژیان لە دڵی مرۆڤدا و ئاگایی و ویست و ئارەزووی ئەو بۆ چارەسەکردن بە ئومێدی پەروەردگار چارەسەر و داروێکی سوودمەند دەبێت، وە لێرەدایە کە لە بارەی جۆرەها دەرمان و ڕێگە چارەی دڵە نەخۆشەکان لە بەشی هەشتەمدا، قسە دەکرێت و لێی دەدوێین، ناسینی ناوەندەکانی مەترسی و کەڵك وەرگرتن لە تەواوی ڕێگەکان بۆ دوورکەوتنەوە لێیان و خێرا دەست بەکار بوون بۆ چارەسەرکردن لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشی ناوەکی دڵ، بوار دەڕەخسێنێ بۆ مانەوەی سەلامەتی و تەندروستی مەعنەوی ئەو وە تەنیا شتێ کە لە بارەی مانەوەی تەندروستی و سەلامەتی، گەلێ کاریگەرە، هەوڵدان و تێکۆشانە بۆ

پاككردنەوەی دڵ لە پیسی و ناپاكییەكان، كە لە بەشی نۆیەمدا باسی لێوە دەكرێ و دەخرێتە ڕوو.

هەروەها ئیمام ئیبن قەییمی جەوزی دەڵێت: دوای (پاك كردنەوە و خاوێنی دڵ) دێینە سەر (خاوێن كردنەوەو گەشەسەندنی دڵ)، وە بابەتەكانی تایبەت بەوەوە لە بەشی دەیەمی پەرتووكەكەدا باس دەكرێ.

كاتێ كە دڵ لە پلەی پاكژ بوونەوە جێگیر بوو دەرگاكانی بەختەوەری بەڕوویدا دەكرێنەوە، وە لێرەدایە كە ئاگایی و شارەزایی لەبارەی ئەوەی كە دەبێتە هۆی بەختەوەری دڵەكە پێویستە و بەشی پانزەیەم كە بەشی كۆتایی كتێبەكەیە، باس لەوانە دەكات.

ئەمە ڕوونكردنەوەیەكی كورت بوو لەبارەی ئامرازی ڕێك و پێك كردنی كتێب بەم جۆرەی كە هەیە، ئومێدەوارم كە لە ڕیزی ئەو كەسانەدا بم كە كۆشش و ئیجتهادیان كردووە و حەق و ڕاستیان دۆزیوەتەوە.

# پێشەكی نووسەر

بسم الله الرحمن الرحیم

**ربنا آتنا من لدنك رحمة وهیئ لنا من أمرنا رشداً، وصلی الله علی سیدنا محمد وآله واصحابه اجمعین.**

سوپاس و ستایش شایانی پەروەردگارە كە بە سیفەتە گەورەكانی خۆی نیشانی دۆستەكانی داوەو لە ڕێگەی تەماشاكردن و سەرنجدانی سیفەتی كەماڵییەوە دڵەكانیانی نوورانی كرد، وە لە ڕێگەی بەخشش و ئەو چاكانەی كەپێی بەخشیون خۆی ناساندووە پێیان و زانیویانە كە زاتی ئەو تەنیاو بێ هاوتا و تاكێكی بێ نیازە كە لە ئەزەلدا، سیفەت و كارەكانی خاوەنی شەریك و هاوڕێ نییە، وە ئەو هەمان ئەو كەسەیە كە خۆی، خۆیی وەسف كردووە و زیاتر لەوەشە كە بەندەكانی كەم و زۆر وەسفی دەكەن و پێناسەی دەكەن.

هیچ كەسێ ناتوانێ مافی وەسف كردن و ستایش كردنی پەروەردگار بدات، وە ئەو بە هەمان شێوەیە كە لەسە زمانی ئەو كەسەی پەیامی خۆی خستە سەر شانی لەبارەیەوە دەفەرموێت:

(یەكەمینێ كە پێش ئەو دیاردە و بوونەوەرێ نەبووە و دواهەمینێ كە دوای ئەو خولقێنەرێ نابێ، پەیدایەك كە هیچ شتێ و هیچ كەسێ لەو بەرزتر نییە و ناوەندێ كە جگە لەو دیاردەیەك بوونی نیە. وە هیچ بوونەوەرێ بە شاردنەوەی خۆی لێی شاراوە نابێ، ئەو سەرچاوەی ژیان و هەڵسووڕێنەر و بەڕێوەبەرێكە كە بە تەنیایی خاوەنی مانەوە و بەردەوامییە و تەواوی درووستكراوەكان و بوونەوەرەكان چارەنووسێكیان جگە لە نەمان و لەناو چوون نییە. بیسەرێ كە ڕازەكان و واتای تەواوی وشەكان وێڕای جیاوازی جۆرا وجۆر داواكارییەكانیان دەبیستێ و بیستنێ كە دووری ناخاتەوە لە بیستنێكی ترو كاروبارو مەسەلەكان لای ئەو ون نابن، وە ڕاز و نهێنییەكانی ئەهلی پاڕانەوە و داواكردن ئەو ناڕەحەت و بێزار ناكەن.

بینەرێ کە جووڵەی مێروولەیەك بەسەر پارچە بەردێکەوە لەتاریکی شەودا و لەدەشت و شاخدا دەبینێ، وە گەورەتر و جوانتر لەمە ئەوەیە گۆڕانکارییەکانی دڵی بەندەکانی و گۆڕانکاری حاڵی ئەوانی بە تەواوی و کەماڵی تەماشا دەکات: بە باوەشێکی کراوەوە لە هاتنە پێشەوەی بەندەکانی پێشوازی دەکات، چاودێری کردنی بەندەکان تەنیا لەپاڵ چاودێری ئەوەوە شیاو و مسۆگەرە، وە ئەگەر ڕوو لە پەروەردگار هەڵگێڕن و لێی دوور بکەونەوە نایانداتە دەست دوژمنانی خۆی و لە بێکەڵکی و بێ قازانجیدا بەجێیان ناهێڵێت، چونکە میهرەبانی و دڵسۆزی ئەو بۆ بەندەکانی لە میهرەبانی و دڵسۆزی دایکان بەرامبەر بە منداڵەکانیان لەکاتی سکپڕیدا و بڕینی شیر لە منداڵ بە پلە زیاتر و زۆرترە. !

ئەگەر تۆبەکەر و پەشیمان بووەوە، لەکەسێ کە توێشو و خواردن و ئاوی خۆی لە بیابانێکی گەرمدا ون کردبێ و خۆی ئامادەکردبێت بۆ مردن، بەڵام لەناکاودا خواردن و توێشووەکەی بدۆزێتەوە، گەلێ خۆشحاڵ و شادومان دەبێت. بەڵام ئەگەر مرۆڤەکان پشتی تێ بکەن، وە نزیك نەبنەوە لە هۆکاری بەزەیی و ڕەحمەتی پەروەردگار، لە قسەو کرداری خۆیاندا سوور بن لەسەر تاوان و نافەرمانی، وە لەگەڵ دوژمنی پەروەردگاردا هاوڕێیەتی بکەن و پەیوەندی خۆیان لەگەڵ پەروەردگاریان بپچڕێنن، شایانی مردن و لەناو چوونن و بەهۆی فراوانی و گەورەیی بەزەیی و ڕەحمەتی گەورەی مرۆڤایەتی، ئەمە تەنیا خەڵکانێکی نەگبەتن کە نەگبەتی و بەدبەختیان کردووەتە پیشەی خۆیان کە مۆری کەساسی و کلۆڵی و زەرەر و زیان دەدرێ بەنێو چاوانیانەوە.

شایەتی دەدەم کە جگە لە پەروەردگاری پەرستراو ڕەوانییە، پەرستراوێکی تاك و تەنیا و بێ نیاز کە پلە و پایەی بەرزترە لە هاوشێوە و هاوتا بووندا و گەورەیی و مەزنی ئەو لە ڕکابەر و شەریك و هاوشێوە بوون پاك و پیرۆزە.

هەرشتیٚ کە پەروەردگار بیبەخشیٚ و بیدات هیچ کەس ناتوانیٚ ڕووبەڕووی بێتەوە و هەر شتێکیش ئەو نەیدات هیچ کەس ناتوانیٚ بیدات، وە لە بەرامبەر فەرمان و حوکمی ئەودا هیچ لەمپەر و ڕێگریٚ نییە.

پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ﴾ سوورەتی ڕەعد ۱۱.

واتە: (بۆ خوا هەیە فریشتەی بیٚ شومار کە بە نۆرە بەدوای یەکدا دێن تا چاودێری ئادەمیزاد بکەن لە بەر و پشت و لە هەموو لایەکەوە بیپارێزن بە فەرمانی خوا، بێگومان خوا بارووذۆخی هیچ گەل و قەومێك ناگۆڕێت (لە خۆشییەوە بۆ ناخۆشی، یان لە زەلیلییەوە بۆ سەربەرزی، یان لە گرانییەوە بۆ هەرزانی) هەتا ئەوان ئەوەی بە خۆیان دەکرێت نەیگۆڕن و نەیکەن، کاتێکیش خوا بیەوێت بەڵایەك بەسەر میللەتێکدا بهێنێت (لە دەرەنجامی سەرکەشی و یاخی بوونیان)، ئەوە هیچ هێزێك ناتوانێت بەری بگرێت، هیچ کەسیش ناتوانێت جگە لە خوا فریایان بکەوێت و ڕزگاریان بکات.

شایەتی دەدەم کە موحەممەد (ﷺ) بەندە و نێردراو و ڕاوەستاو بە حەق، هەڵگری پەیامی خودایی و ئاسمانی و بەرزترین درووستکەری پەروەردگارە، وە پێغەمبەری بۆ ڕەحمەت و بەزەیی و بەختەوەری جیهانیان، وە پێشەوای پارێزکاران، وە پەرۆشی و کەساسی و کڵۆڵی بیٚ باوەڕان و تەواوکەری بیانوو بۆ جیهانیان ناردووە.

ئەو _موحەممەد_ لە بارووذۆخێکدا کە ماوەیەکی زۆر بە سەر هەناردنی پێغەمبەرەکاندا تێپەڕی بوو نێردران تاوەکو خەڵکی ڕێنموونی بکات بۆ ڕووناکترین ڕێگە و پتەوترین ڕێباز، وە گوێڕایەڵی، خۆشەویستی و دۆستایەتی، ڕێز و بەجێهێنانی مافەکانی لەسەر ئەهلی ئیمان و باوەڕ پێویست کرد. تەواوی ئەو ڕێگایانەی کە ئەڵێن کۆتاییان بە بەهەشت دێت – جگە لەڕێگە و سوننەتی ئەو – ڕەدی کردونەتەوە و فەشەلی پێهێناون، وە سنگی شەق کردووە و کۆڵی تاوانی لەسەری لابردووە و یادکردنی پیرۆز و لەسەر نێوچاوانی نەیار و ناحەزەکانی داواکردن و دوورکەوتنەوەی

(ئـەمرو نـەهی) مـۆری زەلیلـی و کەساسـی دانـاوە و لـە کتێبەکەیـدا (پەرتوکەکـەی پەروەردگار کە قورئانی پیرۆزە) سوێندی بـە گیـان و ژیـانی خـواردووە و نـاوی لـەپاڵ ناوی خۆیدا داناوە و لە شایەتی دان و وتار خوێندن و بانگ داندا ناوی ئـەوی لـە نزیـك ناوی خۆی داناوە.

پێغەمبەرێ (صلی الله علیه وسلم) کە لە تەواوی تەمەنی دا بە ویستێکی پۆڵایینەوە بەردەوام داواکاری و فەرمانەکانی پەروەردگاری جێ بەجێ کردووە و بەجێی هێنـاون و هیچ شتێ توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی نەبوو لەگەڵ ئەو ویستەیدا، وە تـەواوی هـەوڵ و کۆششی خۆی بـۆ بەدەسـت هێنـانی ڕەزامـەنی پـەروەردگار بـەکارهێناو هـیچ گرفتـێ نەیدەتوانی ببێتە لەمپەر و ڕێگر لە بەردەم هەنگاو نانی ئـەودا لـەم ڕێگەیـەدا، تـاوەکو تیشکی نووری پەیامەکەی تەواوی دونیای ڕوونـاك کـردەوە و خـەڵکی دەسـتە دەسـتە ڕوویان کـردە ئـایینی پـەروەردگار و باوەڕیـان پـێ هێنـا، وە داوێنـی بانگخوازییەکـەی بەسەر تەواوی گۆی زەویـدا کـە تیـشکی هـەتاوی پـێ دەگەشـت و شـەو و ڕۆژی تێیـدا جیهانی ڕۆشن و تاریك دەکرد بڵاوبوویەوە، وە ئایینـە پتـەو و پایەدارەکـەی جـێ پێـی خۆی بەهێز کرد.

دوای گەیانـدنی پـەیام و بـەجێهێنانی ئەمانـەت و ئامۆژگـاری ئوممـەت و گـەل، وە تێکۆشانی شیاو و شایستە لە پێناو بڵاوکردنەوەی ئایینی گـەورەی مرۆڤایـەتی، وە بـە جێهێنـانی شـەریعەت، وە جـێگیر کردنـی ئوممـەت لەسـەر ڕێگـەی ڕەوا و حەقیقـەت و ڕەوانەکردنی ڕێبوارانی ڕێگەی بەختەوەری دونیا و دواڕۆژ، پەروەردگار گەڕاندییەوە بۆ لای خۆی و بەرەو بارەگای خۆی بردیـەوە، تـا ئـەو بەڵێنـەی کـە لـە قورئـانی پـیرۆزدا بڕیاری دابوو بەجێ بهێنێ و جێ بەجێی بکات: ﴿قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ سوورەتی یوسف ١٠٨.

واتە: ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم). تۆ بڵێ: ئا ئەمە ڕێگە و ڕێبازمـە، مـن و شوێنکەوتووانم بانگ ئەکەین بـۆ لای خـوای پـەروەردگار لەسـەر بنـچینە و بناغەیـەکی

ڕوون و ئاشکرا، پاکی و بێگەردیش بۆ زاتی پەروەردگارە، من هیچ کاتێك لە موشریك و هاوەڵگەران نیم.

دواتر:

بە ڕاستی پەروەردگار و تاك و تەنیا بەبێ هۆ و لە خۆڕا بەرگی وە دیهێنانی نەکردووە بە بەر لاشەی دروستکراوەکاندا، وە ئەوانی بێ کەڵك و بێکار نەهێناوەتە دونیا. بەڵکو ئەوانی بەرپرسیار کردووە و داوای هەندێ کاروباری لێ کردوون و هەندێکیشی لێ دوور کردوونەتەوە (واتە ئەمر و نەهی پێ کردووە سەبارەت بە ئەنجام دانی هەندێ کار، واتە هەندێکیان ئەنجام بدات و لە هەندێکیشیان خۆی دوور بخاتەوە، وەرگێڕی کوردی)، وە هەندێ جار بە درێژی و تێرو تەسەلی و هەندێ جاریش بە کورتی داوای لێ کردوون کە شەریعەتەکەی بناسن و ئەوانی بەسەر دوو تاقمی ئەهلی بەختەوەری و خۆشبەختی و ئەهلی بەدبەختی و شەقاوەت دابەش کردووە و هەریەکێ لەو دووانەشی لە شوێنێکی تایبەتدا جێگیر کردووە و ئامراز و لێهاتوویی و بزێوی زانست و کردەوە واتە (دڵ و گوێ و چاو) و ئەندامانی تری جەستەی پێ بەخشیون.

هەرکەسێ کە لە ڕێگەی پەرستشا بەکاریان بهێنێ و ڕێگەی ناسینی بۆ ئاگادار بوون لە ڕێگەی ڕاست و ڕێنموونی بپێوێ و لێی دوور نەکەوێتەوە و ڕووی لێ هەڵنەجەرخێنێ، مافی سوپاس گوزاری نیعمەتە پێ بەخشراوەکانی داوە و ڕێگەی ڕەزامەندی پەروەردگاری گەورە و تاك و تەنیای گرتووەتە بەر.

بەڵام هەرکەسێ کە ئەو هۆکار و لێهاتوویانە لەپێناو شوێنکەوتن و ڕاکێشانی نارەوای هەوا و ئارەزوو جێگیربکات و بە مافی پەروەردگار و بەرپرسیارییەتی خۆی لەبەرامبەر ئەودا گوێ نەدات، لە ڕۆژی بڕیار دراوی دواڕۆژدا و لە بەردەم پەروەردگاردا توشی پەشیمانی و پەرۆشی دەبێت و خەمێکی زۆری تووش ئەبێت، چونکە دەبێ حیسابی چۆنییەتی بەکارهێنان و کەڵك وەرگرتنی ئەو ئامراز و توانایانە بداتە دواوە،

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَلا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولا﴾ سوورەتی ئەسرا ٣٦.

واتە: ئەی ئینسان لە شتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەکەوە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بە ڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی، بەرپرسیارە لە بەرامبەرییەوە.

بەهۆی ئەوەی کەوا دڵ لە پەیوەندی لەگەڵ ئەندامەکانی تردا لە پلە و پایەیەکی وەك فەرمان ڕەوا و حاکمەکاندایە و ئەندامەکانی تر وەکو کاربەدەستن و گوێڕایەڵی ئەون و هەمان ئەو کارەی کە ئەو بڕیاری لەسەر دەدات ئەنجامی دەدەن و هەموویان بەبڕیاری ئەو ڕێگەی ئازاد بوون و سەر لێشێواوی دەگرنە بەر و شوێنکەوتووی ویست و ئارەزووی ئەون و پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت: ﴿ألا وانّ في الجسد مضغة إذا صلحت صلح الجسد كله﴾[٣].

واتە: بزانن کە لە جەستەدا پارچەیەك هەیە کە ئەگەر ئەو پارچەیە صالح بێت، تەواوی جەستە صالح و ئارام دەبێت.

دڵ حاکم و فەرمانڕەوای مرۆڤە و ئەندامەکانی تریش جێ بەجێ کەری فەرمانەکانی ئەون، هەمان ئەو ڕێگەیەی کە ئەو داوای دەکات و بانگەوازی بۆ دەکات ئەندامەکانی تریش دەیگرنە بەر، هیچ قسە و کردارێك لەپێش ویست و خواستی ئەوەوە ئەنجام نادەن، لە ئاکامدا بەرامبەر بە هەموویان بەرپرسیارە. چونکە هەر فەرمان ڕەوا و حاکمێك، لەبارەی کاربەدەستەکانییەوە بەر لێپرسینەوە دەکەوێت، کەواتە گرنگی دان بە چاکسازی و پاك کردنەوە و بەهێز کردنی دڵ لە ئەولەوییەتی بەرپرسیاییەتی ڕێبوارانی ڕێگەی سەربەرزی دونیاو بەختەوەری دواڕۆژدایە.

کاتێ کە شەیتانی ئاگر هەڵگیرسێنەر و گرتێبەری بەختەوەری و خۆشبەختی، لە ڕۆڵ و پلە و پایەی دڵ و تەوەرەی ئەو ئاگادار بوو خراپ کردن و لەناو بردنی دڵ

---

٣ متفق علیە.

ئامانجی سەرەکی دەبێت و بەجۆرەها وەسوەسە و دڵەڕاوکێ و ڕازاندنەوە و ڕاکێشانی ناڕەوای هەوا و ئارەزوو و جوان پیشان دانی کردار و قسەو وتوو وێژی خراپ و هەوەس بازانە لەسەر ڕێگەیدا داو دادەنێت و ئامرازی لادان و هەڵدێرانی بۆ ئامادە دەکات تاوەکو مرۆڤ لە جووڵە لەپێناو پەرستش و بەندایەتی کردندا بووەستێنێ و دووری بخاتەوە، وە ئەگەر نەتوانێ لە ڕێگەی ئەو داو و فریو فێڵانەوە بە تەواوی بێ توانای بکات، هەوڵ و تێکۆشانی سست و لاواز دەکات.

کە واتە بۆ دوورکەوتنەوەمان لە سەر لێشێواوی هیچ ڕێگە چارەیەکی ترمان نییە جگە لە وەرگرتنی یارمەتی و هاوکاری لە ڕێنموونی پەروەردگاری تاك و مەزن و پاڕانەوە و لالآنەوە بە مەبەستی ڕەزامەندی ئەو و شوێنکەوتنی هەمە لایەنەی دڵ لە ئەمر و نەهییەکانی و جگە لە پۆشاندنی خەڵات و بەخششی بەندایەتی و پەیڕەوکردن لە شەریعەت هیچ ڕێگەیەکی تر بۆ زامن کردنی پارێزراوی لە شەڕی شەیتان بوونی نییە.

پەروەردگار لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ﴾ سوورەتی حەجر ٤٢.

واتە: بەڕاستی بەندە چاك و پاکەکانی من بە تۆ فریو نادرێن و تۆ هیچ دەسەلآتێکت نییە بەسەریاندا (مەبەست لە ئیبلیسە)، جگە لەوانەی کە شوێنت کەوتوون لەسەرکەش و یاخی و سەرگەردانەکان.

هێنانەدی بەندایەتی پاك و جوان و تەواو ڕێگەکانی زاڵ بوونی شەیتان بەسەر مرۆڤدا دادەخات، وە سەرئەنجام مرۆڤ بە پلە و پایەی بەندایەتی کردنی پەروەردگاری جیهانیان دەگەیەنێت و پاکییەتی کردەوە و بەردەوامی و دڵ قایمی بۆ دڵ بەدیاری دەهێنێ، وە هەر کاتێ دڵ حەقیقەت و چێژی ڕاستەقینەی بەندایەتی و پاکییەتی چێشت و هەستی پێ کرد، لە نزیکەکانی پەروەردگار دەبێت و خاوەنی ئەم جیاوازی و جیاکردنەوەیە دەبێت کە: ﴿إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾ سوورەتی حەجر ٤٠.

واتە: بێجگە لە بەندە پوختە و دڵسۆزەکانی خۆت نەبێت (چونکە دڵیان بە باوەڕ بە تۆ و یادی تۆ ئاوەدانە، هەوڵ و کۆششی من (ئیبلیس) بۆ وێڵ کردنیان ناکامە).

بەڵام پەروەردگاری بەبەزەیی و میهرەبان بەچاکی خۆی مرۆڤی لە نەخۆشییەکانی دڵ و دەرمانە چارەسەرییەکان (شیفا دەرەکان)و دڵەڕاوکێ و وەسوەسەی شەیتانە ئاگر بەدەست و ئەنجام و شوێنهاتە کردەییەکانی ئەو دڵەڕاوکێیانە و باروودۆخانەی کە دواتر دڵ پەیدای دەکات، ئاگادار و شارەزای کردووەنەتەوە.

کاری خراپ دەرئەنجامی خراپی مەبەست و ویستی دڵە، وە کاری خراپ پیس کردنو ڕەش کردنەوەی دڵیان بە دواوەیە و نەخۆشی و ئازاردانی دڵ زیاد دەکات و لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی مردنی و تیشك و ڕووناکی ئەو دڵە دەکوژێنێتەوە. (لێرەدا مەبەست لە مردن ئەوە نییە کەوا بە یەکجاری ئەو دڵە لە کار و جووڵە دەکەوێت، بەڵکو ئەوەیە کەوا بەهۆی زۆری تاوانەوە ئەو دڵە وەکو بەردی لێ دێت و ڕەش دەبێتەوە و ئیتر توانای ئەنجامدانی کاری چاکەی نابێ و گەر توانایشی هەبێ زۆر کەمە، وەرگێڕی کورد).

تەواوی ئەو خراپی و سەر لێشێواویانە دەرئەنجامی هەڵخەڵەتاندنە بەرامبەر بە وەسوەسە و دڵە ڕاوکێ و هەوا و ئارەزووەکانی شەیتان و خۆ بەدەستەوە دانە بەرامبەر بە دوژمن و نەیارێ کە تەنیا لە ڕێگەی نا فەرمانی هەمە لایەنەی ئەو دوژمنەیە کە دەتوانین ئازادی و بەختەوەری بەدەست بێنین.

بڕیارمدا لەم پەرتووکەدا بە باس کردن و خستنە ڕووی نەخۆشییە مەعنەوییەکانی دڵ و ڕێگە چارەکانیان سەرقاڵ بم و خۆم خەریك بکەم، تاوەکو بەخشش و چاکەی پەروەردگار وە بیر خۆم بێنمەوە و دانی پێدا بنێم، وە ئومێدەوارم کە بۆ خوێنەرەکان سوودمەند و بە کەڵك بێت و بۆ نووسەرەکەی داوای لێ خۆش بوون بە بەزەیی بۆ بکەن لەلای پەروەردگار.

هیوادارم پەروەردگار ئەم كارەم بۆ پاك بكاتەوە، و لە زەرەرو زیان و خراپە پارێزراوی بكات، وە نووسەر و خوێنەرەكانی لە دونیا و دوارۆژدا سوودمەند بكات و سوودیان پێ بگەیەنێ، چونكە بە ڕاستی هەر ئەو بیسەر و زانایە، وە هیچ هەڵگەڕانەوەو توانایەك جگە لەلایەن پەروەردگاری بەرزی بەدەسەڵاتەوە مومكین نییە.

# سەلامەتی و نەخۆشی دڵ

## پلە و پایەی دڵ:

دڵ فەرمانڕەوایەکە کە بە سەر تەواوی ئەندام و توانا جەستەیی و مەعنەوییەکانی مرۆڤدا فەرمان ئەدات و ئەوانی لە ئەستۆگرتوە و ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ لە نێوانیاندا.

دڵ گرنگترین ئەندامی ئادەمیو کۆڵەکە و پایەی ژیان و سەرچاوەی ڕۆحی ئاژەڵی و جێگە و شوێنی غەریزە و بۆ ماوەیە.

دڵ کانگە و شوێنگەی هۆش و ژیری، زانست، هێمنی و، بەخشندەیی، ئازایەتی و بوێری، پشوو درێژی، خۆڕاگری، ئەوین و حەز لێکردن، ویست و ئیرادە، تووڕەیی و دڵخۆشی و چەند سیفەتێکی تری مرۆڤە.

تەواوی ئەندام و توانا ڕوواڵەتی و ناوەکییەکان، سەربازگەلێکی گوێڕایەڵ و بەردەست و گوێگری دڵن.

چاو دیدەوەری یەکەم و ڕێنموونی کەری ئەوە بۆ دۆزینەوەی شتە بینراوەکان و هەرکاتێ چاو شتێ ببینێ هەواڵ دەداتە دڵ و بەهۆی پەیوەندی و نزیکی بەهێزی نێوان دڵ و چاو هەرکاتێ شتێ لە یەکێکیاندا جێگیر بێ، لە ئەوی تریاندا بە دیار دەکەوێت و لە ڕاستی دا چاو ئاوێنەیەکە کە دەتوانرێ لە پاڵیدا ئەوەی کە لە دڵدا جێگیرە و بوونی هەیە، ببینی.

هەروەها زمانیش وەرگێڕ و گێڕەرەوەی ئەو شتانەیە کە لە دڵدان.

بەهۆی ئەمەوەیە کە پەروەردگاری بەرز و بەتوانا لە زۆربەی بوارەکاندا ئەو سیانەی لە پاڵ یەکتردا باس کردووە و ناویانی هێناوە و دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولاً﴾ سوورەتی ئەسرا ٣٦.

واتە: ئەی ئینسان لە شتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەكەوە كە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونكە بە ڕاستی دەزگاكانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی، بەرپرسیارە لە بەرامبەرییەوە.

هەروەها لە ئایەتێكی تردا دڵ و چاوی لە پاڵ یەكتردا هێناوە و دەفەرمووێت: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ﴾ سوورەتی ئەنعام ١١٠.

واتە: ئەو كاتە دڵ و چاوەكانیان هەڵدەگێڕینەوە (لە نێوان جۆرەها لێكدانەوە و ئەگەردا) هەر وەكو چۆن یەكەمجار لە سەرەتاوە باوەڕیان نەهێنابوو (بەدەسەڵاتی بێ سنووری خوا و ئەم هەموو موعجیزە بێ شومارە كە دەوری داون) ئێمە جارێ وازیان لێ دەهێنین تا لە ستەم و سەركەشی خۆیاندا سەرگەردان بن و ڕۆبچن (بۆ كوێ دەچن لەدەستمان دەرناچن).

بیستنیش (گوێ) كاری گەیاندنی هەواڵ و قسەی خەڵكانی تری بۆ دڵ لە ئەستۆدایە، وە زمانیش هەر وەكو وترا، نهێنی و شاراوەكانی دڵ بەخەڵكانی تر دەگوازێتەوە. بە شێوەیەكی گشتی دەتوانین بڵێین كە: ئەندامە ڕووالەتی و دەروونییەكانی تری مرۆڤ كاربەدەست و گوێڕایەڵی دڵن، وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(ألا وان في الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد كله وإذا فسدت فسد الجسد كله، الا وهي القلب)**[٤].

واتە: بزانن كە لە جەستەدا پارچەیەك بوونی هەیە كە ئەگەر ساڵح بێت تەواوی جەستەی مرۆڤ ساڵح دەبێت، وە هەر كاتێ خراپ و نالەبار بێت، تەواوی جەستەی مرۆڤ خراپ و نالەبار دەبێت، ئاگادار بن كە ئەو پارچەیە دڵە).

ئەبوو هورەیرە (ڕەزای خوای لەسەر بێت) دەفەرمووێت: ((دڵ فەرمانڕەوایە و ئەندامە ئاشكرا و دەروونییەكان سەربازی ئەون، ئەگەر فەرمانڕەوا پاك بێت،

٤ رواه البخاري (٥٢) ومسلم (١٥٩٩).

کاربەدەستەکانیش ڕێگەی پاکی دەگرنە بەر، بەڵام ئەگەر ئەو ناپاك و پیس بێت، کاربەدەستەکانیشی ڕێگەی ناپاکی دەگرنە بەر))[٥].

بەهۆی ئەوەی کە دڵ بە ژیان و مردن باسکراوە و وەسف دەکرێ، سێ بارووذۆخی تایبەت پەیدا دەکات:

## یەکەم: دڵێکی تەندروست (صحیح):

دڵی تەندروست ئەو دڵەیە کە تەنیا خاوەنانی ئەو دڵانە لە دواڕۆژدا ئەهلی ئاسوودە بوون و بەختەوەری و خۆشبەختی دەبن، هەروەکو چۆن پەروەردگاری گەورە و بەبەزەیی دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ لَا يَنْفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ (٨٨) إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ سوورەتی شوعەرا ٨٨ – ٨٩.

واتە: ئەو ڕۆژەی کە نە ماڵ سوود دەبەخشێت و (فریای ئادەمیزاد دەکەوێت) نە منداڵ و نەوە، مەگەر کەسێك بە دڵ و دەروونی پاك و بێگەرد و پڕ لە ئیمان، بە خزمەت پەروەردگار گەیشتبێت.

دڵی تەندروست، هەمان دڵی ساغ و درووستە و بەم هۆیە وشەی ساغ وەکو: درێژ و کەم کورتی و جوان بۆ سیفەت و تایبەتمەندی بەکار دێن، پەروەردگاریش ئەوی بۆ پێناسەکردن و وەسف کردنی دڵ بەکار هێناوە.

دڵی تەندروست، دڵێکە کە سەلامەتی و تەندروستی بۆی بەشێوەی سیفەت گەلێکی بەردەوام و ڕاوەستاویان لێ هاتبێ، وەکو: زانا و بە توانا، لەلایەکەوە تەندروست لەخاڵی بەرامبەری نەخۆش و ناساز و ناساغدا جێگیرە.

پێناسە گەلێك کە بۆ (دڵی ساغ و تەندروست) بەکار هاتوون، جیاوازن، بەڵام پێناسەیەك کە کۆکەرەوە و خڕ کەرەوەی هەموویانە ئەمەیە کە: ((دڵی ساغ و تەندروست دڵێکە کە لەگەڵ تەواوی ئەو ڕاکێشان و هەوا و هەوەسانەی کە لەگەڵ ڕێگە

[٥] مفتاح دار السعادە، بەرگی دووەم، لاپەڕە ١٦.

پێدراو و ڕێگه پێنەدراوەكانی پەروەردگاردا نا لەبار و ناسازگارن، ساغ و تەندروست بووە و له هەر جۆره شك و گومانێ كه لەگەڵ ڕێنموونییەكانی پەروەردگاردا دژایەتی هەبێ، خاڵی بێت.

له بەندایەتی كردن جگه بۆ پەروەردگار، ناوبژیوانی كردن جگه له ناوبژیوانی كردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ساغ و تەندروست بێت و له ئەوین و خۆشەویستی و گوێڕایەڵی تەواوی پەروەردگار كەسێ یاخود شتێ نەكاته شەریك و هاوتای و لەترس و پاڕانەوه و پشت بەستن و چاودێری و لاوازی و بێ دەسەڵاتی له بەرامبەر غەیری پەروەردگار پاك بێت، له هەر بارودۆخێكدا ڕەزامەندی ئەو بخاته پێش ڕەزامەندی خەڵكانی ترەوه و كەڵك له هەموو ڕێگەیەك وەربگرێ بۆ دوور كەوتنەوەی له خەشم و تووڕەیی پەروەردگار.))

ئەوەی كه وترا له ڕاستیدا حەقیقەتی یەكخواپەرستییه كه تەنیا بۆ پەروەردگاری بەدەسەڵات و مەزن ڕێگه پێدراو و ڕەوایه، به واتایەكی تر گەر دڵێ بەم جۆره بێ له: هاوەڵ بڕیاردان (شرك)، بەدیهێنان (بدعه)، گومڕایی و پڕووپووچی و بێهودەیی پاك و خاوێنه، وه ئەم ساغی و تەندروستیه تەواوی ئەو پێناسانەی كه له بارەی دڵی ساغ و تەندروستەوه وترا له خۆ دەگرێ.

دڵی تەندروست و ساغ ئەو دڵەیه كه له هەر جۆره هاوەڵ بڕیاردانێ به هەر جۆر و شێوەیەك پاك بێت و له بەندایەتی كردنی پەروەردگار و باوەڕدا، ویست و ئیرادە، خۆشەویستی، پشت بەستن، ئەنابەت، ملكەچی، ترس و پاڕانەوه پاك و بێ دوودڵی بێ.

كردار و كردەوەی خۆی پاك بكاتەوه بۆ پەروەردگار، ئەگەر دۆستایەتی و دوژمنایەتی دەكات، دۆستایەتی و دوژمنایەتییەكەی بۆ ڕەزامەندی پەروەردگار بێت، ئەگەر دەبەخشێ و یاخود له بەخشین خۆی دوور دەخاتەوه، لەپێناو ڕەزامەندی پەروەردگاردا ئەوانه ئەنجام بدات.

ئەمە كاتێك ئەو تێر دەكات كە لە خۆ بەدەستەوە دان و پایەداری كردن جگە لە بۆ پێغەمبەری خوا دووره پەرێزی بكات و خۆی بپارێزێ‌و، بە ویست و توانای دڵ پێداگری و سوور بوونی خۆی بۆ شوێنكەوتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و رۆیشتن بەدوای رێنموونی كردنی ئەودا لە كار و كردەوه و قسەدا لێبڕاو بێت، وه لە (بیرو باوەڕدا) كە حاڵی دڵە و لەو قسەدا كە گوزارشتە لە ناخی خۆمان، لە پەیڕەوكردنی جگە لە خاوەنی پەیام دووره پەرێزی بكات.

هەروەها لە ئیمان و ویست و خۆشەویستی و دوژمنی و نەیاری و شوێنكەوتەكانی ئەوانە و كار و كردەوەی ئەندامەكان لە شوێنكەوتن جگە لە شوێنكەوتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دووره پەرێزی بكات. بەسەر تەواوی بابەتە گرنگ و نا گرنگەكانی ژیان و رێنموونییەكانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جێ بەجێ بكات و هیچ باوەڕ و كار و كردەوه و قسەیەك كە جگە لەوەی ئەو رێنموونیكەریان بووه قبووڵ نەكات و ئەنجامیان نەدات.

هەروەها چۆن پەروەردگاری بەدەسەلات دەفەرموویت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ سوورەتی حوجورات ١.

واتە: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوه پێشی خوا و پێغەمبەری خوا مەكەون لە بڕیار و پێشنیاردا لە خوا بترسن و پارێزكار بن، چونكە بەڕاستی خوا بیسەره بە گوفتارتان، زانایە بە نیاز و نهێنییەكانتان.

واتە پێش قسەی ئەو نەكەون (مەبەست ئەوەیە كە قسەی خۆتان و خەڵكانی تریش با زاناو لێزانیش بن، نەخەنە پێش قسەی پێغەمبەرەوه، چونكە گەر هەر چەندەش زانا بن لەچاو زانایی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەر نەزان و هیچ نەزانن، (وەرگێڕی كورد)) وه قسە نەكەن و كار و كردەوەی پێچەوانەی رێنموونی كردنی ئەو ئەنجام نەدەن.!

هەندێ لە زانایانی سەلەف فەرموویانە: ((هیچ کار و کردەوەیەك نییە، – ئەگەرچی کەمیش بێت –کە لە بارەیەوە دوو پرسیار لە مرۆڤ نەکرێ، یەکەم: بۆچی ئەو کارەت ئەنجامدا..؟ دووەمیش: چۆن و بە چ شێوەیەك ئەنجامت داو جێ بەجێت کرد؟))

پرسیارەکەی ئەو لەگەڵ بۆنە و هۆکاردا دەستبەکار بووە و لە پەیوەندیدایە کە: ئایا ڕاکێشان و ویست و خواستی تایبەتی و بە پەلە و ئارەزووی دونیایی وەکو: خۆشەویستی پیاهەڵدان و ستایش کردنی خەڵك و تووڕەیی لە دادگەریان یاخود بەدەست هێنانی خۆشویستنێکی خێرا یاخود ناپەسەندی و ناڕەواییەك ناپایەدار و بێ دەوامە، یاخود بۆنە و هۆکارەکەی دەست بەکاربوونی لەپێناو بەندایەتی پەروەردگار و ویستنی نزیك بوونەوە و هەوڵ و کۆشش بۆ پاڕانەوە و لالآنەوە لە ڕێگەی ئامراز و هۆکارەوە بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەو بووە (پەروەردگار)؟

زەمینەی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە: ئایا سەبارەت بەو کارە لە بەرامبەر پەروەردگارتدا هەستت بە بەرپرسیارییەتی دەکرد، یاخود تەنیا بۆ بەجێهێنانی خوو و ڕاکێشانێکی هەوەس بازانە و ئارەزوو ویستانە ئەنجامت دەدا؟

**دووەم:** دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پرسیارە سەبارەت بە پەیڕەوی کردن لە ڕەوشت و شەریعەتی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیە وسلم) سەبارەت بەو کارە، بە واتای ئەوەی کە پەروەردگار لە مرۆڤ دەپرسێ کە ئایا ئەو کارە بەشێك بووە لە کارێ لەسەر زاری پێغەمبەرەوە لەسەر تۆم پێویست کردبوو؟ یاخود کارێ بووە کە من بڕیارم لەسەر نەداوەوە و پێی ڕازی نەبووم؟

**پرسیاری یەکەم:** پرسیار کردنە لەبارەی (یەك دڵی و دڵ پاکی) واتە (الآخلاص).

**پرسیاری دووەم:** لەبارەی پەیڕەو کردن و پابەند بوونە (التزام).

چونکە پەروەردگار هیچ کارێ بەبێ هێنانەدی ئەو دووانە قبووڵ ناکات و وەریناگرێ. وە ڕێگەی دەرباز بوون و وەڵامدانەوە بەپرسیاری یەکەم: بوونی ویست و نیازێکی پاك و خاوێن.

وە ڕێگەی دەرباز بوون لە پرسیاری دووەم: هێنانەدی پەیڕەو کردنە لە خاوەنی پەیام و سەلامەتی دڵ لە هەرشتێ کە لەگەڵ پاکی و شوێنکەوتن و پەیڕەو کردن لە دژایەتی دا بێ.

ئەمە حەقیقەتی دڵێکە کە بۆ خاوەنەکەی ئاسوودەیی و ڕزگاریی و خۆشبەختی گرتووەتە ئەستۆ.

## دووەم: دڵێکی مردوو (میت):

دڵی مردوو لە خاڵی بەرامبەر دڵی زیندوودا جێگیرە.[٦] دڵێکە کە خاوەنی ژیانێکە بە واتا ڕاستەقینەکەی نا، پەروەردگاری خۆی ناناسێ، بڕیار و فەرمانەکانی پەیڕەو ناکات و بەدوای بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەوەوە نییە، بەڵکو هاوڕێی هەوا و هەوەس و ئارەزووەکانییەتی و بەمەی کەوا ئەو سەرسەری و هەوەس و ئارەزوو بازییە دەبێتە هۆی خەشم و تووڕەیی پەروەردگار گرنگی پێ نادات و گوێی پێ نادات! مەبەستی ئەو تەنیا گەیشتنە بە ئامانجە تاوانبار و گوناهبارەکانی خۆیەتی و ڕەزامەندی و تووڕەیی پەروەردگار (جلّ جلاله) بۆ ئەو گرنگ نییە.

خاوەنی دڵی مردوو تەواوی خۆشەویستی، تووڕەیی، ڕەزامەندی، ڕق و تووڕەیی و هەستی گەورەیی تایبەت کردووە بە غەیری خواوەوە و لە خەڵکانی تر پەیڕەوی و گوێڕایەڵی دەکات: ئەگەر شتێکی خۆش بووێت یاخود ڕقی لە شتێ هەبێ، ببەخشێ یاخود لە بەخشین و خەڵات کردن دوورە پەرێزی بکات، تەواوی ئەوانە لەپێناو هەوا و هەوەس و ئارەزووی خۆیەتی کە ئەنجامی دەدات. ئەو تەواوی ئەوەی کە لە خزمەتی دایە داویەتی بەسەر پەرستش و خۆشەویستی پەروەردگاردا، ئیمام و پێشەوای ئەو

---

٦ مەبەست لە دڵی زیندوو و دڵی مردوو لێرەدا ژیان و مردن بە واتای زاراوەیی نییە، بەڵکو مەبەست لە زیندوو بوونی دڵ هۆشیاری و بە ئاگایی و وەرگرتنی حەق و پاکی و مەبەست لە مردن پێچەوانەکەیەتی.

هـەوا و هـەوەس و ئـارەزووە و ڕێنمـوونی کـەری ئـەو نـەزانی و بـێ ئاگاییـە و مەرەکەبەکەشی بێ خەبەری و نەشارەزاییە.

تەواوی توانای هزری خۆی بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە دونیاییەکان بەکارهێناوە و سەرخۆشی و بێ ئاگایی و هەوا و هەوەس و خۆش ویستنی دونیا سەراپای ئەوی داگیرکردووە و هاواری گەڕانەوە بۆ گوێڕایەڵی کردنی پەروەردگار و بەدەست هێنانی توێشووی دواڕۆژ لە شوێنێکی دوورەوە دەبیستێ و گوێ ناداتە ئامۆژگاری ئامۆژگاری کەران و گرنگی نادات بە بەزەیی و دڵسۆزی دڵسۆزان و لە هەر شەیتانێکی دیار و نا دیار گوێڕایەڵی دەکات؟

تەنیا مەسەلە ماددیی و دونیاییەکانە کە تووڕەیی و یاخود ئاسوودەیی و دڵخۆشی ئەو دەبزوێنێ و گوێی ئەو لە ئاست بیستنی حەق و ڕاستیدا کەڕە و هیچ نابیستێ و بۆ بیستنی شتی ناڕەوا و هیچ و پووچ کراوە و والآیە و دەبیستێ.

هاوڕێیەتی لە گەڵ خاوەنی ئەم جۆرە دڵەدا سەراپای نەخۆشی و ناهەمواری و هەڵس و کەوت و هاودەمی کردن لە گەڵیدا ژەهرێکی کوشندە و لە ناو بەرە و مایەی نەنگییە و هاو دەم و هاو ماڵ بوون لەگەڵیدا بە واتای مردن و لەناو چوونە.

## سێیەم: دڵێکی نەخۆش (نەخۆش):

جۆری سێیەم دڵێکە کە هەم خاوەنی ژیانە و هەمیش لە ئازار و دەرد و ناڕەحەتی، ڕەنج و ئازار دەکێشێ. وە لە دەروونی دا دوو هێز بوونیان هەیە کە هەر کامێکیان بۆ لای خۆی ڕایدەکێشێ، ساتێ ئەم و ساتێ ئەویان زاڵ دەبن بەسەر دڵیدا.

خۆشەویستی و باوەڕ و پاکییەتی و پشت بەستن کە تایبەتمەندی ژیانن بوونیان هەیە لەناویدا، بەلآم لە بەرامبەردا حەز کردن لە پەیڕەوی کردن لە هەوا و هەوەس و ئارەزوو و زاڵ بوون و گرنگی دان پێیان و هەوڵ و کۆشش بۆ بەدەست هێنانیان و هەروەها ڕژدی و خۆ بە گەورە زانین و خۆ ویستن و خۆشەویستی و فرو فێڵ و

ڕووبازیی، کە هۆکاری لەناو چوون و تێشکانی دڵن، تێیدا جێگە و شوێنی خۆیانیان چاك کردووە.

ئەم جۆرە دڵە لەلایەن دوو جارِ چییەوە (هاوارکەر) لە بەردەم تووش بوون و تاقیکردنەوەدایە. جارِچی یەکەم بانگی دەکات بۆ ئیمان و پەیرەوی کردن لە پەروەردگار و بەدەست هێنانی بەختەوەری و خۆش بەختی لە دوارِۆژدا. وە بانگی دووەم و هاواری دووەمیش بانگهێشتی دەکات و هاواری لێ دەکات بۆ نافەرمانی کردنی پەروەردگار و بەدەست هێنانی شتی دونیایی و خۆشی و کەیف خۆشییە زوو تێپەرِەکانی دونیا. وە لەم نێوەندەشدا دڵ بەو هاوار و بانگ هێشت کردنە رِازی دەبێتو قبوولی دەکات کە لە خۆی بە نزیکتر و هاو دەم دەزانێ.

**دڵی یەکەم:** زیندوو ستایشکەری خوا، هۆشیار و بە ئاگا و چاکە.

**دڵی دووەم:** مردووی بێ ئاگا، نەزان و رِەش هەڵگەرِاوە.

**دڵی سێیەم:** نەخۆش و ناهەمووارە، ساتێ نزیك دەبێتەوە لە تەندروستی و سەلامەتی و ساتێکیش دوور دەکەوێتەوە لە سەلامەتی و تەندروستی. لە ئایەتێکی قورئانی پیرۆزدا بە هەر یەکێ لەم سێ جۆرە دڵە ئاماژەکراوە و پەروەردگاری پایەبەرز ئەم سێ دڵەی لە پاڵ یەکتردا داناوە و لەم بارەوە دەفەرموویت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنْسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٥٢) لِيَجْعَلَ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فِتْنَةً لِلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ وَالْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ (٥٣) وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَيُؤْمِنُوا بِهِ فَتُخْبِتَ لَهُ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ سوورەتی حەج ٥٢ — ٥٤.

واتە: ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکی پەیامدار و بێ پەیاممان رِەوانە نەکردووە ئاواتی نەخواستبێ بە باوەرِ هێنانی قەومەکەی، بەلاّم کاتێك ئاواتی خواستووە شەیتان ئەوەی بە فرسەت زانیوە، شتی نا بەجێی تێکەلّ بە

ئاواتەکەی کردووە، ئینجا خوایش فریای کەوتووە و ئەوەی شەیتان فڕێی داوەتە ناو ئاواتەکەیەوە، سڕیویەتییەوە، لەوە و دوا خوای گەورە ئایەت و بەرنامەکەی خۆی چەسپاو دامەزراو کردووە، خوا خۆی زانا و دانایە. (خوای گەورە بۆیە ئەو دەسەڵاتەی دلوە بە شەیتان) تا ئەو (خەتەرە و خەیاڵ و وەسوەسەیەی) شەیتان فڕێی دەداتە ناو ئاواتی پێغەمبەرانەوە ببێتە هۆی سزا و تاقیکردنەوە بۆ ئەوانەی لە دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی و دووڕوویی و ناپاکی هەیە و بۆ ئەوانەش کە بەرامبەر ئایینی خوا دڵ ڕەقن، بە ڕاستی ستەمکاران لە دژایەتی و شەڕەنگێزییەکی قووڵ و بێ بندا ڕۆچوون. بۆ ئەوەی ئەوانەی زانست و زانیارییان پێ بەخشراوە دڵنیا بن و بزانن کە بێگومان ئەم قورئانە حەقیقەت و ڕاستە و لەلایەن پەروەردگاری تۆوە (ئەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم) ڕەوانە کراوە، ئینجا بڕوای پتەوی پێ دەهێنن و دڵەکانیشیان ملکەچ دەبێت بۆ خوا، بێگومان خوا هیدایەت دەری ئەوانەیە کە باوەڕیان هێناوە بۆ ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و درووست.

پەروەردگاری بە دەسەڵات لەم ئایەتەدا ئاماژەی بە سێ جۆر دڵ کردووە کە دووان لەوانە لە بەردەم تووش بوون و (فتنه)و لەناو چووندان و سێیەمینیشیان دڵێکە کە دەبێتە هۆی ڕزگاری و بەختەوەری و خۆشبەختی خاوەنەکەی. یەکێ لەو دوو جۆرە، دڵێکی شڵەژاو و گیرۆدەیە و ئەویتریشیان دڵێکە کە بە بۆنەی نەخۆشی دەروونییەوە ئازار دەکێشێ و ئەوەکەی تریان دڵێکە کە ڕەشی و تاوان دایگرتووە.

دڵی سێیەم و دەرباز بوو دڵی مرۆڤی ئەهلی ئیمان و باوەڕە، کە ڕووی کردووەتە پەروەردگار و بەڕاستییەتی ڕێنموونی کردنی ئەو باوەڕەی هەیە و دڵنیایەو گوێڕایەڵو کاربەدەستی بڕیار و فەرمانەکانی ئەوە. چونکە لە دڵ و ئەندامە دیار و نا دیارەکانی مرۆڤ چاوەڕووان دەکرێ کە ساغ و تەندروست بن و لە هیچ جۆرە دەرد و نەخۆشی ئازار نەکێشن، تاوەکو بتوانن بۆ ئەو شتەی کە درووست کراون، کردەوەیی پێ بکەن.

دوورکەوتنەوەی دڵ لە دۆخی سەلامەتی و پایەداری، یا بە هۆی تاوان و تووڕەیی و هەڵنەسانە بە جێ بەجێ کردنی بەرپرسیاییەتی کە بۆ ئەوە درووست کراوە، وەکو: دەست و پێی ئیفلیج و نەخۆش، زمانی لاڵ، چاوی کوێر. یا بە هۆی نەخۆشی و بەلای دەروونییەوەیە کە دەبێتە لەمپەر و ڕێگر لە بەردەم هەستانی دڵ بۆ جێ بەجێ کردنی کارەکان بەشێوەیەکی درووست. بەهۆی ئەمەوەیە کە دڵەکان بەسەر سێ جۆردا دابەش بوون:

دڵی درووست و تەندروست: کە لە نێوان ئەو و قبووڵ کردنی حەق و خۆشەویستی و ڕێز و زاڵ کردنیدا بەسەر کارەکانی تردا، تەنیا دەرك و ناسین و ئاشنایەتی ئەوان جێگیرە و دوای درك کردن و ناسینی دروست، حەق و حەقیقەت مل دەدات و لەبارەی ناسینی حەقیقەت و بڕیار دان و پەیڕەو کردن لێی گرفتێکی نییە.

بەلام دڵێ کە تاوان و گوناح سەراپای ئەوی داپۆشیوە و تووشی مردنی مەعنەوی بووە بە ناڕەحەت گوێ بیستی حەق و ڕاستی دەبێ و گوێڕایەڵی دەبێ.

دڵی نەخۆشیش ئەگەر زاڵ نەبێ بەسەر نەخۆشییەکەیدا، هێور هێور بەرەو ڕووی تاوان و مردن دەڕوات و ئەگەر سەلامەتی و تەندروستیشی زیاد بکات زیاتر بەرەو ڕووی چاکەو بەختەوەری و خۆشبەختی دەڕوات.

## شەیتان دوورە لە دڵی تەندروستەوە:

ئەو دوودڵی و گومانانەی کە شەیتان لە گوێکاندا دەیڵێتەوە و ئەو گومان و دوودڵیانە کە دەیانخاتە نێو دڵەکانەوە، ڕێگە خۆشکەری تووش بوون (فتنە)و خراپەکاری، ئەو دوو جۆرە دڵانەیە واتە دڵی نەخۆش و دڵی تاوانبار و ڕەش و هەڵگەڕاو.

بەلام درووستکردنی ئەو گومان و دوو دڵیانە بۆ دڵی تەندروست دەبێتە هۆی بەهێزی و سەقامگیری و وریایی و زیرەکی زیاتر، چونکە ئەوانە بە هیچ نازانێ و

بەهیچو پووچ و ناڕەوایان دەزانیّ، وە دەزانیّ کە حەق و ڕاستی و حەقیقەت لە بەرامبەر ئەوانەوە جێگیرە، بەم هۆیەوە دەڕوات بەدوای حەق و ڕاستیدا و ئاسوودەیی خۆی لە ئاگایی و پەیوەست بوون پێیانەوە دەزانیّ، وە زیاتر هەست دەکات بە پووچی و بەتاڵی دوودڵییەکانی شەیتان و ئیمان و باوەڕ و ڕێزگرتنی بۆ حەق و ڕاستیو دوورکەوتنەوە و تووڕەیشی لە باتڵ و شتی ناڕەوا زیاتر دەبێت.

بەڵام دڵە نەخۆش و تووش بووەکان هەمیشە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی گومان و دوو دڵییەکانن لەلایەن شەیتانەوە.

بەڵام دڵە ساغ و تەندروستەکان بەهیچ جۆریّ ناکەونە ژێر پاڵە پەستۆی دوو دڵی و هەڵخەڵەتاندنەکانی شەیتانەوە.

# بەشی دووەم

# نیشانەکانی سەلامەتیو نەخۆشی دڵ

# تەوەری یەکەم: نیشانەکانی سەلامەتی و نەخۆشی دڵ

## پێناسەی نەخۆشی دڵ:

هەریەکێ لە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ بۆ کارێکی تایبەتەوە دروست کراوە و تەواوی و کامڵی ئەو لە بەجێهێنانی هەر چ باشتری ئەو کارە دەستەبەر دەبێ و دێتە دی. بەڵام نەخۆشییەکەی ئەمەیە کە لە دەست بەکار بوونی کارێ کە بۆی درووست کراوە بە تەواوی دوا بکەوێت، یاخود بە شێوەیەکی لاواز و نا ڕێك و پێك ئەنجامی بدات.

نەخۆشی و کەم و کوڕی دەست ئەمەیە کە ناتوانێ کار و بەرپرسیارییەتی خۆی بە جوانی بە ئەنجام بگەیەنێ.

نەخۆشی چاو ئەوەیە کە توانای بینین و سەرنجدانی بە شێوەیەکی ویستراو و خوازراو لەدەست دابێت.

نەخۆشی و کەم و کوڕی زمانیش ئەمەیە کە توانای وتوو و وێژو قسەکردنی نەبێت.

نەخۆشی جەستەیی ئەوەیە کە جووڵە و هێزی سروشتی خۆی لەدەست بدات یا لاواز و بێ هێز بێت.

**نەخۆشی دڵ:** ئەویش ئەوەیە کە لە ناسین و ئاشنایەتی، ڕێز، خۆشەویستی و حەز لێکردن بۆ بینینی پەروەردگار و چاودێری و گەڕانەوە بۆی و بەرز نرخاندنیان بەسەر کارەکانی تردا – کە بە هۆی ئەوانەوە درووست کراوە – بێ تواناو بێ هێز بێت.

هەر وەکو چۆن کە مرۆڤ جگە لە خودای خۆی هەر شتێکی تر بپەرستێ و بناسێ و ئەگەر چی بگاتە تەواوی خۆشی و بەخششەکانی دونیا، ناگاتە پلە و پایەی

خۆشەویستی پەروەردگار و ئارەزوو و مەیلی بینین و هاودەمی و هاوڕازی لەگەڵی دا و وەکو ئەوە وایە کە بە هیچ شێوەیەك بەچێژ، بەخشش و بەختەوەری و خۆش بەختی نەگەیشتبیّ.

تەنانەت ئەگەر دڵی مرۆڤیش خاڵی بێت لە خۆشەویستی پەروەردگار، تەواوی چێژو بەخششەکان دەگۆڕێن بۆ ئازار و بەدبەختی و چارەڕەشی و لە دوو ڕوانگەوە بە هەمان ئەو ڕێژە و ئەندازەیەی کە لە بەخششەکان بەهرەمەند بووە، لە پەرێشانی و ئازاردا دەبیّ:

– بەهۆی لە دەست دانیانەوە و بەهۆی خۆش ویستن و دڵخوازی و ئارەزوویەکی زۆر کە هەیانە بۆ ئەو بەخشش و چێژ وەرگرتنانە و ئەمەی کەوا ڕۆژیّ لەدەستیان دەدەن،،

– هەروەها بەهۆی لەدەست دانی شتیّ کە لە تەواوی ئەو خۆشی و چێژ وبەخششە ماددیانە بەرزتر و بەردەوام تر و هەمیشەیی ترن.

هەرکەسیّ بە ناسینی ڕاستەقینەی پەروەردگار بگات، بەدروستی ئەوی خۆش دەویّ، پەرستش و یاد کردنی بۆ پەروەردگار پاك دەکاتەوە و خۆشەویستی ئەو لەگەڵ خۆشەویستی هیچ شتێکی تردا ناگۆڕێتەوە.

هەرکەسیّ خۆشەویستی شتیّ لەگەڵ خۆشەویستی پەروەردگاردا بگۆڕێتەوە و خۆشەویستی ئەو شتە لە خۆشویستنی پەروەردگار بە بەرزتر و باشتر بزانیّ، ئەو دڵە نەخۆشە، بە هەمان شێوە کە ئەگەر گەدە بە خواردن گەلێکی پیس و خراپ خوو بگرێت و ڕابێت، ئەوسا ئەو خواردنە پیس و بەسەر چووانە بە باشتر دەزانیّ لە خواردنە پاك و دڵخوازەکان، خواردنی ئەو دووانە لە گەڵ یەکتردا دەگۆڕدریّ.

## هەست کردن بە نەخۆشی دڵ:

هەندێ جار دڵ تووشی نەخۆشی دەبێ و لە کاتێکدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەو نەخۆشییە زۆرتر دەبێ، خاوەنی ئەو دڵە بەهۆی، سەرقاڵی دڵییەوە و بێ ئاگابوونی لە ئامراز و هۆکاری تەندروستی و نەخۆشی دڵ، لێی بێ ئاگا دەبێت و تەنانەت هەندێ جاریش دڵ ڕووبەڕووی مردن و تیاچوون دەبێتەوە، بەڵام خاوەنەکەی ئاگای لە مردنی نییە.

نیشانەی مردنی دڵ ئەمەیە کە:

- هەست بە خراپی و ناپەسەندی تاوانەکان ناکات.
- نەناسینی حەق و ڕاستی و گیرۆدە بوون لە نێو داوی باوەڕە هیچ و پووچەکانی خۆیدا، ئازار وئەزییەتی نادات.

چونکە ئەگەر دڵ زیندوو بێت، لە گیرۆدە بوونی بە خراپییەکان و کار گەلی ناشیرین و ناڕەوا تووشی ئازار و ئەزییەت و پەرچەکردار دەبێتەوە و بە ئەندازەی بەهرەمەند بوونی خۆی لە ژیانی ڕاستی و حەقیقی، لە نەزانین و بێ ئاگایی خۆی بەرامبەر بە حەق هەست بە ئازار و ئەزییەت دەکات.

چونکە ((وما لجرح بميت ايلام)) واتە: ((برینداركردن و زامداركردنی مردوو مردووەکە ئازار نادات)).

## سەختی خۆڕاگری لەسەر دەرمان ( دەوا ):

هەندێ جار مرۆڤ هەست دەکات کە دڵی تووشی نەخۆشی بووە، بەڵام سەختی خۆڕاگری لەسەر دەوا و دەرمان و پشوو درێژی لە بارەیەوە بەلایەوە قورس و سەختە، وە بەردەوامی نەخۆشییەکە بە باشتر دەزانێ لە ئازار و ئەزییەتی دەرمانەکە چونکە دەوا و دەرمانی ئەو لە بەرامبەریدا بە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هەوا و هەوەس و ئارەزوودا جێگیرە و ئەم کارەش لەسەر نەفسی مرۆڤ زۆر سەخت و قورسە، لەکاتێکدا هیچ شتێ لەوە سوودمەندتر و بە کەڵك تر نییە بۆی.

هەندێ جاریش ویست و نیازی خۆی بۆ خۆڕاگرتنی سەختییەکانی بەریەرەکانێ لە گەڵ ڕاکێشانەکان و هەواو ئارەزووەکانی نەفس لێدەبڕێ و سوور دەبێ، بەلاّم دوای ماوەیەك ویست و ئیرادەکەی لاواز دەبێت و بەهۆی لاوازی زانست، تێگەیشتن و خۆڕاگری لەدرێژەدانی بە ڕێگەکە دوا دەکەوێت و بەجێ دەمێنێ. هەروەکو چۆن کەسێ کە لە ڕێگەیەکی پڕ مەترسیدار و ترسناکدا کە لە کۆتاییدا ئارامی و ئاسوودەیی‌و ئاسایش جێگیر بوو بێ. بیەوێ هەنگاو هەڵبگرێ و بزانێ ئەگەر خۆڕاگرو بە توانا بێت، ترس پێ دێت و بە مەبەست و ئامانج و ئارامش دەگات.

ئەم جۆرە مرۆڤە بۆ گەیشتن بە ئامانج پێویستی بە توانایی، هەوڵ و کۆشش، خۆڕاگری و دڵنیایی هەیە، بەلاّم هەرکاتێ خۆڕاگری و دڵنیا بوونی ئەو لاواز بێت، لە درێژەدان بە ڕێگە بەجێ دەمێنێ و دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ هەمان جێگاو شوێنی پێشووی خۆی، وە خۆ گرتن و بەرگەگرتنی سەختییەکان لەدەست دەدات. بەتایبەت ئەگەر لە ڕێگەدا هاوڕێیەك هاوڕێیەتی و هاودەمی ئەو نەکات و ترس لە تەنیایدا سەراپای دابگرێ و بەخۆی بڵێ: خەڵکی بۆ هەر کوێ ڕۆیشتن و هەر ڕێگەیەکیان گرتە بەر، منیش هەمان ڕێگەی ئەوان دەگرمە بەر.

ئەمە باروودۆخی زۆرێکە لە مرۆڤەکان و هەر ئەم بابەتەش بواری ڕەخساندووە بۆ لەناو بردنی زۆرێك لەو مرۆڤانە.

## نیشانەکانی نەخۆشی دڵ:

هەروەکو وترا: یەکێ لە نیشانەکانی دڵی تووش بوو بە نەخۆشی دوور کەوتنەوەیە لە خواردنی مەعنەوی گونجاو و ویستنی کاروباری خراپ و پیس و زیان بەخش و لە بری بەکار هێنانی دەوا و دەرمان ڕوو دەکاتە لایەنی زیاتر کردنی ئێش و ئازاری خۆی.

لەم پەیوەندییەدا چوار بابەت بوونیان هەیە:

١. خواردنێکی چاك و بەسوود.

٢. دەرمانێکی چارەسەرکەر.

٣. خواردنێکی خراپ و بێ کەڵك و زیان بەخش.

٤. دەرمانێکی مرێنەر و لەناو بەر.

## نیشانەکانی سەلامەتی دڵ:

بەڵام دڵی ساغ و سەلامەت، کاروباری سوودمەندو چارەسەرکەر لە چاو کاروباری خراپ و زیان بەخش و لەناو بەر – بە پێچەوانەی دڵی نەخۆش – بە باشتر دەزانێ.

– چاکترین و گرنگترین خواردنی دڵ، ئاگایی و شارەزایی و ئیمان و باوەڕە.

– وە بە کەڵکترین و باشترین داو و دەرمان، ئایەتە چارەسەرکەرەکانی (شفا بەخش) قورئانە کە هەریەکێ لەوانەش خواردن و دەوا و دەرمانە.

یەکێکتی تر لە نیشانەکانی دڵی ساغ و تەندروست و زیندوو ئەمەیە کە، لە پەرستش و خۆش ویستنی دونیا ڕادەکات و خۆی لێ دەرباز دەکات و ڕوو دەکاتە ویستنی دواڕۆژ، وە بە جۆرێ باوەڕی بە دونیای دوای مردن هەیە و هەوڵ و کۆششی بۆ دەدات و توێشووی خۆی ئامادە دەکات کە هەروەکو ئەوە وایە لە ئەساس و بنچینەدا زێدو نشینگەی ئەسڵی ئەو لەوێدایە. هەر وەکو چۆن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە عبداللەی کوڕی عومەری فەرموو: **(كن فى الدنيا كأنك غريب او عابر سبيل، وعد نفسك من اهل القبور)**.

واتە: لەدونیادا بەشێوەیەکبە وەکو ڕێبوار و ئاوارە و دەربەدەرێ و خۆت بە ئەهلی گۆڕستان لە قەڵەم بدە.!

| | |
|---|---|
| **فحيَ على جنات عدن فإنها** | **منازلك الأولى وفيها المخيَّم** |
| **ولكننا سبي العدو فهل ترى** | **نعود الى أوطـــانـا ونسلم** |

واتە: (بۆ ڕۆیشتن بەرەو باخەکانی بەهەشتی هەتا هەتایی خۆت ئامادە بکە، چونکە ماڵ و جێگەی مانەوەی سەرەتایی تۆ لەوێیە، بەڵام دەست بەسەری داوی

دوژمنین، هەست ئەکەن و وا ئەزانین بە ساغ و سەلامەتی دەگەڕێینەوە بۆ زێد و نیشتمانی خۆمان).

عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: ((دونیا لەکاتی ڕۆیشتن‌و پشت تێکردندایەو دواڕۆژیش لەکاتی هاتن و پێشوازی کردندایە و بۆ هەریەکەیان ئەهل وشوێنکەوتووانێ هەیە، هەوڵ بدەن و تێبکۆشن لە ئەهلی دواڕۆژ بن و دڵ بە دونیا خۆش نەکەن، چونکە ئەمڕۆش ڕۆژی هەوڵدانە بەبێ لێپرسینەوەو سبەینێش ڕۆژی لێپرسینەوەو لێپێچینەوەیەو دەرفەتێ نابێ بۆ هەوڵ و تێکۆشان.))

بە هەر ڕێژەیەك کە نەخۆشی دڵ ببوژێتەوە و گەشە بکات، هەنگاو بەرەو دونیایەکی تر هەڵدەگرێ و خۆی لێ نزیك دەکاتەوە و ئەو نیشتمانە بەجێگەی ئاسوودەیی و دامرکاندن و نیشتنگەی خۆی دەزانێ. بەڵام بە هەر ڕێژە و ئەندازەیەك کە دڵ تووشی نەخۆشی بێت ئەو ڕێژەیە زیاد بکات، زیاتر ڕوو دەکاتە دونیا و بە باشتری دەزانێ لەچاو دواڕۆژداو بەزێد و نیشتمانی خۆی دەزانێ و بەشێوەی ئەهلی دونیای لێ دێت.

یەکێکی تر لە نیشانەکانی سەلامەتی دڵ: ئەوەیە کە بەردەوام خاوەنەکەی دەخاتە بەر سەرزەنشت و لۆمەکردنەوە تاوەکو نەیگەڕێنێتەوە بۆ بارەگای پەروەردگار و ڕووکردنە ڕەحم و میهرەبانی پەروەردگار وازی لێ ناهێنێ و دەست بەرداری نابێ. وەکو ئەویندارێ کە بە لا ئیرادەیی دەبێتە شوێنکەوتەی یارەکەی و ژیان، بەختەوەری، سەربەرزی و ئاسایش و ئارامی خۆی تەنیا لەپێناو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی، هاودەمی و هاوڕازی، نزیکی ئەو بە جێگیر دەزانێ. ئارامی و ئاسوودەیی بە بوونی لە پاڵ پەرستراو و خۆشەویستە ڕاستەقینەکەی و شادمانی و پشت ئەستووری و دڵنیایی و هیوا و ئومێد و ترسیشی تەنیا بۆ ئەوەیە.

هێزو توانای خۆی لە یاد کردن و ستایش کردن، وە خواردنیشی لە گوێڕایەڵی و ژیان، بەخشش، چێژ و شادی و دڵخۆشی خۆی لە خۆشەویستی و ڕێزگرتنی ئەودا

دەدۆزێتەوە. وە چارەسەری تەواوی ئازارەکانی خۆی بە چاودێری ئەو و ئامراز و هۆکاری تەواوی نەخۆشییەکانیشی بە چاودێری کردن و گەڕانەوە بۆ لای ئەو دەزانێ نەك کەسێکی تر.

هەرکاتێ بە بارەگای گەورەی پەروەردگاری بگات هەست بە ئاسوودەیی و ئارامی دەکات و پەرێشانی و نیگەرانی و دڵ پەشێوییەکانی لە ناو دەچێ و تەواوی پێویستییەکانی خۆی بە بەرهەم هاتن دەزانێ.

چونکە دڵ پێویستییەکی هەیە کە هیچ شتێ جگە لە خۆشویستن، ناسین و پەرستشی پەروەردگار ناتوانێ جێ بەجێی بکات. وە ئاوات و پێویستییەکی هەیە کە جگە لە ڕووکردنە پەروەردگار هیچ شتێکی تر بەرزی ناکاتەوەو. نەخۆشیەکیشی هەیە جگە لە دڵسۆزیو یەکخواپەرستی پەروەردگار بە هیچ شتێکی تر چاك نابێتەوە.

دڵی سەلامەت بەردەوام خاوەنەکەی خۆی دەخاتە بەردەم لێپرسینەوە وە تا ئەو کاتەی کە لە پاڵ خۆشەویستی و پەرستنی پەروەردگاریدا ئارامی و دڵنیایی بەدەست نەهێنێ وازی لێ ناهێنێ و بە تەنیا بەجێی ناهێڵێ. تەنیا ئەو کاتەیە کە لە گەڵ ڕۆح و ڕاستی ژیان هاوڕاز و هاودەم دەبێ و چێژ و خۆشی ئەو دەچێژێ و لە ژیانی بەهرەمەند دەبێ کە لەگەڵ ژیانی بێ ئاگایانێ کە لە ئامانج گەلێ کە بۆ ئەوان درووست کراون، پاشگەز و پەشیمان بوونە و (ئامانج گەلێ جەهەننەم و بەهەشت بۆ ئەوە دروستکراوە و پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت) ڕاسپێردراون و پەرتووك گەلێ ڕەوانە کراون و دابەزیون) جیاوازە)).

ئەگەر ئەو جگە لە بوونی نەفسی خۆی دەستکەوت و پاداشتێکی نەبووایە، ئەمە بۆ ئازاردانی ئەو بەس بوو وە بەهۆی لەدەستدانی ئەو تووشی خراپترین پەرۆشی و تۆڵەکردنەوە و سزادان دەبوو. هەندێ لە زانایان و خواناسان وتوویانە: ((دونیا پەرستانی بێچارە، کاتێ دەستیان لە دونیا کورت بوویەوە، کە لە گرنگترین و بە بایەخ ترین بەخشش و چێژی ئەو بێبەش بوون..!

پرسیاریان لێ كرا كه: چاكترین و به كه‌ڵك ترین به‌خششی دونیا چییه..؟

وتیان: خۆشه‌ویستی په‌رستش و په‌یڕه‌وی كردن و گوێڕایه‌ڵی په‌روه‌ردگار و ئه‌وین و خۆشی بۆ بینینی ئه‌و كه له‌گه‌ڵ هیچ به‌خشش و چێژ و خۆشییه‌كی تر شایه‌نی به‌راورد كردن و هه‌ڵسه‌نگاندن نییه)).

یه‌كێكی تر له زانایان و خواناسان وتوویه‌تی: ((هه‌ندێ جار باروودۆخ گه‌لێكم به‌سه‌ردا دێت و ده‌ڕوات كه تێیدا ده‌ڵێم: ئه‌گه‌ر به دروستی به‌هه‌شتییه‌كانیش له‌م جۆره ژیانه پڕ له به‌خشش و خۆشییه به‌هره‌مه‌ند بن، به ڕاستی ئه‌هلی به‌خته‌وه‌ری و كامه‌رانین!))

یه‌كێكی تر وتویه‌تی: ((سوێند به په‌روه‌ردگار دونیا جگه به خۆشه‌ویستی، گوێڕایه‌ڵی و په‌رستشی خوا بایه‌خێكی نییه و به‌هه‌شتیش به بێ بینینی ئه‌و تام و چێژو بایه‌خی نییه.!))

ابو الحسن الوراق وتویه‌تی: ((ژیانی دڵ به یادكردن و په‌رستشی زیندو و نه‌مرو خۆشویستن و حه‌ز لێكردن به‌ژیانێكی هێمن و باوه‌ڕ پێكراو له خزمه‌ت و دیوان و باره‌گای مه‌زنی په‌روه‌ردگار وابه‌سته‌یه)).

له‌به‌ر ئه‌مه‌یه مردنی دڵ و بێ به‌ش بوون له ناسین و په‌رستشی په‌روه‌ردگاری تاك و ته‌نیا له‌لای زانایان و خواناسان به نۆبه‌ی خۆی له مردنی سروشتی سه‌ختتر و قورس تره. چونكه بێ به‌ش بوون له ناسین و په‌رستنی په‌روه‌ردگار، دابڕانه له حه‌ق و ڕاستی و مردنی سروشتیش دابڕان و دووركه‌وتنه‌وه‌یه له خه‌ڵك و سروشت و جیاوازی نێوان ئه‌م دووه جیاوازییه‌كی گه‌وره‌یه.

یه‌كێكی تر له خواناسان ئه‌ڵێت:((ئه‌گه‌ر سه‌رقاڵی و شادومانی هه‌ركه‌سێ به ناسین‌و په‌رستنی په‌روه‌ردگار بێ، هه‌موو شتێ و هه‌موو كه‌سێ دڵبه‌ندی ده‌بن و له‌بوونی ئه‌و شادومان و خۆشحاڵ ده‌بن. به‌ڵام كه‌سێ كه ته‌واو سه‌رقاڵی ناسین و په‌یڕه‌و كردن و

گوێڕایەڵی كردنی پەروەردگار نەبێ، خەم و پەژارەی دونیا دڵی پارچە پارچە دەكات)).

یەحیای كوڕی مەعاز ئەڵێت: ((هەركەسێ لە پەیڕەوی كردن و گوێڕایەڵی كردنی پەروەردگار خۆشحاڵ و شادومان بێت، هەموو كەسێ و هەموو شتێ لە خزمەت كردن بەو خۆشحاڵ و دڵخۆشن و هەر كەسێ لە ناسینی پەروەردگار دڵخۆش و خۆشحاڵ بێ هەمووان بە بینینی ئەو شادومان و كەیفخۆش دەبن)).

یەكێكی تر لە نیشانەكانی سەلامەتی دڵ: ئەوەیە كە لە یاد و ستایشی پەروەردگار كەمتەرخەمی ناكات و لە خزمەتكردن پێی ماندوو نابێت و جگە لەئەو نابێتە هاودەم و دۆستی كەس،مەگەر كەسێ یا خود شتێ كەوا ڕێنمونی بكات بۆلای زیكر و یاد و نزیكبوونەوە لە خودا.

یەكێكی تر لە نیشانەكانی سەلامەتی دڵ: ئەوەیە كە هەركاتێ یادكردن و نوێژی لەدەست بڕوات – لە مرۆڤێكی زۆر چاو لە دوو (زگ برسی)و دونیا پەرست كە دونیای خۆی لەدەست بدات – زیاتر هەست بەئێش و ئازار و ناڕەحەتی دەكات.

یەكێكی تر لە نیشانەكانی دڵی ساغ و تەندروست ئەمەیە كە وەكو تامەزرۆیی كەسێكی ون بوو و زۆر برسی بۆ خواردنێكی بەتام، بۆ پەرستن و پەیڕەوی كردنی پەروەردگار خۆشی و شادی و مەیل نیشان دەدات.

یەكێكی تر لە نیشانەكانی سەلامەتی دڵ ئەوەیە كە هەركاتێ دەستی كرد بە نوێژ كردن، تەواوی خەم و سەرقاڵییەكانی دونیا لە بیر دەكات و كۆتایی هاتن بە نوێژەكە لەلای ئەو قورسە، چێژ و ئاسوودەیی خۆی لەو نوێژەدا دەبینێ و بەهۆیەوە هەست بە خۆشی و شادومانی دەكات.

یەكێكی تر لە نیشانەكانی دڵی سەلامەت و تەندروست ئەمەیە كە خۆشەویستی و سەرقاڵی خاوەنەكەی بە پەرستش و گوێڕایەڵی كردنی پەروەردگار دیاری كراو و سنووردار دەبێ.

نیشانەیەكی تر، ئەو سەبارەت بەهەدەر نەدانی كات و تەمەنی خۆی لە مرۆڤە ڕژد و ماڵ پەرستەكان، زیاتر هەڵپە هەڵپ و چاو چنۆكی نیشان دەدات.

یەكێكی تر لەنیشانەكانی ئەمەیە زیاتر لەو بایەخەی كە بەرامبەر بەكار و كردەوە و پەرستش هەیەتی، گرنگی دەدات بە چاكسازی ئەوان، وە بە هێنانە كایەی دڵپاكی و شوێنكەوتن و چاكسازی كردنی ئەوانە لەخۆی خۆشی و شادی و مەیل نیشان دەدات و لە هەمان كاتدا بەزەیی و میهرەبانی و بەخشش ڕێنموونی پەروەردگار و كەم تەرخەمی و لاوازی خۆی لە بەرامبەر ئەودا فەرامۆش ناكات.

ئەمە سێ پلە و پایەیە، كە تەنیا دڵە ساغ و سەلامەتەكان پێی دەگەن.

## بەكورتی:

سەبارەت بە دڵی دروست و سەلامەت دەبێ بڵێین كە تەواوی هەم و خەمی ئەو لە ئاگاداری بوون لە پەروەردگار و (هەمیشە هەوڵ ئەدات پەروەردگاری لەبیر نەچێ و لە یادیدا بێ، وەرگێڕی كورد)، تەواو خۆشەویستی و مەبەستەكانی، توانای مادی و مەعنەوی، خەوتن و بە ئاگا بوون و كردەوە و قسەی لە ئاست ڕەزامەندی پەروەردگاردا ڕێك دەخات و تەواوی بیر و ئەندێشە و سەرقاڵییەكانی لە پەیوەندی بە ناسین، پەرستش و بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگارە.

خاوەنی ئەم جۆرە دڵە تەنیا بوون و هاودەم بوون لەگەڵ پەروەردگاردا بە باشتر دەزانێ لە دۆستایەتی و هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ خەڵكی دا. مەگەر ئەوەی كەوا هاودەم بوونی لەگەڵ خەڵكی دا ڕێگەیەك بێت بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگار (جل جلالە). ئەو خۆشی و ئاسوودەیی و هێمنی و ئاسایشی خۆی لە پەیڕەو كردن لەڕێنموونی پەروەردگار دەدۆزێتەوە، وە هەركاتێ جگە لە پەروەردگار داوای یارمەتی كردن لە كەسێكی تر بكات ئەگەر چی كەمیش بێت، ئەم وتە

ڕێنموونیکەرەی پەروەردگار بەبیر دێنێتەوە کە دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً﴾ سوورەتی فەجر ٢٧ — ٢٨.

واتە: بە ئیمانداری سەرفرازا لە سەرەمەرگدا دەوترێت ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی (ئەی ئادەمیزای ژیر و هۆشمەند کە لە تەمەنی کۆتایی دونیادا پەروەردگارت ناسی و بەجوانی دەتپەرست، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆ ڕازییە.

ئەو ئەم وتەی پەروەردگار بەردەوام بەسەر نەفسی خۆی دا دەخوێنێتەوە و هەست دەکات کە لە پەروەردگارەوە دەیبیستێ، وە ئەم باوەڕ و دڵنیاییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دڵ هەست بەوە بکات کە لە خزمەت پەروەردگاردایە و بە باروودۆخی بەندایەتی کردن خۆی لە پەروەردگاری نزیك دەکاتەوە و بەندایەتی کردن و پەیڕەوی کردن و گوێڕایەڵی کردنی پەروەردگار دەبێتە تایبەتمەندی و سروشتی ئەو لە ڕووی خۆشەویستی و مەیل و ئارەزووەوە نەك بە زۆر لێکردن و ناچار کردن ڕوو دەکاتە گوێڕایەڵی کردنی پەروەردگار، وەکو ئەویندارێکی سەر لێشێواو کە تەنیا هەم و خەمی ئەو بەدەست هێنان و وەدەستخستنی چاودێری و ڕەزامەندی خۆشەویستەکەیەتی، خاوەنی دڵی سەلامەت و تەندروستیش تەواو سەرقاڵییەکانی ئەو بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگارە لە ڕێگەی پەرستش و گوێڕایەڵی کردنییەوە.

هەرکاتێ ئەمر و نەهی پەروەردگاری وە بیر بخرێتەوە، لە دڵیدا جاڕی جاڕچیی دەبیستێ کە دەڵێ: پەروەردگارا. ! من بەندەیەکی کەم دەست و داواکارم و تۆش پەروەردگارێکی خاوەن گەورەیی و ڕێز و خۆشەویستی. ! ئەگەر پشوو درێژم نەکەیت، پشوو درێژی خۆم لەدەست دەدەم و ئەگەر هێز و توانام پێ نەبەخشی، خۆم لە هێزو توانا بەهرەمەند نابم. ! هیچ مەکۆ و سایە و پەنا و فریاد ڕەسێ جگە لە ڕووکردنە بارەگای گەورەی تۆ و داوای یارمەتی کردن لە تۆ ڕەوا و شیاوی گرفتەکانم نابێ، هیچ

کاتێ پشت ناکەمە دیوان و بارەگاکەت و لە دەروازە و دەرگاکەت هەراسان و وەڕز نابم.

ئەو بە تەواوی خۆی دەسپێرێ بە پەروەردگاری زانا و بینەر و بە توانا و پشتی پێ دەبەستێ، ئەگەر تووشی گرفت و ناڕەحەتی بوو ڕاستگۆیانە دەڵێ کە: پەروەردگارا.! ئەمە ڕەحمەت و میهرەبانییەکە کە بە منت بەخشیوە و دەرمان و چارەسەرێکە کە لە ڕووی دڵسۆزییەوە بۆ منی نەخۆش و دەردەدارت ڕەوا بینیوە و بە باشت زانیوە و وەکو چۆن کە شتێکی خۆش بوێ، لێی دوور دەخاتەوە، بەوپەڕی ڕازی بوونەوە دەڵێت: بەدڵنیاییەوە ئەو شتە بۆ من خراپ و زەرەردەر بووە و دەڵێ: پەروەردگارا.! (کەم نەبوون ئەو کارووبارانەی کە ویستوومە ئەنجامیان بدەم، بەڵام منت وا لێ کردووە کە دەستیان لێ هەڵگرم و لێیان دوور بکەومەوە و تۆ لە خۆم زیاتر بۆم بە میهرەبان و دڵسۆز تری).

بە هەر جۆرە خۆشی و شادومانییەك و یاخود کەسەر و پەژارە و نیگەرانی تووش بووبێ، ئەوی بە ڕێگەیەك بۆ گەیشتن و نزیك بوونەوە لە پەروەردگار و دەرگایەك بۆ گەیشتن بە دیوان و بارەگای پەروەردگاری زانیوە.

هەروەکو چۆن شاعیرێ دەڵێ:

| | |
|---|---|
| مــــامسنی قــدر بکره او رضی | الا اهدیــت بـــه الیك طریقاً |
| امض القضاء علی الرضا منی به | انی وجدتك فی البــلاء رفیقاً |

واتە: ((هیچ شتێکی چاك و خراپم بۆ پێش نەهاتووە، مەگەر ئەوە کەوا ئەوم کردۆتە ڕێگەیەك بۆ گەیشتن بە تو، قەزا و قەدەری تۆ ئەمەیە کە من پێی ڕازیبم، بە ڕاستی لە بەڵاو دەردەسەرییەکاندا تۆم کردووە بە هاوڕێی خۆم.))

خۆشی و بەختەوەری و کامەرانی بۆ خاوەنانی ئەو جۆرە دڵ و نادیار و خۆشیانەی کە تێیدا جێگیرن و خەزێنە و گەوهەرهایەك کە لە دڵیاندا کۆکراونەتەوە، چەندە پاکە

دیارەکانیان و چەندە جوانە نهێنییەکانیان بەتایبەتی کاتێ کە نهێنییەکانیان ئاشکرا دەبن. !

سوێند بە پەروەردگار، بەیداغێکی گەورە و ڕێنموونیکەرێکی وایان بۆ هەڵکراوە و بە تەواوی توانایانەوە بەرەو ڕووی دەڕۆن و لە ڕێگەیەکی ڕاستدا کە بۆیان دیاری کراوە هەنگاو هەڵدەگرن، وە جگە لە خوداوەند گەلێکی تر ئەوانیان بەرە و لای خۆیان بانگ کردووە، بەڵام گوێی خۆیانیان لێی کەڕ کردوە و ئیمان و گوێڕایەڵی کردن لە پەروەردگاریان لە هەموو شتێ و هەموو کەسێکی تر بە باشتر زانیوە.

## تەوەری دووەم: لەنێوبەرەکانی دڵ و هۆکارەکانی نەخۆشکەوتنی:

لەنێوبەرەکانی دڵ پێنج شتن:

١. زیادەڕۆیی لە تێکەڵاوی کردن لەگەڵ خەڵکی دا.

٢. هیوا و ئارەزووی دوور و درێژ.

٣.پەیوەندی و بەسراوەیی بە غەیری خواوە.

٤. هەڵە خەرجی و دەست بڵاوی لە خواردن و خواردەمەنی.

٥. زیادەڕەوی لە خەوتن و پشوودانەدا.

ئەم پێنج بنەمایە لە گرنگترینی لەناو بەرەکانن، ئێمە لەم تەوەرەدا دەست دەکەین بە باسکردنی ئەنجام و شوێنەما هاوبەش و تایبەتەکانی هەریەکێ لەوانە. دەبێ بزانین کەوا دڵ کاتێ ڕوو دەکاتە پەروەردگار و ڕۆژی دوایی و ڕێگەی حەق و شێوەی دروست دەدۆزێتەوە، شارەزای بەلا و ئازارەکانی نەفس و کار و درۆ جەردە دەبێ کە لە تیشکی، ژیان، هێز، سەلامەتی، ناسین و تەندروستی گوێ و چاو (لێرەدا مەبەستی چاوی ناخە) بەهرەمەند بێ، وە سەرقاڵییە درۆزن و دوا کەوتووەکان خەریك و خافڵاو نەکەن بە خۆیانەوە.

ئـەم پێـنج هۆكـاره تیـشك و ڕووناكی دڵ دەكوژێنێتـەوە و بینـابی و بینینـی لـەناو دەبەن و دەبێنه هۆی خـراپ بیستنی ئـەو. ئەگـەر بـە تـەواوی كـەر و حوێری نەكـەن تـەواوی تواناكـانی لاواز و تەندروسـتی و سەلامەتیـشی تووشـی شـڵەژاوی و تێكـچوون دەكات و ویست و ئیرادەشی به توندی كەم دەكاتەوە و تووشی پەرستنی بیر و بڕوای كۆن و ڕاوەستانی دەكات.

ئەگەر دڵی كەسێ هەست بەم بنەمایانه نەكات، ئـەوا بـە مانـای تـەواو دڵـی تووشـی مردن بووه، چونكه مرۆڤی مردوو هەست بـە زام و برینـەكانی جەسـتەی خـۆی ناكـات، ئەم هەست نەكردنـە بـە مردنـی دڵ لەمپـەر و ڕێگرییـەكی بنـچینەییه لـە سـەر ڕێگـەی گەشەكردنی ئادەمی و دەبێته ڕێگر له بەردەم ئەوەی كەوا نـاتوانێ هـەنگاو هـەڵبگرێ بۆ گەیشتن بەو ئامانجـەی كـە بـۆی درووسـت كـراوە، وە تـام و چێژ و بەختـەوەری و كامەرانی و دڵخۆشی خۆی له گەیشتن بەو ئامانجه بزانێ.

هـیچ بەخـشش و خۆشـی و شـادومانی و كامـەرانی و هـەنگاو هـەڵگرتن لـە ڕێگـەی گەشـەكردنێ، جگـە لـە ڕێگـەی ئاسـین و خۆشەویـستی پـەروەردگار و هێمنـی و ئاسوودەیی بـەهۆی یـاد كـردن و سـتایش كردنـی ئـەو و كـەیف خۆشـی و شـادومانی بەهۆی نزیكی ئـەو و ویـست و مـەیلی بینینـی شـیاو و ئاسـان نیـە و ئەمـە بەهەشـتی یەكەمی و سەرەتایی خاوەنانی دڵی ساغ و سەلامەته.

به هەمان شێوه كه تەنیا لەڕێگەی ئیمان و بەندایەتی و پەیڕەوكردنی ڕاسـتگۆیانەو پاكانەی پەروەردگارەوەیە كـە دەتـوانرێ بەخششە بـێ سـنوورو لـە ڕادەبـەدەرەكانی دواڕۆژ بەدەست بهێنن: واته بۆ خاوەنانی دڵی سـاغ و تەندروسـت دوو بەهەشـت هەیـە یەكێكیان له دونیاداو ئەوی تریشیان له دواڕۆژدا، ئەگەر له دونیادا خۆیانی لێ بێ بـەش بكەن و دوور بكەونەوە، له پاشەڕۆژ شدا لێی بێ بەش دەبن.

له شێخی ئیسلام احمد بن تیمیه (رحمه الله) بیستم كه دەیفەرموو: ((لەم دونیایـەدا بەهەشتێ هەیه كه ئەگەر كەسێ نەڕواته ناوی، ناڕواته ناو بەهەشتی دواڕۆژیش)).

یەكێ لە زانایان و خواناسان وتوویەتی: ((هەندێ جار دڵ، بارووددۆخ و خۆشی و شادومانی و كەیف خۆشییەكی وای هەیە، كە دەڵێم: پەروەردگار.! ئەگەر بەهەشتییەكانیش لەم جۆرە بارودۆخەدان، بە ڕاستی لە ژیانێكی پڕ لە بەخشش و بەختەوەری و كامەرانی بەهرەمەندن.))

یەكێ لە دۆستانی پەروەردگار وتوویەتی: (بێچارەیی بۆ دونیا پەرستانە كە بەبێ بەهرەمەند بوونیان لە چاكترین تام و چێژەكان لە دونیا دەردەچن.! پرسیار كرا: چاكترین تام و چێژو خۆشی دونیا كامەیە..؟

وتی: خۆشەویستی، ڕێز، هاودەمی و تامەزرۆیی بۆ دیداری پەروەردگار و ڕووكردنە ئەو و پشت كردن و ڕوو هەڵچەرخان بۆ غەیری خوا، بەخششێكە كە لەگەڵ هیچ تام و چێژو خۆشی و بەخششێكی تر شایانی بەراورد كردن و هەڵسەنگاندن نییە.))

هەركەسێ كە دڵێكی زیندوو و بە ئاگای هەبێت، بە سەلیقەی خۆی هەستی پێ دەكات و شایەتی لەسەر ساغی و تەندروستی دەدات. بەڵام ئەو پێنج ئامراز و هۆكارە ئەم ڕێگەیە بە ڕووی مرۆڤدا دادەخات، لە نێوان دڵ و ئەو خۆشیانەو بەخششانە بەربەست و دیوارێكی بەهێزو گەورە درووست دەكات و لەجووڵەی دەخات و ڕایدەوەستێنێ، نەخۆشی گەلێكی بۆ درووست دەكات، وە ئەگەر مرۆڤی نەخۆش و بە ئازار دڵی خۆی لەوانە چارەسەر نەكات، لەناوچوون و مردن لە چاوەڕوانی كردنیدایە.

## ( لەناوبەری یەكەم: زیادەڕۆیی لە تێكەڵاوی كردن لەگەڵ خەڵكی دا ):

نیشانە و شوێنهاتەكانی زیادەڕەوی لە پەیوەندی لەگەڵ خەڵكاندا بریتین لە: كەڵەكە بوونی دڵ لە بیستن و بینینی قسەو كارو كردەوەی ناپەسەندی خەڵكانی تر و ڕەش و ڕەق بوونی دڵ، كە دەبێتە هۆی پەرێشانی و پەرش و بڵاوی و سەرقاڵی و خەمو خەفەت و لاوازكردنی تواناكانی. وە بار و كۆڵێكی لە ڕادەبەدەر دەخرێتە سەر شانی و ناچار دەبێت زیاتر سەرقاڵی كێشەو گرفتەكانی دۆستان و هاوڕێیانی بێت و خێر و چاكە و بەرژەوەندی خۆی لەدەست بدات، وە بیرو ئەندێشەی ئەو لە دەشت و

دەری خواست و باوەڕەکانی ئەواندا پەرێشان و سەرلێشێواو بێت و بۆ ئەندێشەو کاری خۆی و بەدەست هێنانی هاودەمی و نزیکی پەروەردگارو بەدەست هێنانی توێشوو بۆ ڕۆژی دوایی تواناو کاتێکی ئەوەندەی بۆ نامێنێتەوە.!

لەلایەکی ترەوە تێکەڵی کردنی لە ڕادەبەدەر لەگەڵ خەڵکی دا چ بەخشش گەلێك نەبوونەتە هۆکار و چ بەخشش گەلێکی لەناو نەبردووە..؟!

بە ڕاستی هاوڕازی و هاودەمی زیاتر لە پێویست، مەینەت بارو لەناو بەری خۆشبەختی و کامەرانی و دوور خەرەوەی ئاسایش و ئاسوودەیی و ڕێگرە لە بەردەم هێمنی و ئارامیدا. مەگەر بەلای گیان و دەردو ئازار ڕسکاندن بۆ بەختەوەری مرۆڤ، جگە لە ڕێگەی کردەوە و قسە و هاودەمی زیاد لەپێویست لەگەڵ خەڵکی دا، شیاو و مومکینە.؟ مەگەر ئەوە هەر ئەو هاودەم و نزیکە ناساغ و نا تەندروستانە نەبوون کە تەنانەت لە ساتە وەختەکانی مردندا بوونە هۆکاری ئەوەی کە ئەبوو تالیب باوکی حەزرەتی عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) وشەیەك بێنێتە سەر زمانی، کە کامەرانی و خۆشبەختی هەتا هەتایی ئەو بگرێتە ئەستو چ زەرەرو زیانێ خراپتر لەمە؟!

ئەم هاودەمی و تێکەڵ بوونە کە زیاتر لە چوارچێوەی هاوڕێیەتی و برادەرایەتی دونیایی و دامەزراوی و دڵنیایی ڕاکێشانە نەفسییەکانی بەرامبەرە، کاتێ کە ڕاستییەکان دەردەکەون دەگۆڕێ بۆ دوژمنی و ناحەزی و دەبێتە هۆی پەشیمانی.

بە هەمان شێوە کە پەروەردگاری بەدەسەلات دەفەرمووێت: ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلا (٢٧) يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا (٢٨) لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي﴾ سوورەتی فورقان ٢٧ — ٢٩.

واتە: ڕۆژێك دێت ستەمکار قەپ دەکات بە هەردوو دەستی خۆیدا و گاز لە هەر دوو دەستی خۆی دەگرێت (لە پەشیمانی داو) دەڵێت: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێبازی ئیمانم بگرتایە، مەرگ بۆ خۆم، خۆزگە فلانە کەسم نەکردایەتە هاوەڵ و دۆستی خۆم

(چونکه سەری لێ شێواندم)، بە ڕاستی گومڕا و وێڵی کردم لە بەرنامەی خوا دوای ئەوەی کە پێم ڕاگەیەنرابوو. !

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الأَخِلاَّءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلاَّ الْمُتَّقِينَ﴾ سوورەتی الزخرف ٦٧.

واتە: دۆستان و برادەران هەر هەموو لەو ڕۆژەدا دوژمنی یەکترن، هەموو ڕقیان لە یەك دەبێتەوە، جگە لەو کەسانەی کە لەسەر بنچینەی تەقوا و خواناسین کۆبوونەتەوە و برایەتییان بەرپا کردووە.

حەزرەتی ئیبراهیم الخلیل بە گەلەکەی خۆی فەرموو: ﴿وَقَالَ إِنَّمَا اتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا مَوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُمْ بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُمْ بَعْضًا وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُمْ مِنْ نَاصِرِينَ﴾ سوورەتی العنکبوت ٢٥.

واتە: لەوەو دوا پێی وتن: بە ڕاستی ئەوەی ئێوە لە جیاتی خوا دەتانپەرست تەنها بت و پەیکەرن، لەبەر خاتری یەکتر و ڕێز دانانتان بۆ یەکتر لە ژیانی دونیادا، دواجار لەڕۆژی قیامەتدا یەکتر کافر دەکەن و یەخەی یەکتر دەگرن، هەندێکیشتان نەفرین لە هەندێکی ترتان دەکەن، سەر ئەنجامیش شوێن و جێگەی دیاری کراوتان ناو ئاگرە، ڕزگار کەریشتان نییە.

ئەمە حاڵ و وەزعی تەواوی ئەو کەسانەیە کە لەسەر بنچینەی ئامانجی ماددیی، دونیایی و ناشەرعی پێکەوە بوونەتە دۆست و برادەر. تا ئەو کاتەی کە مەبەست و ئامانجیان دابین بکرێ درێژە بە دۆستایەتی و هاوڕێیەتی خۆیان دەدەن و هەر کاتێ ئەو ئامانجە پچڕا و نەما، پەشیمانی و ئازار و خەمی بەدواوەیە و ئەو دۆستایەتییە دەگۆڕدرێ بۆ دوژمنی و ناحەزی.

هەردوولا دەست دەکەن بە جنێو و قسەی خراپ بە یەکتر گوتن و ئەو ئامانج و مەبەستە دەگۆڕدرێ بۆ خەم و نیگەرانی و خەفەت. ئەمە شتێکە کە لەم دونیایەدا و لەنێو دۆستان و برادەرانێ کە لەسەر بناغەی ناپەسەند و نا بەردەوام لەگەڵ یەکتردا

بوونەتە دۆست و هاودەم، هەستی پێ دەکرێ و دەبینرێ. هەرکاتێ ئەو دووانە (دوو هاوڕێیە) سەرزەنشت و سەرکۆنە بکرێن، هەردووکیان لەسەر ناحەق بوون و دۆستی و برادەرایەتی ئەوان لەسەر پایەیەکی پووڵاش و تووڵاش جێگیرە و سروشتییە کە هاودەمی دۆستایەتییەکی وەها بێ ڕەگ و ڕیشە دەگۆڕدرێ بۆ دوژمن و ناحەزییەکی ڕەگ و ڕیشە دار. !

یاساو بنچینەی هاودەمی ئارەزوو کراو و سوودمەند ئەمەیە کە لە پەیوەندی لەگەڵ کاروباری خێرو چاکە وەکو بەشداری کردن لەنوێژی هەینی و بەکۆمەڵ و جەژنەکان، حەج کردنی ماڵی خوا، بەدەست هێنانی زانست و زانیاری، تێکۆشان و ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە لەگەڵ ئەهلی ئیمان و خواناساندا هاوڕێ بین. بەڵام سەبارەت بە کاروباری شەڕو خراپە و ناڕەوا و مەسەلە حەڵاڵ و نا پێویستەکان پێویستە لە هاودەمی و برادەرایەتی کردن لەگەڵیاندا دوورە پەرێزی بکەین و دوور بکەوینەوە. !

ئەگەر ناچاری وەهای بویستایە کە لەکاری ناپەسەندا لەگەڵیاندا ببینە هاوڕێ و هیچ ڕێگەیەك بۆ هاوڕێیەتی نەکردن و دوور کەوتنەوە لێیان نەبوو دەبێ بە ویست و ئارەزوویەکی تەواو لە ڕازی بوون و شەریکایەتی لەگەڵیاندا دوور بکەوینەوە و ئازارو ئەزییەت و توانج و سەرکۆنەکردنی ئەوان بە گیان بکڕین. (مەبەست ئەوەیە کەوا بۆ کار و کردەوەی خراپ هاوڕێیەتی و برادەرایەتیان نەکەین و شوێنیان نەکەوین و ئەگەر ئازارو ئەزییەت و توانجیشیان لێ داین بە بۆنەی هاودەمی و برادەرایەتی نەکردن لەگەڵیاندا، ئەوا وەری بگرین ئەگەر چی لەسەر دڵیشمان قورس بێت، وەرگێڕی کورد). ئەگەر ئەو لە هێز و توانای خۆی و یارمەتی دانی خەڵکی بێ بەش بێت، ئەوان خۆ بە خۆ دەیخەینە بەر ئەزییەت و ئازارەوە، بەڵام ئەزییەت و ئازارێکە کە سەربەرزی، خۆشەویستی، ڕێز و پێ هەڵگوتنی پەروەردگاری هەموو جیهانیان و باوەڕدارانی لە خوا ترسی بەدواوەیە. بەڵام ڕازی بوون و شەریکایەتی کردن لەگەڵ ئەهلی ناحەق و ناڕەوا، سەرشۆڕی و داماوی، توانج و سەرکۆنە و نەفرینی پەروەردگاری هەموو

جیهانیان و باوەڕداران و پیاوچاکانی بەدواوەیە. خۆڕاگری لەسەر ئەزییەت و ئازاری ئەهلی ناحەق و ناڕەوا، چاکتر و باشتر و داهاتوودارترە.

بەڵام ئەگەر سەبارەت بە کاروبارێکی ڕەوا و حەڵاڵ و نا پێویست، مرۆڤ ناچار بوو کە لەگەڵ ئەهلی ناحەق و ناڕەوا هاودەمی و هاوڕێیەتی بکات، هەوڵ بدات و تێ بکۆشێ کە ئەو کۆبوونەوە و هاوڕێیەتییە تا ئەو شوێنەی کە دەتوانێ بگۆڕێ بۆ کۆبوونەوەیەکی ئامۆژگاری و گوێڕایەڵی کردن لە پەروەردگار و هێز و وزە ببەخشێتە خۆی و هەوڵ بدات و باوەڕ بە خۆبوونی خۆی بە هێز و بە توانا بکات. وە گوێ نەداتە وەسوەسە و دڵە ڕاوکێکانی شەیتان کە گوایە ئەم کارەی تۆ کە دەیکەیت بۆ خۆ دەرخستن و خستنە ڕووی زانستی خۆت و فروفێڵ و ڕووبازییە..! لەگەڵی دا ڕووبەڕوو بێتەوەو داوای یارمەتی و هاوکاری لە پەروەرودگار بکات و بەپێی توانا هاودەمی و هاوڕێیەتی خۆی لەگەڵ ئەوانەدا بە ئاراستەی خێر و چاکە هان بدات.

ئەگەر ئەم بەلایەوە ئاسان نەبوو وەکو دەرهێنان و ڕاکێشانی تاڵە موویەك لەناو هەویردا، دڵی خۆی لەنێوانیاندا دەربهێنێ. (مەبەست ئەوەیە کەوا لەناویاندا تەنیا بە جەستە بوونی هەبێ و ڕۆح و گیانی لەوێ ئامادە نەبێ و سەفەر بۆ جێگایەکی تر بکات، وەرگێڕی کورد)، لەنێوانیاندا وەکو ئامادەبوویەکی نادیار، نزیکێکی دوور و خەوتوویەکی بە ئاگا، بێت کە لەکاتی سەرنجدان و گوێ گرتندا، ئەوان نەبینێ و قسەکانیان نەبیسێ.! چونکە بینین و بیستن کاری دڵە و ئەو دڵی لەنێوان ئەواندە هەڵکەندووە و ئەوی بەرز کردووەتەوە بۆ ئاسمانەکان و هاوڕێ لەگەڵ ڕۆحە پاك و بەرزەکاندا لەدەوری عەرشی پەروەردگاردا خەریك و سەرقاڵی تەسبیحات و یادکردنە.

ئەم کارە لەسەر نەفسی مرۆڤ زۆر قورس و گرانە، بەڵام بۆ کەسانێ کە هاوکاری و یارمەتی دانی پەروەردگار هاوڕێیان بێت، ئاسان دەبێت. تەنیا ئەمە بەسە کە پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خوادا پەیوەندییەکی زانایانە و ڕاستگۆیانە بێت و هەمیشە

هاوار بۆ لای پەروەردگار ببات وسەری خۆی بێهێزانە و داماوانە لە دیوان و بارەگای گەورەیی پەروەردگاردا لەسەر زەوی دابنێ و کڕنووش ببات.

ئەمە تەنیا خۆشەویستی پاك و یادکردنی دڵ، زمان و دوورکەوتنەوە لە بابەتە لەناو بەرە چوار لایەنەکانی ترە کە ماونەتەوە، کە دەتوانن هێز و وزە بە مرۆڤ بدەن و لەم ڕێگەیەدا هاوڕێیەتی بکەن، بە پاڕانەوە و تۆبەکردنی پاك و توانا بەخش لەلایەن پەروەردگارەوەو ویست و ئارەزووی ڕاستگۆیانە و دەرباز بوون لە گیرۆدەبوونی پاوەنو داوەکانی غەیرە پەروەردگارییە کە دەتوانین بەو ئامانجە گەورە بگەین.

ئەوەی کە لەسەر مرۆڤە، هاوڕێیەتی و شەریکایەتی کردنە لەگەڵ خەڵکانی تردا بە ئەندازە و ڕێژەی پێویست، بەڵام دەبێ ئەم ڕاستییە بزانین کە سەبارەت بەپێکەوە ژیان و دۆستایەتی، بەسەر چوار دەستە و تاقمدا دابەش دەبێ، وە هەرکاتێ تاقمێ لەگەڵ تاقمێکی تردا تێکەڵ بکەین و هەڵە بکەین تووشی شەڕ و خراپە و زەرەرو زیان دەبین.

**دەستەی یەکەم:** کەسانێکن کە هاودەمی و پێکەوە ژیان لەگەڵیاندا وەکو خواردن پێویستە و بەدرێژایی شەو و ڕۆژ ناتوانرێ لێیان بێ نیاز بین. هەرکاتێ پێویستی خۆی لێ وەرگرتن لە هاوڕێیەتیان دوور دەکەوێتەوە، دواتر هەرکاتێ پێویست بوو جارێکی تر لەگەڵیاندا دادەنیشێ و بەردەوام ئەم کارە دووبارە دەکاتەوە.

نرخ و بایەخی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ ئەم تاقم و دەستەیەدا لە زێڕ بە نرخترە، ئەوانە زانایانێکن کە لە بڕیارەکانی پەروەردگار و نەخۆشییەکانی دڵ بە ئاگاو شارەزان، ئامۆژگاریی کەرانێکی دڵسۆز و میهرەبانن، کە لە ڕێگەی پەرتووکی پەروەردگارەوە و بەشێوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن. هاودەمی و هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەم گرووپ و دەستەیەدا هەمووی خێر و چاکەیە.

**دەستەی دووەم:** ئەوانەن کە هەڵس و کەوت و هاوڕێیەتی لەگەڵیاندا وەکو دەوا و دەرمانێ وایە کە لەکاتی نەخۆشیدا پێویستمان پێی دەبێت. تائەو کاتەی کە سەلامەتو تەندروستین پێویستمان پێیان نیە، بەڵام کەسانێ هەن کە بە مەبەستی دابینکردنی بەرژەوەندی و پێویستییەکانی ژیان و ڕۆژی دوایی و بەجێهێنانی بەرپرسیارییەتی و ئەنجامدانی جۆرەها سەوداگەری و بەشداری کردن و ڕاوێژ و تەگبیر کردن و چارەسەری نەخۆشی لەوان ناتوانرێ هەست بە بێ نیاز بکرێ. (واتە بۆ ئەنجام دانی ئەو کارانە پێویستمان بەو جۆرە گرووپ و دەستەیە هەیە، وەرگێڕی کورد).

بەڵام هەرکاتێ لەڕێگەیانەوە پێویستییەکەی خۆمانمان بەجێ هێنا، هەڵس و کەوتو هاوڕێیەتی لەگەڵیاندا وەکو هاوڕێیەتی و هاودەمی کردنە لەگەڵ دەستەو تاقمی سێ یەمدا.

**دەستەی سێیەم:** کەسانێکن کە هەڵس و کەوت و هاودەمی کردن لەگەڵیاندا — وێڕای جیاوازی پلەو پایە و جۆری تواناو لاوازیان — وەکو تووش بوونە بە دەردو نەخۆشی. هاودەمی و هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ هەندێ لەوانەدا وەکو تووش بوونە بە نەخۆشییە سەخت و زیانبەخشەکان. ئەوانە کەسانێکن کە هاوڕێیەتی و هەڵس و کەوت کردن لەگەڵیاندا سوود و قازانجی ماددیی، مەعنەوی، ئایینی و دونیایی تووشی مرۆڤ نابێت. لە هەمان کاتدا هەڵس و کەوت کردن لەگەڵیاندا بە دڵنیاییەوە دەبێتە هۆی لەناو چوون و زەرەر و زیانی ئایینی و دونیایی یا یەکێ لەو دووانە. هاودەمی و هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەم تاقم و گرووپەدا ئەگەر بەهێز و پایەدار و هەمیشەیی بێت بەشێوەی نەخۆشییەکی مرێنەر و لەناوبەری لێ دێت. هەڵس و کەوت و هاوڕازی لەگەڵ هەندێکی تریاندا وەکو ئازاری(ئێش و ئازار) ددان وایە، کە تەنیا بە دەرهێنانی ددانەکەیە کە ئەو ئێش و ئازارە نامێنێ.

دانیشتن و هاودەم بوون لەگەڵ هەندێکی تریاندا دەبێتە هۆی تایەکی بە ئاریشە و مەعنەوی، ئەوانە مرۆڤ گەلێکی وشک و مێشک سووک و بێ خەیاڵن، کە توانای

هەڵسەنگاندنی قسەیان نییە، تاوەکو کەڵك و قازانجێکت پێ بگەیەنن، وە لە هونەری بیستن بێ بەشن، تاوەکو سوود و کەڵك لە قسەکانت وەربگرێت. کەسانێکن کە خۆیان ناناسن تاوەکو خۆیان لە شوێن و جێگەیەکی گونجاودا جێگیر بکەن. ئەگەر قسەیەك بکەن قسەکانیان وەکو ئەوە وایە لووتەك و چەکوش بدا بەسەر ئامادە بووانـدا و لە هەمان کاتدا خۆیشی کەیفی بە قسەکەی خۆی دێت و پێی شادومان و خۆشحاڵ دەبێت. لەوە دەڵێن کە لە دڵە ڕەش و ڕەقەکەیاندا جێگیرە، وە بەلای خۆیەوە وادەزانێ بۆنی خۆش و گوڵ بەسەر گوێگران و ئاخێوەراندا دابەش دەکات.! وە کاتێکیش کە بێدەنگ دادەنیشن و قسە ناکەن وەکو بەردێکی ئاسیاوانی قورس وایە کە گواستنەوەی بۆ ئامادەبووان ناشیاو و لە تواناییاندا نییە.

لە ئیمامی شافعییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ((هەرکاتێ کەسێکی وشك و کەللە ڕەق لە تەنیشتما دادەنیشێ، هەست دەکەم کە ئەو لایەم کە ئەو کەسە لێی دانیشتووە قورسترە لەو لایەکەی ترم.!))

((ڕۆژێك کابرایەکی لەم جۆرەم لەپاڵ مامۆستای گەورە و بەڕێزمدا – إبن تیمیە – (خوای لێ ڕازی بێت) بینی، مامۆستاکەم بە هەر ناڕەحەتی و نەهامەتییەك بوو بوونی ئەوی قبووڵ کرد، تا ڕووی کردە من و فەرمووی: دانیشتن و هاودەمی لەگەڵ مرۆڤ گەلێکی کەللە ڕەق و وشکدا مایەی ئەزییەت و ئازاری ڕۆحە.

ئەو لەدرێژەی قسەکانی دا فەرمووی: بەڵام بەداخەوە لەم جۆرە کەسانەمان زۆرە و بینیومانن و لەبەر ئەوەیە کە ڕۆحی ئێمە بەرانبەر بە ئەزییەت و ئازاری ئەوان خۆڕاگرو لەسەر خۆیە.))

بەگشتی هاودەمی و هەڵس و کەوت لەگەڵ کەسانێ کە دڵیان ڕەق بووە مایەی تا و ئەزییەت و ئازاری ڕۆحە، بەڵام تایەکی ڕووخساری و هەندێ جاریش هەمیشەیی و بەردەوامی. یەکێ لەو بەڵایانەی کە لەوانەیە بۆ مرۆڤ پێش بێت. ئەمەیە تووشی ببێت بە تووشی هەڵس و کەوت و هاودەمی ئەو جۆرە کەسانە و چارەیەکی جگە لە

تێکەڵاوبوون لەگەڵیاندا بوونی نەبێ واتە تەنیا ڕێگە چارە ئەوەیە کە لەگەڵیاندا دا تێکەڵ ببێ و هەڵس و کەوت بکات. لەسەر ئەم کەسە وا پێویست دەکات کە بە جۆرێکی شیاو لەگەڵیاندا هەڵس و کەوت بکات و دابنیشێ و تا کاتێ کە فەرحانە و خۆشییەك دێتە پێش و لەدەستی ڕزگاری دەبێت. ڕێگەو ڕێبازی خۆڕاگری و پشوو درێژی بگرنە بەر.

**دەستەی چوارەم:** خەڵکانێکن کە هەڵس و کەوت و دانیشتن لەگەڵیاندا وەکو ژەهرێکی کوشندە وایە، وە ئەگەر بەکارهێنەرەکەی لەسەرەتای کاتدا و بەخێرایی بە دەرمانی دژە ژەهری گونجاو چارەسەری نەکات، مردن و لەناو چوون یەخەی دەگرێ و لەناوی دەبات.

ژمارەی ئەو جۆرە کەسانە — بەداخەوە — کەم نین، ئەوانە خەڵکانێکن ئەهلی بەدیهێنان (البدعة)و گومڕایی کردنن کە لە شەریعەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دوورکەوتوونەتەوە و خەڵکانی تر بەپێچەوانەی ئەوە فێر دەکەن و بانگیان دەکەن، شەریعەتیان بە تازەگەری (بدعة)و تازەگەرییان بە شەریعەت و ڕەوا بە ناڕەوا و ناڕەوا بە ڕەوا دەزانن.

ئەگەر سەبارەت بە تاك و تەنیایی پەرستنی پەروەردگار قسەیان لەگەڵ بکەی، دەڵێن: پلەو پایەو جێ و شوێنی پیاوچاکان و خواناسانتان بە کەم زانیوە.؟!

هەروەها ئەگەر لە گرنگی شوێنکەوتن لە شەریعەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بلێی، دەڵێن: ئەم قسانەی ئێوە سووکایەتی کردنە بە پلە و پایەی نێردراوان و پێشەوایان.

وەکو چۆن پەروەردگار بەو شێوە کە خۆی وەسفی خۆی کردووە و نێردراوەکەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئەوی پێناسە کردووە و پیایا هەڵداوە، بەبێ زیادەڕەوی و لەسنوور دەرچوونێ باسی بکەیت، دەڵێن تۆ شوێنکەوتەی بیرو باوەڕی ئەهلی چواندنی..؟!

ئەگەر بەو شەریعەتەی کە پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) بڕیاریان لەسەر داوە و داوایان کردووە، داوا بکەیت و دەستوور بدەی و لە ناڕەوایەك کە پەروەردگارو پێغەمبەر نەهی و دووریان لێ کردووە، نەهی بکەیت، دەڵێن: تۆ خەریکی لەنێوان موسڵماناندا جیابوونەوە و ئاشووب (فتنە و تفرقە) بەرپا دەکەیت.؟!

ئەگەر شوێنکەوتەی شەریعەت بی، وە لەگەڵ ئەوانەدا کە دژی شەریعەتن، داژەیەتی بکەیت، دەڵێن: تۆ ئەهلی بەدیهێنانی (البدعة)و خەریکە خەڵکی سەرگەردانو سەرلێشێواو دەکەیت..؟!

ئەگەر لەگەڵ پەروەردگاردا تەنیایی (خەڵوەت) بکەیت، وە لەگەڵ دونیا نەویستیدا بە تەنیا جێی بهێڵی، دەڵێن: بێچارە هەڵخەڵەتێنراوە و سەر لێشێواو بووە..؟! بەڵام بە تەواوی توان و ویست و ئیرادەیەکی پایەدار دەبێ لەبەر خاتری ڕەزامەندی پەروەردگار، تووڕەییان قبووڵ بکەیت و نابێ بە توانج و سەرکۆنە و هەڕەشەکردنی ئەوانەوە خۆت سەرقاڵ بکەیت و نابێ بایەخ بە شەڕانگێزی و پاشەملەی ئەوان بدەیت، چونکە ئەم جۆرە شێوازە شێوازێکی کەماڵ و ورە بەرزییە. هەروەکو چۆن شاعیرێ وتوویەتی:

**واذا اتتك مذمتي من ناقص　　　　فهي الشهادة لي بأني فاضل**

واتە: (هەرکاتێ مرۆڤێکی لاواز و نەزان لەلای تۆ لە پاشەملە باسی منی کرد، ئەمە شایەتی دانێکە بە قازانجی من، کە بە ڕاستی ئەهلی چاکە و بەخشینم).

## لەناوبەری دووەم: ئارەزووە دوور و درێژەکان:

هۆکاری دووەمی لەناوبەری دڵ، سواربوونییەتی بەسەر شەپۆلەکانی دەریای ئارەزووە دوور و درێژەکانی، دەریایەك کە هیچ جۆرە ڕۆخ و کەنارێکی نییە و تەواوی داماو و هەژار و کەساسەکانی جیهان کاریان سوار بوونە بەسەر شەپۆلەکاندا.

دەڵێن: ئارەزووە دوور و درێژەکان تەنیا دەسکەوت و دەست هاتی مرۆڤ گەلی هەژارو داماو و کەساسن و کاڵاو سەروەت و سامانی سواربووەکانی سەر بەلەمی

تێكشكاوی بەڵێنەكانی شەیتانن، وەك بیر و ئەندێشەی نەگونجاو سەرلێشێواوەكانە بەدوای كوێرەئاو و تراویلكەوە (سراب).

شەپۆلەكانی ئارەزووە درۆیینە و ئەندێشە كاڵ و نەگەیشتووەكان، هەمیشە سوار بووەكانی خۆیان – وەكو یاری كردنی سەگەكان لەگەڵ جەستەی ئاژەڵە مردارە بووەكاندا – بە گاڵتەو فشەی دەزانن.

هیوا و ئارەزووە كاڵ و ناتەواوەكان شتوومەك و دەسمایە و سەرمایەی مرۆڤە كاڵو پێ نەگەیشتوو و ناپیاوە و بێ ویستەكانە، كە لە تۆزقاڵێ ویست و ئیرادە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لە گەڵ ڕاستییەكانی ژیاندا بەهرەمەند نین.

بەڵكو بەهۆی ئەندێشە و ئارەزووە زەینییەكانەوە، هەر یەكێكیان بە جۆرێ لە ڕاستی تووشی بێ ئاگایی بوون و هەندێكی تر لە ئارەزووی گەیشتن بە هێز و توانا و پاشایەتی، ئەوی تر بەهیوای گەیشتن و بەدەست هێنانی سەروەت و سامان، وە كامەران خوازی لەپیاوان و یاخود ژنان، بۆ ڕۆیشتن بۆ گەشت و گوزار لە شوێنە سەوز و خۆشەكانی جیهان، شەو و ڕۆژ لەوێ بكەنەوە.

ویستراو و خۆشەویستی خۆیان لە زەین و هۆشدا بەرجەستە دەكەن، یاخود لە خەودا دەیبینن و وەك بڵێی پێی گەیشتوون و كامەرانی لێ دەخوازن، بەڵام كاتێ كە هۆشیار و بە ئاگا و بەخۆدا دێنەوە، دەبینن كە ئەوانە و هەمان بەرەو ڕاخەرن و هیچی تر.

بەڵام خاوەنانی ویستی گەورە و بەرز و خواست و ئیرادەی پۆڵاین ئارەزووەكانیان بە دەور (زانست و ئیمان)و كار و كۆشش و تەقەللا دەسووڕێتەوە، كاروبارێ كە دەبنە هۆی ڕەزامەندی و خۆشحاڵی پەروەردگار و نزیكی دەخاتەوە بۆ دیوان و بارەگای گەورەی پەروەردگار. هیوا و ئارەزووی ئەمانە هەمووی ئیمان و تیشك و كارزانییە و ئارەزووەكانیان شتێ نین جگە لە خۆ فریو دان و كەساسی و كلۆڵی نەبێ.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەسانێ کە ئارەزووی خێر و چاکە دەکەن و هاوڕێ لەگەڵ ئەوەشدا لە کار و کۆشش و هەوڵدان بێ ئاگانین، ستایش کردوون و هەندێ جاریش پاداشتی ئەوان وەکو ئەجر و پاداشتی ئەنجامدەری ئەو ژمێردراوە و حیسابی بۆ کراوە. وەکو کەسێ کە دەڵێ: خۆزگە منیش وەکو فلأن کەس خاوەنی سەروەت و سامان دەبووم کە خۆ پارێزی (تەقوا) پەروەردگار ڕەچاو دەکات و پەیوەندی خزمایەتی (صلة الرحم) بەجێ دەهێنێ و ماف و زەکاتی سەروەت وسامانەکەی دەدات. ! دەفەرمووێ: ئەجر و پاداشتی ئەو دووکەسە وەك یەك وایە. !

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە وتاری ماڵئاوایی دا (حجه الوداع) ئارەزووی فەرموو کە خۆزگە کەڵکی وەردەگرت (تمتع)و جلی ئیحرامی دادەکەند و لای دەبرد لەبەر خۆیاو قوربانی (ئاژەڵ سەربڕین) دەکرد – چونکە ئەو بە شێوەی قورئان حەجی (سەفەری ماڵی خوا) خۆی ئەنجام دابوو. لەبەر ئەوە پەروەردگار پاداشتی حەجەکەی کە بە شێوەی (قورئان) ئەنجام دابوو هەروەها پاداشتی کەڵك وەرگرتن (تمتع) کە ئارەزوەی دەکرد پێی بەخشی، وە هەردوو پاداشتی پێ بەخشی و بەهرەمەندی کرد.. !

## لەناوبەری سێیەم: خۆشەویستی بۆ غەیری پەروەردگار:

سێیەمین خراپە و لەناوبەر لەوانەی کە دڵی مرۆڤ خراپ و گەندەڵ دەکەن، پەیوەندی و وابەستە بوونە بە غەیری خوا، کە بە خراپترین ئامراز و هۆکاری خراپکردنی دڵ لە قەڵەم دەدرێ.

هیچ شتێ لە پەیوەندی و ئاوێزان بوون بە غەیری خواوە بۆ مرۆڤ زەرەرمەندتر و زیان بەخش تر نییە، چونکە پەیوەندی تاکە کەس بە بەرژەوەندی و سوود و قازانجی ئایینی و سەربەرزی و بەختەوەری دواڕۆژ دەپچڕێنێ.

پەیوەندی و هەڵاوەسران بە غەیری پەروەردگارەوە، مرۆڤ لە ئامانج و مەبەستی سەرەکی خۆی کە تاکییەتییە لە بەندایەتی کردنداو داوای یارمەتی کردنە لە

پەروەردگار، دوور دەخاتەوە، چونکە ئەو بەم لادانە و دوور کەوتنەوەی لە ڕێگەی ڕاست (الصراط المستقیم) نە توانیوییەتی بەش و پشکی خۆی لە بەخششی بەندایەتی کردنی پەروەردگار بەدەست بهێنێ و نە بە هیوا و ئومێد و ئارەزووەکانی خۆی لە پەیوەندی بە غەیری خواوە وەدەست خستووە.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا (٨١) كَلَّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾ سوورەتی مەریەم ٨١ — ٨٢.

واتە: ئەو بێ باوەڕانە لە جیاتی خوا جۆرەها شتی تریان کردوّتە خوای خۆیان تا پایەداری و دەسەڵاتیان (بە خەیاڵی خۆیان) دەست بکەوێت، نەخێر وانییە، (خەیاڵیان خاوە)، ئەو شتانەی ئەوان دەیپەرستن، (لە ڕۆژی قیامەتدا) باوەڕیان بە پەرستنی ئەوان نییە و ناڕەزایی دەردەبڕن، (بەڵکو بە سەختی) دژایەتیان دەکەن و بەرپەرچیان دەدەنەوە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لَعَلَّهُمْ يُنْصَرُونَ (٧٤) لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُنْدٌ مُحْضَرُونَ﴾ سوورەتی یس ٧٤ — ٧٥.

واتە: سەرەڕای ئەم هەموو ناز و نیعمەتە ئاشکرایە، نەفامەکان: لەجیاتی خواپەرستی، بت و شتی تر دەپەرستن و بۆ ئەوەی لە تەنگانەدا کۆمەکی بکرێن و سەربخرێن.! بەڵام ناتوانن سەریان بخەن بەڵکو هەر ئەمانە بوونەتە سەرباز و پاسەوان بۆ بتەکان و هەمیشە لە خزمەتیاندا ئامادەکراون.

کڵۆڵ و کەساسترین و زیانبارترین مرۆڤەکان کەسانێکن کە بە غەیری پەروەردگارەوە خۆشەویستی و پەیوەندی پەیدا دەکەن، چونکە بەختەوەری و سەربەرزی و شکۆمەندی و بەرژەوەندی و ڕزگار بوونێ کە بە هۆی ئەوەوە لە دەستی دەدەن، بە هیچ جۆرێ لە گەڵ ئەوەی کە بەدەستیان هێناوە شایانی بەراورد کردن و هەڵسەنگاندن نییە.! وە ئەوانە لە دۆخی تیاچوون و لەناو چووندان. کەسێ کە پەیوەندی بە غەیری خواوەوە هەیە و دڵی پێی خۆشە، وەک ئەو کەسە وایە کە لە تاو

گەرمای زۆری هەتاو پەنا بەرێتە بەر سێبەری خانە و لانەی جاڵجاڵۆکە. ! کە خاوتر و بێ هێزتر لەو ماڵە دەست نەکەوێت.

بەگشتی دەبێ بزانین کە بناغە و بنچینەی هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا (شرك)، پەیوەندی و خۆشەویستییە بۆ غەیری پەروەردگار و ئەم جۆرە شایانی توانج و سەرکۆنە و کەساسی و کلۆڵیە.

بە هەمان شێوە کە پەروەردگاری مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَتُلْقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومًا مَدْحُورًا﴾ سوورەتی ئەسرا ٣٩.

واتە: نەکەیت خوایەکی تر بە هاوتای خوای باڵادەست بزانیت، چونکە ئەگەر وابیت، فڕێ دەدرێیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە بە سەرزەنشت کراوی و ڕیسوایی و شەرمەزاری و دوور خراوەی لە بەزەیی خوا.

لۆمە کراوێ کە هیچ کەسێ ستایشی ناکات و زەلیل و کەساسێ کە هیچ کەس هاوکاری و هاریکاری ناکات. ! چونکە هەندێ مرۆڤەکان هەن کە لە کاتی سووکایەتی کردن پێیان خۆشەویست و گەورەن، وەکو ئەوانەی کە بەبێ هۆ و بە ناحەق دەکەونە بەر تەشهیر و بچووك کردنەوە و لۆمەکردنەوە، وە هەندێ جاریش کەسانێ هەن کە لە کاتی لۆمەکردن و خراپە گوتن و پاشملە باس کردنیان لەلایەن خەڵکییەوە جێی پشتیوانی کردنن و بەبێ هۆ و بە ناڕەوا کەوتوونەتە بەر لۆمە و سەرزەنشت کردنەوە.

لەلایەکی ترەوە کەسانێ هەن هەم دەکەونە بەر ستایش کردن و پیا هەڵگوتن و هەمیش پشتیوانیان لێ دەکرێ، وەکو کەسانێ کە بە حەق و مافی خۆیان هەوسار و لغاوی دەسەڵات و حوکمەتیان بەدەست هێناوە.

بەڵام بەش و پشکی کەسێکی هاوەڵ بڕیاردەر (موشریك) کە بە غەیری خواوە پەیوەندی وابەستەیی پەیدا کردووە، لە نێوان ئەو چوار جۆرەدا، خراپترین و بێ بایەخترین پشکە، چونکە نە ستایش کراوە و نە یارمەتی دراوە و نە پشتگیری کراوە.

## لەناوبەری چوارەم: زیادەڕەوی و دەست بڵاوی لە خواردن و خۆراكدا:

خراپی و لەناوبردنی ئەو، دوو جۆرە:

جۆرێكیان بەهۆی خراپی و گەندەڵی چاو و دەروونی ئەوە وەكو: قەدەغراوەكان، كە ئەمەش خۆی دابەش دەبێ بەسەر دوو جۆردا:

١. ئەو قەدەغەكراوانەی كە بەشێكن لەمافی پەروەردگار وەكو: مردارەوە بوو، خوێن، گۆشتی بەراز، ئاژەلانێكی دڕەندە كە خاوەنی كەڵپەن وەك (سەگ، شێر،و...هتد. وەرگێڕی كوردی) وەك ئەو پەلەوەرانەی كە خاوەنی پەنجە و چەپۆڵەی نێچیر و ڕاون.

٢. قەدەغەكراوانێ كە بەشێكن لەمافی خەڵكی، وەكو: كەل و پەل و شمەكی دزراوو دەستبەسەردا گیراو و ئەوەی كە بەبێ ڕەزامەندی خاوەنەكەی لە ڕێگەی زۆر یاخود زەوتكردنی نامووس و بەهۆی بەرگری كردن لە لۆمەو توانجی خەڵكی داگیر كرابێ.

جۆری دووەم ئەو كاروبارانەن كە زیادەڕەوی و تێپەڕین لەسنووری شەرعی دەبێتە هۆی لەناو بردن و خراپ كردنیان، وەكو: زیادەڕەوی لەكاری ڕەوا و ڕێگە پێدراودا (حلاڵ)، زیادەڕەوی لە خواردن و خۆراك.! چونكە زۆر خواردن مرۆڤ لە پەرستش سست و كەم تەرخەم دەكات، وە دڵ سەرقاڵی دەكات بەكاروباری خواردن و خۆراك و تێركردنی زگ لە ڕادەبەدەر، وە بەردەوام بەدوای بەدەست هێنانی خواردنە بە تام و جۆرا و جۆرەكانەوەیە، وە هەركاتێ گەیشتە ئامانج و مەبەستی خۆی، تەواوی هەم و خەمی ئەو لەلایەكەوە تام و چێژ وەرگرتن و لەلایەكی ترەوە نیگەرانییەتی لە زەرەر و زیانەكانی ئەو وە لەلایەكی تریشەوە وزە و هێزی هەوا و هەوەسی ئاژەڵی زاڵ دەبێ بەسەریداو ڕێگەكانی چوونە ناوەوەی شەیتان هەموار دەكات. چونكە شەیتانیش هەروەكو خوێن دەتوانێ بچێتە ناو ڕەگ و خوێنبەرەكانی مرۆڤەوە.

ڕۆژوو ڕێگەکانی چوونە ژوورەوەی شەیتان دەبەستێ و دایاندەخات، بەڵام زۆر خواردن و زگ پڕ کردن ڕێگە چوونە ناوەوەی ئەو ئازادو هەموار دەکات، هەرکەسێ خواردنی زۆر بخوات بە خواردنەوە و خەوتنیش زیاتر پێویستی هەیە و لە ئەنجام و ئاکامیشدا خێر و بەرژەوەندی و قازانج گەلێکی زۆر لە دەست دەدات.

لە فەرموودەیەکی دیار و بەناو بانگدا هاتووە کە: (**ما ملا ابن آدميٌ وعاءً شراً من بطنه، بحسب ابن آدم لقيمات يقمن صلبه، فإن كان لا بد فاعلاً فثلث لطعامه وثلث لشرابه وثلث لنفسه**).[٧]

واتە: هیچ شتێ خراپتر لەوە نییە کە مرۆڤ زگی خۆی بە خواردن تێر و پڕ بکات، چەند پارووەیەك کە توانای ئەو بپارێزێ بەسە، ئەگەر خواردنی زیاتری پێویست بوو یەك لەسەر سێی بە خواردن و یەك لەسەر سێی بە خواردنەوەو یەك لەسەر سێی بۆ نەفەس کێشانی خۆی تایبەت بکات.

دەگێڕنەوە کە شەیتان نەفرینی خوای لەسەر بێت لەلای یەحیای کوڕی زەکەریا دەرکەوت و زەکەریا پێی وت: تاکو ئێستا لە بابەتێك یاخود مەسەلەیەکدا بەسەرمدا زاڵ بوویت؟ شەیتان وتی: جگە لە بوارێکدا کە زاڵ بووم بەسەرتدا ئیتر بواری تر ش نابەم! وە ئەو بوارەش ئەوە بوو کە شەوێ خواردنیان بۆ ئامادە کردبوویت، مەیلی خواردنتم بۆ زۆر خۆری زیاد کرد! وە تێرو پڕت خوارد و خەوتیت و لەخوێندنی نوێژ و پەرستنش بەجێ مایت و دواکەوتیت!؟

یەحیا وتی: دوای ئەوە لە قاپی پەروەردگار بەڵێن دەدەم کە هیچ کاتێ فرە خۆری نەکەم! شەیتان وتی: منیش لە قاپی و دەروازەی پەروەردگاردا بەڵێن دەدەم، کە هیچ کاتێ کەسێ بەم جۆرە ئامۆژگاری نەکەم!

---

٧ اخرجه الترمذي (٢٣٨٠) وابن ماجة (٣٣٤٩).

## لەناوبەری پێنجەم: زیادەڕەوی لە خەوتندا:

زیادەڕەوی لە خەوتندا بوار بۆ مردنی دڵ دەڕەخسێنێ، جەستە قورس و تەمەن و کات لە ناو دەبات و دەبێتە هۆی بێ ئاگایی و بێ توانا گەلێکی فراوان. هەندێ لە خەوتنەکان نەویستراو و هەندێکی تریشیان بۆ جەستە زیان بەخش و بێ سوود و بێ کەڵکن.

بەسوودترین جۆری خەو ئەوەیە کە مرۆڤ بە سەختی پێویستی پێی بێت. وە خەوتنی سەرەتای شەو لە کۆتایی شەو باشترە، وە خەوتن لە نێوەندی ڕۆژدا لەسەرەتاو کۆتایی ڕۆژ گونجاو ترە. بە هەر ئەندازەی کە کاتی خەوتن بە سەرەتا و کۆتایی ڕۆژ نزیك بێت بە تایبەتی خەوی عەسر و بەرە بەیان جگە بۆ شەو زیندوو کەرەوان زەرەر و زیانی زۆرترە.

لە ڕووانگەی زانایانەوە خەوتن دوای نوێژی بەیانی تاکو بەدەرکەوتنی هەتاو ناپەسەندە، چونکە ئەو کاتە هەلێکە بۆ یاد کردن و خوێندنی قورئان، وە ئەم ماوە زەمینە بەلای ڕێبوارانەوە خاوەنی سوودێکی گەورەیە و تەنانەت ئەگەر تەواوی شەو نەخەوتبن و بە ئاگابووبن، ڕێگە نادەن کە نەریت و ڕەوشتی خۆی لەو ماوە زەمەنیەدا تاکو هەڵهاتنی خۆر بووەستێن. چونکە هەڵهاتنی خۆر دەست پێکردنی ڕۆژو کاتی ناردنی ڕزق و ڕۆزییە، وە ڕۆژ لەو کاتەوە هەڵهاتن و بە دیار کەوتنی خۆی دەست پێ دەکات و کەڵك وەگرتن لەو کات و زەمەنە بە واتای بەهرەمەند بوونە لە خێرو چاکە، وە جگە لە بواری تایبەتیدا نەبێ نابێ ئەو کات و زەمەنە تایبەت بکەین بە خەوتنەوە.

کورتەی قسەکە ئەمەیە کە هاوسەنگ و بەسوودترین خەو خەوی نیوەی سەرەتای شەو و یەك لەسەر شەشی کۆتایی شەوە، کە نزیکەی (٨) کاتژمێر، وە بەلای پزیشکانەوە گونجاو ترین و بە کەڵك ترین شێوەی خەوە لە ڕووی کات و ڕێژەوە و بە هەر ئەندازەیەك لێی کەم بکرێ یاخود پێی زیاد بکرێ، بەلای ئەوانەوە لە سروشتی مرۆڤدا گرفت و ناهەمواری درووست دەکات.

یەکێ لە جۆرەکانی خەوی بێ سوود خەوتنی دوای ڕۆژئاوا بوونە تاکو پێش تاریک بوون و هاتنی شەوی تەواو. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوە بە خراپ و ناپەسەند دەزانێ و لە ڕووانگەی شەریعەت و سروشتیشەوە ناپەسەندە و باش نییە.

بە هەمان شێوە کە زیادەڕەوی لە خەوتندا ڕێگە خۆشکەری سەرهەڵدانی ئەم بەڵایانەیە، کەم خەوی و زۆر خەویش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی بەڵا گەلێکی تری گەورە. کە دەتوانرێ بە ناهەموار گەلێکی وەك: خوو و سروشتی خراپ، وە لادانی نەفس، کەمکردنی توانا و وزە، لەبواری ئەندێشە و کارو کردەوەدا، ئاماژە بکەین.

هەروەها دەبێتە هۆی هەندێ نەخۆشی ترسناك کە دڵ و جەستەی مرۆڤ توانای خۆگرتن و خۆڕاگری ئەو نەخۆشییانەی نابێ. چونکە هەستان و درێژەدان بەژیان لەسەر بناغە و بنچینەی دادگەرییە و هەرکەسێ ڕەچاویان بکات، تەواوی خێر و چاکەی بەدەست هێناوە، وە دەبێ لە ڕێنموونی پەروەردگار داوای یارمەتی و هاوکاری بکات.

## لەناوبەری شەشەم: تەماشاکردنە نا پێویستەکان:

سەرنج و تەماشای زیادە، دەبێتە هۆی ڕووتکێردنی تەماشاکەر و پەیکەر و هەیکەلی لایەنی بەرامبەر لە دڵیدا دەکێشێ و تەماشاکەر بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکات و سەبارەت بە بەدەست هێنانی ئەو دەچێتە نێو قووڵایی بیرکردنەوەوە.

دەتوانین بڵێین کە: تەماشاکردنە ناڕەوا و ڕێگە پێ نەدراوەکان ڕێگە خۆشکەری زۆرێك لە گێرە شێوێنی و پشێوی و نا هەموارییەکانن، بە هەمان شێوە کە لە پەرتووکی (المسند)دا لەپێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) هاتووە کە: ((النظرة سهم مسموم من سهام ابليس، فمن غض بصره لله اورثه الله حلاوة يجدها فى قلبه الى يوم يلقاه)).

واتە: تەماشاکردنی نامەحرەم تیرێکی ژەهراوییە لەتیرەکانی شەیتان، هەرکەسێ لەبەر خاتری پەروەردگار (سەیری نامەحرەم) نەکات، پەروەردگار تام و چێژێکی پێ

دەبەخشیٚ، کە تا ڕۆژی بینینی پەروەردگار لە دڵی خۆی دا هەست بەو تام و خۆشییە دەکات.

زۆرێك لە کێشە و گرفتە گەورە خانەوادەیی و کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێگەی تەماشاکردنە ناڕەوا و ڕێگە پێنەدراوەکانەوە دروست بوون، کەم نەبوونی ئەو تەماشا کردنانەی کە نەك تەنیا یەك داخ و پەرۆش و پەشیمانی بەڵکو دەیان پەشیمانی و داخو پەرۆشی بەدواوە بووە. بە هەمان شێوە کە شاعیریٚ وتویەتی:

| | |
|---|---|
| کل الحوادث مبدئها من النظر | ومعظم النار من مستصغر الشرر |
| کم نظرة فتکت فی قلب صاحبها | فتك السهام بلا قوس ولا وتر |

واتە: سەرچاوە و کانگەی تەواوی ڕووداوەکان تەماشاکردنی نامەشرووع و ناڕەوایە، وە زۆربەی ئاگرە گەورەکان لە یەك تیشك و پرووسکەوە درووست بوون، چ تەماشا گەلیٚ کە دڕاوی و دڕیاوی (پرژو بڵاو) لە دڵی تەماشاکەردا درووست دەکات، چونکە تەماشاکردنەکان تیر گەلێکن بەبیٚ کەوان و ژێ.

## لەناوبەری حەوتەم: زۆر قسەکردن:

قسە و وتەی زیادە و نا پێویست، دەرگا و دەروازە گەلی شەڕ و خراپەی زۆر بۆ زەفەر بردن و چوونە ناوەوە شەیتان بە ڕووی قسەکەردا دەکاتەوە. بەڵام دوور کەوتنەوە لە قسەی ناپێویست و نابەجیٚ تەواوی ئەو دەرگا و قاپیانە بە ڕووی شەیتاندا دادەخات.

کەم نەبوون، ئەو شەڕ و مشت و مڕانەی کە هۆکارەکەیان تەنیا یەك ڕستە و قسە بووە.! پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژیٚ بە مەعازی کوڕی جەبەلی فەرموو: ((وهل یکب الناس علی مناخرهم فی النار الا حصائد السنتهم)).[٨]

واتە: ((مەگەر شتیٚ جگە لە داهات و بەرهەمی زمان، خەڵکی بە لووت (سەر و نێو چاوان) لە نێو ئاگردا ژێرە و ژوور دەکات؟))

---

٨ رواه الترمذی (٢٦١٦) و ابن ماجة (٣٩٧٣).

له سه‌حیحی ترمزی دا هاتووه كه، پیاوێكی ئه‌نصاری كۆچی دوایی كردو خه‌ڵكی ده‌یان وت: خۆش به حاڵی ئه‌و! پێغه‌مبه‌ری خوا (صلی الله علیه وسلم) فه‌رمووی: ((فما یدریك فلعله تكلم بما لایعنیه او بخل بما لا ینقصه)).[٩]

واته: له كوێوه ده‌زانن له‌وانه‌یه قسه‌یه‌كی بێ كه‌ڵك و خراپی (بۆ دین و دونیای خۆی) كردبێ یاخود سه‌باره‌ت به شتێ كه لێی كه‌م نه‌بووه‌ته‌وه، پیسه‌كی و ئیره‌یی كردبێ)).

قسه‌ی له ڕاده‌به‌ده‌ر و ته‌ماشاكردنی ناڕه‌وا و حه‌رام، سه‌رچاوه و كانگه‌ی زۆرێك له تاوانه‌كانن. وه چوڵترین ڕێگه‌ن بۆ هاتنه ناوه‌وه‌ی شه‌یتان. چونكه زام و برینی ئه‌و تاوانانه هیچ كاتێ چاك بوونه‌وه په‌یدا ناكه‌ن و چاك نابنه‌وه. به‌ڵام هه‌وا و هه‌وه‌س و ئاره‌زووی زگ تێر كردن و پڕ كردن به‌م جۆره نییه و هه‌ر كاتێ كه پڕ تێر بووبێ، مه‌یل و ئاره‌زووی بۆ خواردن كه‌م بووه‌ته‌وه.

به‌ڵام ئه‌گه‌ر چاو و زمان بخرێنه دۆخی خۆیان و وازیان لێ بهێنی و لێیان نه‌پرسیته‌وه، هیچ كاتێ له ته‌ماشاكردن و قسه كردن ماندوو و بێتاقه‌ت نابن، وه تاوان‌و لادانیان داوێنه‌دار و شوێنهاته‌كانیان به‌رفراوان و به‌ربلاوترن. (سه‌باره‌ت به به‌لاو تاوانی زمان، ده‌گێڕنه‌وه كه ئیمامی ئه‌بوبه‌كر (ڕه‌زای خوای له سه‌ر بێت)، به‌ردێكی خستووه‌ته ناو ده‌می و به‌رده‌وام وه‌ك بنێشت هاتوو چۆی پێ ده‌كردوه و لێیان پرسی، بۆ وا ده‌كه‌یت ئه‌ی ئیمام؟ ئه‌ویش فه‌رمووی: ده‌مه‌وێ سه‌ری زمانم بشكێنم و ئاگام لێی بێت، چونكه گه‌ر سه‌ری نه‌شكێنم ئه‌و سه‌رم ده‌شكێنێ و سه‌رم ده‌خوات، واته تووشی تاوانم ده‌كات، وه‌رگێڕی كورد).

سه‌له‌فی سالح ئه‌هلی ئیمان و باوه‌ڕیان له زۆر بڵێی و قسه زۆركردن و ته‌ماشاكردنه نا پێویسته‌كان دوور خستۆته‌وه و ئاگاداریان كردوونه‌ته‌وه، وه ده‌یان وت: هیچ شتێ له به‌ند كردنی ماوه درێژی زمان چاكتر نییه. !

---

٩ رواه الترمذي (٢٣١٦) وصححه الالباني.

## تەوەری یەکەم: ڕاستی و حەقیقەتی نەخۆشی دڵ:

لە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزدا باس لە نەخۆشی و دەردەداری دڵ کراوە: پەروەردگاری بە توانا لەبارەی دوو ڕووەکانەوە((المنافقین)) دەفەرمووێت: ﴿فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا﴾ سوورەتی البقرة ١٠.

واتە: ئەوانە لە دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی بێ باوەڕی و حەسوودی و کینە هەیە، خوایش (بەسەرخستنی حەق و ئیمانداران) ئەوەندەی تر دەردیان گران و کاریگەر دەکات و سزایەکی سەختیش (لە دونیا و قیامەتدا) چاوەڕێیانە، بەهۆی درۆکردن و (دژایەتییان بۆ ئیسلام).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ﴾ سوورەتی ئەحزاب ٣٢.

واتە: ئەی ژنانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئێوە وەك هیچ ئافرەتێکی تر نین، ئەگەر بە تەواوی ترسی خوا لە دڵ و دەروونتاندا هەیە، قسە بە ناسکی و شێوەیەك مەکەن، نەوەکو ئەوەی دڵی نەخۆشە بووروژێت و نیازی خراپ بکات.

پەروەردگاری مەزن داوای لەوانە کردووە کە وەکو هەندێ لە ژنانی لاواز و ناسك بێژ لەقسەکانیاندا ناسکی و لاوازی نیشان نەدەن، تا کەسانێ کە دڵیان نەخۆشە، زەفەریان پێ نەبەن، بەڵام لەپاڵ ئەوەشدا نابێ قسەکانیان بە جۆرێکی توند و تووڕە ئامێز بێت، کە لە شێوەی جنێو و قسەی خراپدا بن، بەڵکو دەبێ بە وردی و جوانی قسە بکەن.

پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی: ﴿لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ﴾ سوورەتی ئەحزاب ٦٠.

واتە: سوێند بەخوا ئەگەر دوو ڕووەکان و دڵ بیمارەکان و پڕو پاگەندەچییەکان، لە مەدینەدا کۆڵ نەدەن، مۆڵەت و هانی تۆ دەدەین کە تۆڵەیان لێ بسێنیت و زۆربەیان دەربەدەر بکەیت و پاشان کەمێکیان نەبێت لە شاردا نەمێننەوە.

## جیاوازی هەڵوێست نواندنی دڵ:

هەنـدێ جـار سـەبارەت بـە بابـەتێ، دڵـەکان خـاوەنی هەڵوێـستی جیـاوازن. پەروەردگاری بەدەسەڵات دەفەرمووێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلَّا مَلَائِكَةً وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا وَلَا يَرْتَابَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْمُؤْمِنُونَ وَلِيَقُولَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ وَالْكَافِرُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلًا﴾ سوورەتی المدثر ٣١.

واتە: جا ئێمە وە نەبێت کار گوزارانی دۆزەخمان لە کەسانی تـر جگـە لـە فریـشتە بەدی هێنابێت، ئەو ژمارەیشمان تەنها بۆ تاقیکردنەوە دیاری کردووە بـۆ ئەوانـەی کـە بێ باوەڕ بوون، هەروەها بۆ ئەوەی ئەوانەی کتێبیان پێدراوە دڵنیـابن لـە ڕاسـتی ئـەم قورئانە (چونکە لە تەورات و ئینجیلدا ئەو باسە هەیە)، وە بـۆ ئـەوەش کـە ئیمانـداران زیاتر باوەڕیان دامەزراو بێت و ئەوانەش کە کتێبیان پێدراوە، ئیماندارانیش حـەق نییـە تووشی دوو دڵی ببن.

پەروەردگار لەم بارەیەوە دەفەرمووێت، کـە لەبـەر هۆکـار گەلێکـە کـە نـۆزدە (١٩) فریشتەی لەلای ئاگری دۆزەخ دیاری کردووە، وە لە نێوان ئەوانەدا پێنج هۆکاری بـاس فەرمووە:

١. گۆبەنـد و تاقیکردنـەوەی بـێ بـاوەڕان، کـە بەهۆیـەوە زیـاتر لـە بـێ بـاوەڕی و گومڕایی دا نقوم بوون.

٢. بەهێز کردنی باوەڕی ئەهلی پەرتووك، کە بە هۆی باوەڕ هێنـان بـەو هەواڵـە کـە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بـەبێ چـاوپێکەوتن لـە گـەڵ پێغەمبـەرەکانیان ئەوی هێناوە، نەفسی خۆیـان بـەهێز دەکـەن و بـۆ ئەوانـەی کـە ئـەهلی بـێ بـەقایی و نکوڵین، پەڵپ و بیانوویان نـاهێڵێ، وە ڕێنمـوونی ویـستانیش پـەروەردگار ڕێنمـوونیـان دەکات.

٣. هەروەها باوەڕی ئەهلی ئیمان بە هۆی شایەتی دان و پەسەندکردنی تەواو دانپێدانانیدا زیاد دەکات.

٤. گومان و دوو دڵی لە نێو دڵی ئەهلی کتێب و ئەهلی باوەڕ بەهۆی دڵنیایی ئەوان و شایەتی و باوەڕی تەواوی ئەمان جێ بەجێ دەکات.

واتە ئایەتێك کە هاتووە خاوەنی ئەم چوار هۆکارەیە:

- گۆبەند (فیتنە) بۆ بێ باوەڕان.
- دڵنیایی و پشت ئەستووری ئەهلی کتاب.
- زیاد کردنی ئیمان و باوەڕی موسڵمانان.
- لەناو بردنی گومان و دوو دڵی ئەهلی کتێب و ئەهلی ئیسلام.

٥. سەر لێشێواویی و کەساسی بێ باوەڕان و دڵ نەخۆشان و دڵ مردووەکان سەبارەت بە دیاری کردنی (١٩) فریشتە بۆ بەڕێوەبردنی دۆزەخ، کە دەڵێن: ﴿مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلًا﴾ سوورەتی البقرة ٢٦.

واتە: جا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە ئەوە چاك دەزانن ئەم نموونەیە ڕاستەو لەلایەن پەروەردگارییانەوەیە، ئەوانەش کافر و بێ باوەڕ بوون کە دەڵێن: خوا مەبەستی چی بوو لەم نموونەیەدا..؟!

- دڵێ کە بە هۆیەوە زیاتر لە بێ باوەڕی و بێ بەقایی و گومڕایی دا نقوم دەبێت.
- دڵێ کە ئیتر ئیمان و پەسەندکردنی زیاد ناکات.
- دڵێکی تر باوەڕی پێ دەکات و ئیتر بەڵگە و بیانووی نامێنێ.
- دڵێکی تر سەر لێشێواو و سەرگەردان دەبێ، وە نازانێ مەبەست لەوە چییە..؟
- دڵانێکی تر لە گومان و دوو دڵی لەم بارەیەوە ڕزگاریان دەبێ.

## قورئان چارەسەر و دەوا و دەرمانی دڵەکانە:

پەروەردگاری مەزن دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ سوورەتی یونس ٥٧.

واتە: ئەی خەڵکینە، بەڕاستی ئێوە ئامۆژگارییەکی گەورەو گرنگتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە (قورئانە) شیفاو چارەسەریشە بۆ نەخۆشی دڵ و دەروونەکان و ڕێ نیشاندەرو ڕەحمەتیشە بۆ ئیماندران.

قورئان دەواو دەرمانی چارەسەرکەری دڵەکانە لە نەخۆشی نەفامی و نەزانی و گومڕایی، چونکە زانست و ڕێنموونی دەواو دەرمانی نەخۆشی بێ ئاگایی و نەزانینە، گەشەو ڕێنموونی دەواو دەرمان و چارەسەری گومڕایی و تاریکین.

پەروەردگاری مەزن پێغەمبەرەکەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) لەم دوو نەخۆشی و دەردەدارییە پارێزراو پاك فەرموویەتی: ﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى﴾ سوورەتی نەجم ١ – ٢.

واتە: سوێند بە ئەستێرە کاتێك لە شوێنی خۆی دەترازێت و بەخێرایی بەر دەبێتەوەو ئاوا دەبێت. هاوەڵ و هاوڕێی ئێوە ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) گومڕاو سەر لێشێواو نەبووە، لەڕێگەی ڕاست و ڕەوان نەترازاوە.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) جێنشینەکانی خۆی بە زانستو ڕێنموونیکەری پێناسەو وەسف کردووەو فەرموویەتی: (عليكم بسنتي و سنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي).[١٠]

واتە: لەسەرتان پێویستە کە لە شەریعەتی من و شەریعەتی جێنشینە گەشەکردو ڕێنموونی کراوەکان و ڕێنموونی کەرەکانی دوای من پەیڕەوی بکەن.

---

١٠ اخرجه ابو داود والترمذی وابن ماجة والدارمی وصححه الالبانی.

پـەروەردگاری بـە دەسـەلأت وتـەی خـۆی بـۆ ئامۆژگـاری كردنـی تـەواوی خـەڵك و رێنمـوونی كـەرو رەحمـەتێ بـۆ ئـەهلی ئیمـان و چارەسـەری ئـازاری دڵـەكان دانـاوە. هەركەسـێ لـە قورئـان بـۆ چاكبوونەوەی نەخۆشـییە فیكـری و هزرییـەكان، ئـەخلاقی رەوشتی و كردەیی خوێن كەڵك و قـازانج وەربگـرێ، كێـشەو نەخۆشـی ئـەو چارەسـەر دەكرێ و هەركەسێ بەم جۆرە نەكات بەڵگەی راست بێژی شاعیرە كە دەڵێت:

فاذا بل من داء بــه ظنَ انـــه نجا و بـه الداء الذی هو قاتله

واتـە: هـەركاتێ كـە نەخۆشـییەكی هـەبوو و چارەسـەركراو چـاك بوویـەوە، هەسـت دەكات كە رزگاری بـووە، بـەڵام نـازانێ كـە بەدەسـت نەخۆشـییەكی تـری كوشـندەوە ئێش‌و ئازار دەكێشێ.

پەروەردگاری مەزن دەفەرموویێت: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَارًا﴾ سوورەتی ئەسرا ٨٢.

واتە: ئێمە لە قورئان ئایـەت و سـوورەتانێك دادەبـەزێنین، كـە ببێتـە هـۆی شـیفاو چارەسەر بۆ نەخۆشییە دەروونی و جەستەییەكان هەروەها رەحمـەت و میهرەبـانیش بۆ ئیمانداران، بـۆ سـتەمكارو خوانەناسـانیش تـەنها زیـاد كردنـی زەرەرو زیـان نـەبێت هیچی تر نییە، هیچ بەهرەو سوودێكی لێ نابینن.

رای باشتر ئەمەیە كە قسەی (من) لـەم ئایەتـەدا بـۆ (باسـكردنی رەگـەزە)، چـونكە قورئانی پیرۆز هەمووی بۆ ئەهلی ئیمان چارەسەرو رەحمەتە.

## تەوەری دووەم: ئامراز و هۆکاری نەخۆشییەکانی دڵ و جەستە

### نەخۆشییەکانی جەستە و ڕێگە چارەکانیان:

نەخۆشییە جەستەییەکان لەبەرامبەر تەندروستی و سەلامەتی جەستەوە جێگیر بوون و لە ئاکامدا لەدۆخی هاوسانی و هاوسەنگیدا دەردەچێ و کار و چالاکی سروشتی ئەندامەکانی تووشی شێواوی و تێکچوون دەکات، یا وەکو کوێری، کەڕیّ و ئیفلیجیّ، توانا و هێزی خۆی بە تەواوی لەدەست دەدات و یاخود بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە تووشی لاوازی و گرفت دەبیّ و بەو شێوەیە کە گونجاو و پێویستە لە ئەستۆی کار و بەرپرسیارییەتەکانی نایەت.

لە بوار گەلێکی تریشدا ئەندام و هەستەکانی مرۆڤ بەهۆی نەخۆشی و ڕووداوەوە لەدۆخی ئاسایی خۆیان دەردەچن و پێچەوانەی ڕاستی و حەقیقەت پیشانی خاوەنەکەی دەدەن و شیرین بەتاڵ و تاڵ بە شیرین و پاك بە ناپاك و ناپاك بە پاك، هەست پێدەکەن.

خراپی و شێواوی و تێکچوونی کاری سروشتی ئەوان وەکو تێکچوون و لاوازی لەکاری سیستەمی هەرس کردن، هەست کردن، بەرگری کردن، ڕاکێشان.. کە بەهۆی دوورکەوتنەوە و دەرچوونیان لەدۆخی هاوسانی و هاوسەنگی دا تووشی ئێش و ئازار و ژان دەبن، بەلاّم لە هەمان کاتدا توانای خۆیان بە تەواوی لەدەست نەداوە و تووشی لەناو چوون و تیاچوون نەبوون، بەڵکو تا ڕادەیەك توانای جووڵەی خۆیان دەپارێزن.

ئامراز و هۆکاری ئەو دەرچوونە لە دۆخی هاوسانی و هاوسەنگی، یاخود خراپی و لەناوچوون لە چەندییەتی و چۆنییەتی دا، خراپی و تێکچوون لە (چەندییەت)دا، یا بەهۆی کەمایەتی و ناتەواوی ماددەیەکی تایبەتییە کە دەبیّ ڕێژەکەی زیاد بکەین، یاخود بە هۆی زیادی و لە ڕادەبەدەرییەتی کە پێویستە ڕێژەکەی کەم بکەینەوە.

شێواوی و تێکچوون لە (چۆنییەت)یشدا یا بەهۆی زۆری گەرما، سەرما، تەڕایی و وشکی و ڕەقییەوەیە، یا بەهۆی کەمکردن لە ئەندازەی سروشتی کە هەر یەکێکیان دەبێ بەشێوە و دەواو دەرمانێکی گونجاو چارەسەر بکەین.

بناغە و تەوەری سەلامەتی جەستە لەسەر پاراستنی توانایی و پارێزگاری کردن لە بەرامبەر نەخۆشییەکان و هێنانە دەرەوەی ماددەی خراپ و بەسەرچوو لە جەستەدا جێگیرە.

دۆزینەوە و دیاری کردنی پزیشکەکان لەسەر بنچینەی ئەم سێ بناغەیە جێگیرە، کە قورئان ئاماژەی بۆ کردووە و پەروەردگارێ کە ئەوی بۆ چارەسەر و ڕەحمەتی مرۆڤەکان ناردووە ئێمەی بۆ ئەو سێ بناغەیە ڕێنموونی فەرمووە.

**بناغەی یەکەم:** پاراستن و پارێزگاری کردن لە هێز و توانا: پەروەردگاری مەزن داوای لە نەخۆشان و ڕێبواران کردووە کە لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا لە ڕۆژوو گرتن دوورە پەرێزی بکەن، وە ڕێبوارەکان دوای کۆتایی هاتنی سەفەر و نەخۆشییەکەیان و دوای بووژانەوە و چاك بوونەوەیان، قەرەبوو و فەراهەمی بکەنەوە. تاوەکو هێز و توانای خۆیان بپارێزن. ! چونکە ڕۆژوو گرتن هەندێ جار نەخۆشی نەخۆشەکان زیاد دەکات، وە ڕێبواران بە هۆی ئیش و کار و سەرقاڵی سەفەرەکەیانەوە پێویستیان بەپاراستن و پارێزگاری کردنی هێز و تواناکەیانن.

**بناغەی دووەم:** ئاگا لێبوون و پشتیوانی و چاودێری کردن لە بەرامبەر کاروباری زیان دەرو خراپ: پەروەردگاری بە دەسەڵات ڕوخسەتی بە مرۆڤە ناساغ و نەخۆشەکان داوە کە لە بەکارهێنانی ئاوی سارد بۆ خۆشۆرین و دەست نوێژ گرتن دوورەپەرێزی بکەن. چونکە بۆ ئەوان خراپە و زەرەری هەیە و ڕێگەی پێداون کە لە بری ئەو بە خاکی پاك تەیەموم بکەن. تا لە چوونە ناوەوەی شتی پیس و زەرەردەر بۆ ڕواڵەتی لەش و بەشێوەی یەکەم بۆ دەروونی ئەو بکەونە بەر پارێزگاری کردنەوە.

**بناغەی سێیەم:** لابردن و دوور خستنەوەی ماددەی ژەهراوی و زیادە لە لەشدا: پەروەردگار بە حاجیان کە لە کاتی ئیحرامدا سەرشانیان بریندار یاخود نەخۆشییەکی تایبەتیان هەیە، ڕێگەی داوە بە کورت کردنەوەی مووی قژیان، تاوەکو لە قژ و هەڵمی پیس پاك بن. ئەمە یەکێ لە سادە و ساکارترین پاك پارێزی جەستەیە کە دەتوانێ ئامارەیەك بێت بە پێویستی جێ بەجێ کردنی ئەم شێوازە لە نەخۆشی و گرفتە گەورەکاندا. ئەم بابەتەم بۆ یەکێ لە پزیشکە گەورە و ناودارەکانی وڵاتی میسر باس کرد، ئەو وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بۆ دۆزینەوەی ئەم بابەتە گەشتم بۆ ڕۆژئاوا بکردایە، بە گەشت و سەفەرێکی قورس و گرانم لە قەڵەم نەدەدا!

## دڵ وەکو جەستە وایە لە نەخۆشی و دژەنەخۆشیدا

دوای ئەو ڕوونکردنەوانە بەدیار دەکەوێت کە دڵیش داواکار و ئاواتە خوازی:

– کاروبارێکە کە لە هۆکاری بەهێزی و بە توانایی ئەو — واتە ئیمان و یادکردن و پەیڕەوی کردن و گوێڕایەڵ بوون — پارێزگاری بکات.

– بۆ پارێز و پارێزگاری کردن لە بەرامبەر شتە خراپ و زیانبارەکانی بە دووریکردن و دوور کەوتنەوە لە تاوان و گوناح و دووریکردن و خۆگرتن لە دژایەتی کردن لە گەڵ شەریعەتدا، پێویستمان هەیە.

– بۆ دەست بەتاڵی و خاڵی بوون لە کاروباری خراپ و لەناوبەر، بە تۆبە و گەڕانەوەیەکی ڕاستگۆیانە و پەشیمانی و لاڵانەوەیەکی بە ئاگایانە پێویستمان هەیە.

نەخۆشی دڵ، گرفت و نەنگییەکە کە بۆی دێتە پێش و ناسین و پەیڕەوی کردن لە حەقی لێ تێك دەدات و حەق بە حەق نابینێ و یاخود وەك ئەوەی کە هەیە بەپێچەوانەوە هەستی پێ دەکات و یاخود درك کردنی ڕاستی و حەقیقەتی بەلاوە بە توندی کەم دەبێتەوە، وە ویستی بۆ قەبووڵ کردن و پەسەندکردنی حەق سست دەبێ و لەگەڵ حەق و ڕاستی و بەرژەوەندی دا نەیاری و دوژمنی دەکات و باتڵ و

نارەوای خۆش دەوێ و حەزی لێ دەکات، وە زۆرێك لە مرۆڤەکان هەردووکی ئەم بابەتانەی تێدا دێتە دی.

بە هۆی ئەمەوە ئەو نەخۆشی و پیتاك و باجانەی کە تووشی دڵ دەبن، هەندێ جار بە لێکدانەوەی گومان و بوختان و گێچەڵ لێك دەدرێتەوە، هەروەکو موجاهیدو قەتادە لەم ئایەتەدا لێکیانداوەتەوە: ﴿فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ﴾ سوورەتی بەقەرە ١٠.

واتە: ئەوانە نەخۆشی بێ باوەڕی و حەسوودی و کینە هەیە.

هەندێ جاریش (نەخۆشی دڵ)یان بە هەوا و هەوەسی زینا لێکداوەتەوە، وەکو ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿...فیطمع الذی فی قلبه مرض﴾ **سوورەتی ئەحزاب ٣٢.**

واتە: ((...نەوەکو ئەوەی دڵی نەخۆشە بووروژێت و نیازی خراپ بکات، هەمیشە و بەردەوامیش قسەی چاك و بەجێ بکەن(کە هیچ کەس نەتوانێ ڕەخنەی لێبگرێت))).

یەکەم: نەخۆشی گومان و دوو دڵی.

دووەم: نەخۆشی هەوا و هەوەس و ئارەزوو.

تەندروستی و سەلامەتی بە هۆی وێچوون و هاوتا بوونەوە پارێزراو دەبێ، بەڵام نەخۆشی و ناساغی بەهۆی دژایەتی و پێچەوانەکەیان جێ بەجێ دەکرێ.

لە ڕاستی دا نەخۆشی بە هۆی ئامراز و هۆکارێکی وەك هۆکاری خۆی بەهێز بووە و بەهۆی دژەکەیەوە جێ بەجێ دەکرێن، وە تەندروستی و سەلامەتی لە ڕێگەی هۆکاری وێچووەوە هۆکاری ئەوان پارێزراوە و بەپێچەوانە ئەوانیش لەنێو دەچێ.

جەستەی مرۆڤی نەخۆش بەهۆی شت گەلێکی وەك: سەرما، گەرما و ئیش و کار، کە جەستەی مرۆڤی ساغ و تەندروست ئەوەندە ئەزییەت و ئازار نادات، تووشی ڕەنج و ئازار دەبێت.

دڵی نەخۆشیش بەهۆی هەندێ کاروباری وەك: (گومان و هەوا و هەوەس و ئارەزوو) نەخۆشییەکەی زیاتر دەبێت. چونکە توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوانی نییە.

بەڵام دڵی ساغ و تەندروست و بەهێز، كاروباریٚ لەوە خراپتریش بەهێز و توانا و ویست و ئیرادەوە لادەبات و دوور دەخاتەوە. بە گشتی دەتوانین بڵێین كە: هەركاتیٚ شتیٚ وەكو هۆكاری نەخۆشی نەخۆشان پەیدا ببیٚ، ڕێژەی نەخۆشییەكەیان زیاد دەبیٚو هێز و تواناكانیان نامێنیٚ و لاواز دەبن، وە ئەگەر ئەم هۆكارانە بە دروستی لەناو نەبرێن و ئامراز و هۆكاری لەناو بردنی نەخۆشی فەراهەم نەكریٚ بەرەو مردن و تیاچوون هەنگاو هەڵدەگرن.

## كورتەیەك لەبارەودۆخی دڵ:

– دڵیش هاوشێوەی جەستە تووشی نەخۆشی دەبێت.

– چارەسەرەكەی لە ڕێگەی تۆبە و گەڕانەوە و چاودێریكردنەوە دێتە دی.

– دڵیش وەكو ئاوێنە پیس دەبێت، وە تەنیا ڕێگەی پاك كردنەوەی، ناسین، یادكردن و گوێڕایەڵی پەروەردگارە.

– دڵیش وەكو جەستە ڕووت و قووتە و داپۆشین و جوانكردن و ڕازاندنەوەی تەنیا لە ڕێگەی (تەقوا و خواناسینە)وەیە.

– دڵیش وەكو جەستە برسی و تینووی دەبیٚ، وە خواردنیشی (یەكخواپەرستی، پشت بەستن بەخوا، پەشیمانی و گەڕانەوە و ڕێز و خۆشەویستی) پەروەردگارە.

# بەشی چوارەم

## ڕێگەکانی بەرگری کردن، لە زاڵ بوونی نەفس بەسەر دڵدا

## تەوەری یەکەم: سەرچاوەی نەخۆشییەکانی دڵ

### پەنابردن بۆ پەروەردگار لە خراپە و شەڕی نەفس:

ئەم بەشە وەکو پایە و بناغە وایە بۆ بەشەکانی دواتر.

پێویست بە وەبیرهێنانەوە دەکات کە: (نەفس ئەممارە)کانگە و سەرچاوەی تەواوی نەخۆشییەکانە کە دڵ تووشیان دەبێت، وە تێکڕای هۆکارەکان بە خراپ و لەناو بەرەکانی دڵ بۆ ئەوە دەگەڕێنەوە و بە ئەندامەکانی تر و لەپێش هەمووشیانەوە بۆ دڵ پەرە دەستێنێ و دەگوازرێتەوە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە سەرەتای قسە بە نرخەکانی دا هەمیشە دەیفەرموو: **((الحمد لله نستعينه ونستهديه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا...))**.[11]

واتە: ((ستایش تایبەتە بە پەروەردگارەوە، داوای هاوکاری و یارمەتی لەو دەکەین و لەویش ڕێنموونی وەردەگرین، وە داوای لێ خۆش بوون و لێ بوردنی لێ دەکەین و لە شەڕ و خراپە و بەلآی نەفسی خۆمان و کار و کردەوەکانمان هاوار و پەنا بۆ پەروەردگار دەبەین..)).

لە موسنەدی ترمزی لە حوسێن کوڕی عوبەید هاتووە کە: ((پێش موسڵمان بوونم پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم: (حوسێن چەند خوا دەپەرستی..؟) وتم: حەوت خوا لە زەوی و دانەیەکیش لە ئاسماندا.! فەرمووی: ((لە کام یەکێ لەوانە ئومێد و ترست هەیە؟))

وتم: بەو پەروەردگارەی کە لە ئاسماندایە. فەرمووی: ((ئیسلام قبووڵ بکە! تا شت گەلێکی بە کەڵکو بە سوودت فێر بکەم)). دوای ئەوەی کە ئیمانم هێنا، فەرمووی:

---

[11] اخرجه ابو داود (٢١١٨) وكذا اصحاب السنن.

((بلێ پەروەردگارا، ڕێگەی گەشەكردن و ڕێگەی ڕاستم نیشان بدە و لە خراپە و بەڵای نەفسم پارێزراوم بكە)).

پێغەمبەری خوا (صلى الله علیە وسلم) بە شێوەیەكی گشتی لەخراپە و بەڵای نەفسو لە شەڕ و زەرەر و زیانەكانی كار و كردەوە و قسە و لێدوانانێ كە پەیدا دەبێو ڕوو دەدات و شوێنهاتەكان، ناڕەحەتییەكان و تۆڵە و سزادانەكانیان پەنا و هاوار بۆ لای پەروەردگار دەبات. وە لە خراپە و بەڵای نەفس و كار و كردەوەی هەردووكیان پەنا بۆ پەروەردگار دەبات، لە بەردوو ئەگەرە:

**یەكەم:** لە بارەی زۆری هاوشێوەی ڕەگەزی خۆی، واتە پەروەردگارا لە خراپە و نالەباری ئەم جۆرە كار و كردەوەیە پەنا بۆ تۆ دێنم.

**دووەم:** مەبەست لەوە تۆڵە سەندنەوە و سزادانی كاروبارێكە كە خاوەنەكەی تووشی گرفت و زیان دەكەن.

لە سەر بناغەی ئەگەری یەكەم، پێغەمبەری خوا (صلى الله علیە وسلم) لە ڕەوشتو خەسڵەتی نەفس و پەرچەكرداری لە پەروەردگار پاڕاوەتەوە و لالاوەتەوە. وە لە سەر بناغەی ئەگەری دووەم، لە سزا و تۆڵە سەندنەوەكان و هۆكارەكانیان پەنا و هاواری بۆ پەروەردگار بردووە.

بەم جۆرە كاری خراپیش بە بەشێك لە نالەباری و بەڵای نەفس دەژمێردرێ.

ئایا ئەو نزا و پاڕانەوەی ئەو بەو مانا و واتایەیە كە: پەروەردگارا لە سزای ئەو كاروبارانەی كە بەلامەوە باش نین. هاوار و پەنات بۆ دێنم یاخود لە نەفس و كار و كردەوە خراپەكانم.؟ وا دیارە واتای یەكەم باشترە، چونكە كەڵك وەرگرتن لە كرداری خراپ دوای ڕوودانی، شتێ جگە لە هاوار و پەناگرتن بە خوا لە تۆڵە و ئاكامی ئەو نییە، ئەگەر چی كە وەك كاری ڕوودراو بوون ناتوانین چارەسەر و لای ببەین.

## پەردە لە نێوان دڵ و بەدیهێنەردایە:

تەواوی ڕێبواران و کاروانانی ڕێگەی پەروەردگار وێڕای شێوازی جیاواز و جیاوازی ڕێگە، لەم بارەوە کۆکن کە نەفسی ئەممارە پچڕێنەر و جیاکەرەوەی ڕێگەی گەیشتنی ڕێبوارە بۆ لای پەرستراوی ڕاستەقینەی خۆی و تەنیا دوای لاواز کردن و لەناو بردن و دژایەتی کردنە لەگەڵیدا، کە دەتوانرێ ڕێگەی یەکخواپەرستی و پەرستشی پاك بۆ گەیشتن بەڕەزامەندی پەروەردگار و بەدەست هێنانی بەختەوەری و کامەرانی هەتا هەتایی درێژە پێ بدەین. چونکە خەڵکی بەسەر دوو دەستە و تاقمدا دابەش دەبن:

١. تاقم و دەستەیەك کە نەفس زاڵ بووە بە سەریانداو بە تەواوی خستوونیەتیە ژێر ڕکێفی بڕیارەکانی خۆی و لە ڕێگەی تیاچوون و لەناو بردندا جێگیری کردوون.

٢. دەستە و تاقمێکی تر کەسانێکن کە سەرکەوتوون بەسەر نەفسی خۆیاندا و ئەویان بە گوێڕایەڵ و کاربەدەستی ویست و ئیمانی خۆیان دەرهێناوە.

هەندێ لە زانایان و خواناسان دەڵێن: سەفەری ڕێبواران تەنیا بە سەرکەوتن بە سەر نەفسی خۆیاندا کۆتایی پێ دێت، هەرکەسێ زاڵ بوو بەسەر نەفسی خۆیدا، ڕزگار و سەرکەوتوو و سەر بڵند دەبێ و هەر کەسێکیش زەلیلی نەفسی خۆی بوو و نەیتوانی بەسەریدا زاڵ بێ، وێران و لە ناو دەچێ.

پەروەردگاری بە توانا دەفەرموویێت: ﴿فَأَمَّا مَنْ طَغَى (٣٧) وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا (٣٨) فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ سوورەتی نازعات ٣٧ — ٣٩.

واتە: جا ئەوەی خوا نەناس و یاخی و لە سنوور دەرچوو بێت، ژیانی دونیای زیاتر لە قیامەت مەبەست بووبێت، ئەوە بێگومان ئەو دۆزەخە جێگەی مانەوە و حەوانەوەیەتی. ! !

سروشتی نەفس جۆرێکە کە مرۆڤ بە ملهوڕی و نا فەرمانی و بە باشتر زانینی دونیا بەرامبەر بە دوارۆژ دوو دڵ دەکات، (واتە بەو شتانە مرۆڤ تووشی دوو دڵی دەکات).

بەڵام پەروەردگاری بە بەزەیی مرۆڤ بە ترسان لە خوا و ڕووبەڕوو بوونەوە لە گەڵ هەوا و ئارەزووە نەفسانییەکان بانگ دەکات.

دڵ لە دوو لاوە بانگ دەکرێ، هەندێ جار بەلای ئەمدا و هەندێ جاریش بەلای ئەوی تریاندا مەیل پەیدا دەکات. بواری تووش بوون و تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندن لێرەوە سەرچاوە دەگرێ.

## نیشانەی نەفس یاخود، نەفسەکان؟:

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا بە سێ جۆر باسی نەفسی کردووە: نەفسی موتمەئینە[12]، نەفسی ئەممارە[13]، نەفسی لەووامە[14].

لەم بارەیەوە کە ئایا نەفس تەنیا یەکێکە و خاوەنی ئەم سێ وەسف و دۆخانەیە؟ یاخود ئەمەی کەوا هەر مرۆڤێ خاوەنی سێ نەفسە بە ناوەکانی نەفسی ئەممارە، لەووامە، موتمەئینە، ڕای جیاواز هەیە.

**ڕای یەکەم:** ڕای شەرعزان و تێگەیشتووان و زۆرینەی ئەهلی تەفسیر و ڕای خواناسانی ئەهلی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیە.

**ڕای دووەم:** بۆچوونی زۆربەی ئەهلی تەسەوفە.

بەڵام دوای لێکۆڵینەوە و ڕوونکردنەوەی بێ لایەنانەی بابەتەکە بەم ئاکام و ئەنجامە دەگەین کە لە بناغەدا دژایەتی لە نێوان لایەنگرانی ئەم دوو بۆچوونەدا بوونی نییە، چونکە (نەفس) بە گوێرەی سروشتی خۆی یەك نەفسە و بەگوێرەی وەسف و دۆخی، سێ نەفسە.

---

۱۲ دەروونی هێمن و دڵنیا، بە دوور لە ئاژاوە و پشێوی، وەرگێڕی کورد.

۱۳ خواستی دەروون بۆ پێکهانی حەز، خۆشی چێژ.

۱٤ خواستی دەروون بۆ هەڵگەڕاندنەوەی مرۆڤ لە کاری خراپ و دزێو.

هەرکاتێ خودی خۆی بخەینە ژێر چاودێری و سەرنجەوە، نەفس یەکێکە و ئەگەر لە گۆشە نیگای وەسف و دۆخییەوە سەیری بکەین، نەفسی مرۆڤ سێ جۆرە.

گومان ناکەم کە مەبەستی هەندێکیان ئەوە بێت کە هەر مرۆڤێ خاوەنی سێ نەفسی بەهێز و سەربەخۆیە و هەریەکێ لەو نەفسانە لە ڕووکەش و حەقیقەت لەگەڵ ئەوی تردا یەکسان بێت، وە هەرکاتێ مرۆڤ بمرێ، سێ نەفسی سەربەخۆ و جیا لە یەکتر لەگەڵیدا بمرێت. چونکە هەرکاتێ پەروەردگار باسی نەفسی کردبێ و ئەوی داوەتە پاڵ خاوەنەکەی، بە وشەی تاك (مفرد) باسی کردووە و لە بابەتەکانی تریشدا بە هەمان شێوەیە و تەنانەت لە بابەتێکیشدا وشە و بێژە گەلێکی وەك (نفوسك)و (نفوسه)و (انفسك) و (انفسه)ی نەهێناوە و ئەگەر بە شێوەی کۆ هاتبێ وەك: ﴿وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ﴾ سوورەتی تەکویر ٧.

واتە: کاتێك گیانی هەر کەس دەگەڕێتەوە بۆ لاشەی و جووت دەبێتەوە لەگەڵی دا. مەبەست لەوە تەواوی نەفسەکانە.

ئەگەر بە شێوەی کۆش هاتبێ، زیادکراوە بۆ کۆمەڵە (واتە کۆمەڵێ کەس، وەرگێڕی کورد) واتە نەفسەکانی ئەوان یا نەفسەکانی ئێوە. بە هەمان شێوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: **((انما انفسنا بيد الله))**[15].

واتە: نەفسەکانی ئێمە تەنیا لە ژێر دەسەڵاتی پەروەردگاردان.

ئەگەر هەر مرۆڤێ بە تەنیا خاوەنی سێ نەفس بووایە تەنانەت ئەگەر لە یەك بارەشەوە بووبێ. پەروەردگار ئەوی بە شێوەی کۆ بۆ تاك زیاد دەکرد.

---

[15] لە فەرموودەی ئیمامی موسلیمە، کە بە ژمارە (٦٨٠) گێڕاوییەتەوە.

## تەوەری دووەم: نیشانە و خەسڵەتی نەفسەکان

### نەفسی موتمەئینە:

هەرکاتێ نەفس لە دیوان و بارەگای مەزن و گەورەی پەروەردگاردا ئامادەبێ، وە بە یادکردن و ستایش کردنی خوای گەورە ئاسوودە بێ و ڕوو لە ئەو بکات و تامەزرۆی بینینی ئەو بێت و هۆگری نزیکی ئەو بێت، ئەم جۆرە نەفسە (نەفسی موتمەئینە)یە. ئەمە هەمان ئەو نەفسەیە کە لە کاتی مردندا پێی دەوترێت: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً﴾ سوورەتی فەجر ٢٧ – ٢٨.

واتە: شایەنی باسە بە ئیمانداری سەرفراز دەوترێت لە سەرەمەرگدا ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی، ئەی ئادەمیزای ژیر و هۆشمەند کە لە تەمەنی کۆتایی دونیادا پەروەردگارت ناسی و بەجوانی دەتپەرست، بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆ ڕازییە.

ئیبن عەبباس دەڵێت: ((نەفسی موتمەئینە)) بە واتای نەفسی ڕاستگۆیە.

قەتادده دەڵێت: نەفسی موتمەئینە نەفسی باوەڕدارێکە کە بە بەڵێنەکانی پەروەردگار ئیمانو دڵنیایی و ئاسوودەیی هەیە.

موجاهید دەڵێ: نەفسی موتمەئینە نەفسێکی ملکەچ و لەخواترسە، کە بڕوای بە پەروەردگارییەتی پەروەردگار هەیەو بەوپەڕی مەیل و حەزی خۆیەوە ڕوو دەکاتە گوێڕایەڵی و بەندایەتی پەروەردگارەوە، بڕوای بەوە هەیە کە بە پەروەردگار دەگات.

حەسەن دەڵێت: نەفسی موتمەئینە واتە نەفسێ کە بڕوا و ئیمانی بە قسەکانی پەروەردگار هەیە و دانی پێدا دەنێ و بەڕاستیان دەزانێ.

ڕاستی و دڵنیایی، ئاسوودەیی و ڕاوەستاوەیی بۆ ئەو نەفسەیە کە بە یادکردن و پەیڕەو کردن و ئیمان بە پەروەردگار ئاسوودە دەبێ، ئاسوودەیی و کامەرانی خۆی لە شتێکی تردا نابینێتەوە.

نەفسێ کە بە خۆشەویستی بەندایەتی کردن و پەیڕەوی کردن لە فەرمانەکان و دوور کەوتنەوە لە نەهیەکانی پەروەردگار و حەز بە بینینی ئەو و دانان بە ڕاستییەتی‌و حەقیقەتی ناو و سیفەتەکانی پەروەردگار ڕووی هێناوە و دڵنیایی و ئاسوودەیی و کامەرانی پەیدا کردووە، بەردەوام بەدوای بەدەست هێنانی خۆش بەختی و کامەرانی پەروەردگارەوەیە، ئیسلامی وەك ئایین و حەزرەتی موحەممەدیشی (صلی الله علیه وسلم) وەك پێغەمبەر و نێردراوی پەروەردگار هەڵبژاردووە، ئیمان و باوەڕی پەیدا کردووە بە قەزا و قەدەری پەروەردگار و بەس بوونی خوداوەند لە لێپرسینەوە و ئاگا لێبوون و چاودێری کردن ئیمان و باوەڕی هەیە.

بڕوای بەم ڕاستی و حەقیقەتە هەیە کە: (ڕەب و ئیلاە و پەرستراو و خاوەن و یارمەتیدەر)) و خاوەنی تەواوی کاروبار و سەرچاوەی ئەو کە تەنانەت بۆ چاو تروکانێکیش لێی بێ نیاز نییە، پەروەردگاری تەنیای بێ هاوتا و خولقێنەری بیسەر و بینەر و بە ئاگایە.

## نەفسی ئەممارە:

نەفسی ئەممارە: نەفسێکی ملهوڕ و یاخی و زۆر بڕیار دەرە بە نافەرمانی و خۆ نە پاراستن و پارێزکردن، لە بەرامبەر نەفسی ((موتمەئینە))دا جێگیرە، نەفسی ئەممارە بڕیار دەدات بەسەر خاوەنەکەی بە تەواوی ئەو شتانەی کە خۆی حەزی لێ دەکات و هانی دەدات بۆ پەیڕەوی کردن لە ناحەقی و باتڵ و ڕۆیشتن بەدوای ڕاکێشانە ناڕەواکاندا.

نەفسی ئەممارە کانگە و سەرچاوەی تەواوی خراپی و بەدکارییەکانە، ئەگەر مرۆڤ پەیڕەوی لێ بکات ئەوا ڕێنموونی دەکات بۆ دەست پێکردنی تەواوی ناپەسەندی و ناڕەوا و خراپەکارییەکان.

پەروردگاری بە دەسەلآت لە بارەی ئەو نەفسەوە سیفەت و تایبەتمەندی (الامـارة بالسوء) واتە زۆر بڕیار دەر بۆ خراپە و بەدکاری هێناوە، نەك (أمر)و تەنیا بڕیاردەر،

چونکە سروشتی نەفس هەر ئەم بڕیاردان و پلان و تەڵەکە بازییەیە، مەگەر کەسێ توانیبێتی ئەو نەفسەی پاك و خاوێن کردبێتەوە، لەم کاتەدایە کە ئەو بانگ دەکات بۆ لای خێر و چاکە، ئەمەش لە بەخششی ڕەحمەت و میهرەبانی و ڕێنموونی پەروەردگارە، چونکە لە بنچینەدا کاری نەفس ڕاکێشانی مرۆڤە بەرەو لای گۆمی تاوان و گۆلاوی بۆگەن و گەندەلانی سەرپێچی و گوناح.

نەفس لە بنچینەدا زاڵم و نەزان و نەفام و درووست کراوە، وە دادگەری و زانست و خواناسی و دینداری بۆی لە ڕێگەی پەیامی پەروەردگار و ڕێنموونی خولقێنەرەوە لە ڕێگەی دەرباز بوونیدا جێگیرە، بەڵام ئەگەر ڕێگەی گەشەکردن، بەرز بوونەوە و پاکی و خاوێن کردنەوەی پێ نیشان نەدەدا، هەر بەو جۆر و چەشنە لە سەر زوڵم وستەم و نەزانی و نەفامی دەمایەوە.

هۆکاری بنچینەیی و ئەساسی بانگ کردنی بەرفراوان و بەردەوامی نەفس بۆ نافەرمانی پەروەردگار سەرچاوەکەی لە ستەمکاری و نەزانی و نەفامییەوەیەتی. ئەگەر گەورەیی و مەزنی، ڕەحمەت و میهرەبانی و ڕێنموونی پەروەردگار نەدەبوو تەنانەت یەك کەسیش نەیدەتوانی نەفسی خۆی پاك و خاوێن بکاتەوە.

هەرکاتێ پەروەردگار ویستی خێر و چاکەی پێ بفەرمووێ، ئاگایی و وریایی و ویست و ئیرادەی ئەو بۆ (چاکسازی و پاك کردنەوە) بەهێز دەکات، وە هەرکاتێ سەبارەت بەو لەم جۆرە ویست و خواستەی نەبێت، بە هەمان دۆخی ستەمکاری و نەزانی و نەفامییەی خۆی کە لەسەر ئەو بنچینە و بناغەیە درووستکراوە دەهێڵێتەوە. (کە واتە دەتوانین بڵێین ڕێنموونی پەروەردگار بۆ بەندەکانی خۆی و خستنە سەر ڕێی ڕاست و پڕ لە بەختەوەری و کامەرانی، گەورەترین بەخششی پەروەردگارە، وە ڕێنموونیش بەدەست خودی پەروەردگارەوەیە و بە هەر کەسێ بیبەخشێ دەیدات، بەبێ لەبەرچاوگرتنی پلە و پایەی کۆمەڵایەتی ئەو کەسە و ئاستی زیرەکی و زانیاری.وەرگێڕی کورد).

هۆكاری ستەم و زۆرداری، یا نەزانینـە، یـا قبـووڵ نـەكردنی حـەق و ڕاسـتییە، كـە ئەمەش لە بنچینەدا بۆ نەفامی و نەزانی دەگەڕێتەوە، قبووڵ نەكردنی حـەق و ڕاسـتی، پێویـستی نـەفامی و نەزانییـە، بۆیـە بڕیـاردانی فراوانـی ئـەو و نـاڕەوایی، پێویـستی و بەشێكە لە سروشـتی ئـەو مەگـەر ئـەوە كـەوا بكەوێتـە بـەر ڕەحمـەت و میهرەبـانی و ڕێنموونی پەروەردگارەوە، بەم جۆرە بەدیار دەكەوێت كە: پێویستی پـەیڕەوی كردنـی مرۆڤ لە (پەرستراوی تاك و تەنیا)ی خـۆی، بـە سـەر هـەر پێویستییەكی تـردا شـیاو و شـایانی بـەراورد كـردن و هەڵسەنگاندن نییـەو ئەگـەر پـەروەردگار لـە ئەنـدازەی چـاو تروكـانێ ڕەحمـەت و میهرەبـانی و یارمـەتی و هاوكـاری و ڕێنمـوونی خـۆی لێ درێغـی بكات، چارەنووس و ئاكامێكی جگە لە لەناوچوون و فەوتان نابێ.

## نەفسی لەووامە:

لە بارەی ڕەگ و ڕیشەی ئەم وشەیە كـە ئایا لـە (تلوم) بـە واتـای حـاڵ بـە حـاڵی گۆڕان و ئاڵ و گۆڕی چۆنییەت و یا (اللوم) بـە واتـای تانـە و تـوانج و لۆمەكردنـە، ڕا و بۆچوونی جیاواز هەیە.

وتەی زانایانی سەلەف لە دەورووبەری سنووری ئەم دوو واتایانەدا جێگیرن.

سعید كوڕی جبیـر دەڵێ: ((وتم بە ئـیبن عـەبباس: واتـای لەووامـە چـییە..؟ وتـی: لەووامە سیفەت و تایبەتمەندی نەفسی لۆمەكەرە)).

موجاهید دەڵێ: نەفسی لەووامە نەفسێكە كە بەهۆی ئـەو شـتانەی كـە لـە دەسـتی داوە تووشی پەشیمانی بووبێ و خۆی بخاتە بەر لۆمە و سەرزەنشت كردنەوە.

قەتتادە دەڵێ: نەفسی لەووامە نەفسێكە كە هەندێ جار بـەدوای شـەڕ و خراپـەدا و هەندێ جاریش بەدوای خێر و چاكەدا، ویست و ئارەزوو پەیدا دەكات.

عەتا لە ئیبن عەبباسەوە گێڕاوییەتییەوە كە: ((لە ڕۆژی دوایی دا تەواوی نەفسەكان خۆیان سەر كۆنە و لۆمە دەكەن، مرۆڤی چاك بەهۆی ئەوەی كە كاری چاكەی زیـاتری ئەنجام نەداوە و توێشووی چاكەكانی زیاتر نەكردووە و مرۆڤی بەدكار و خـراپیش بـە

هۆی ئەوەی کەوا تا کۆتایی تەمەنی لەسەر کاری خراپە بەردەوام بووە و دەستی لە خراپەکاری نەکێشاوەتەوە، هەرکامێ لەوان خۆیان دەخەنە بەر لۆمە و سەرزەنشتەوە)).

حەسەنیش دەڵێ: سوێند بە پەروەردگار، نەفسی باوەڕدار لە هەر بارودۆخێکدا لۆمە و سەر کۆنەی خۆی دەکات، وە لە بارەی ئەرك و بەرپرسیارییەتی و کارەکانییەوە خۆی بە کەمتەر خەم و تاوانبار دەزانێ، بەڵام مرۆڤی تاوانبار و خراپەکار درێژە بە خراپەکاری خۆی دەدات و بەهیچ جۆرێ سەرزەنشت و لۆمەی خۆی ناکات.

ئەوەی باس کرا بیر و بۆچوونی کەسانێ بوو کە بۆچوونی ئەوان لەسەر چۆنییەتی لێك بوونەوە و جیابوونەوەی وشەی (لوامە) لە (لوم)و تان و توانج بوو.

بەڵام کەسانێکی تر (لوامە)یان بە هۆی تێکەڵاو بوون و گۆڕانی هەمیشەیی و ناسەقامگیری و نەمانەوەی لەسەر یەك بارودۆخ، لە ڕەگ و ڕیشەی (تلوم)ی دەزانن.

بە ڕووالەت واتای لەبەر چاوگیراوی دەستەی یەکەم و چاکتر و دیارە، چونکە ئەگەر لەووامە بە واتای گۆڕینەر بووایە، دەبووایە لە بری ئەو (متلومە) وەك: (متلونە ومترددە) دەوترا. بەڵام ئەم واتایە بەشێکە لە پێویستییەکانی واتای یەکەم. چونکە بە هۆی گۆڕان و تێکەڵاو بوون و ناسەقامگیرییەوە تووشی کار گەلێکی ناڕەوا دەبێت، وە دواتر خۆی دەخاتە بەر لۆمە و سەرزەنشتەوە، واتە گۆڕان و ئاڵ و گۆڕی چۆنییەت لە پێویستییەکانی، پەشیمانی و گەڕانەوە و تەلەوومە.

## گۆڕانکارییەکانی نەفس:

نەفسی ئادەمی هەندێ جار ئەممارە، هەندێ جار لەووامە و هەندێ جاریش موتمەئینەیە، تەنانەت لەوانەیەشە بە درێژی شەو و ڕۆژ هەر کاتژمێرە و لە سەر بارودۆخێ بێت، وە بڕیار و فەرمان لە بارەیانەوە پەیوەستە بە سەرکەوتن و زیاتر بوونی یەکێ لەوانە.

– وەسفکردنی ئەو بە موتمەئینە جۆرێ پێ هەڵوتن و پێهەڵنانە.

– وەسفکردنی ئەو بە ئەممارە، جۆرێ لە بچووك کردنەوە و هەتك کردنە.

– وە وەسف کردنی ئەو بە لەووامە، هەم خاوەنی ستایش کردن و هەمیش خاوەنی پاش ملەو پشت ملەیە، بە ڕووتێکردن بەبابەتێ کە بەهۆی ئەوەوە خۆی دەخاتە بەر لۆمەو توانجەوە.

(سەبارەت بە خودی نەفس دەتوانین بڵێین کەوا دەبێ بەپشت بەستن بە پەروەردگار و داوای یارمەتی و هاوکاری کردن لێی، هەوڵ بدەین کەوا لەغاوی نەفسی خۆمان بکەین و تێبکۆشین خۆمان زاڵ و سەرکەوتوو بکەین بەسەریدا، مەبادا بەرەو تاوان و نوغرۆ بوونمان ببات. هەروەك پێغەمبەر (صلى الله عليە وسلم) فەرموویەتی: جیهاد و تێکۆشان لەگەڵ نەفسدا گەورەترین جیهادو تێکۆشانە. وەرگێڕی کورد).

## تەوەری سێیەم: چارەسەری نەخۆشی دڵ، لە ڕێگەی لێپرسینەوەی نەفسەوە

### چارەسەری نەخۆشی دڵ:

مەبەست لە چارەسەری دڵ، چارەسەر و دەرمان کردنی نەخۆشی تێشکانی ئەوە لە ڕێگەی نەفسی ئەممارەوە، چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە دەروونییە لە دوو ڕێگەوە گونجاو و شیاوە:

١. لێپرسینەوە و موحاسەبە کردن.

٢. بەرهەڵستی و دژایەتی کردن.

چونکە کەمتەرخەمی و بێ ئاگایی لە موحاسەبە و لێپرسینەوەی نەفس و هاودەنگی و هاوڕێ بوون و پەیڕەوی کردن لە فەرمانەکانی، بوار و زەمینەی مردنی مەعنەوی دڵ فەراهەم دەکات.

له فەرموودەیەکدا کە ئیمامی ئەحمەد بەڵێنێکی تری لە حەدیس زانان لە شەدادی کوڕی ئەوس گێڕاوییانەتەوە، هاتووە کە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((**الكيّس من دان نفسه وعمل لما بعد الموت، والعاجز من اتبع نفسه هواها، وتمنى على الله**)).[١٦]

واتە: مرۆڤی زیرەك و هۆشیار و وریا، کەسێکە کە نەفسی خۆی لۆمە و موحاسەبە و لەغاو بکات و جڵەوی بگرێ و بۆ دوای مردنی کار بکات و تێ بکۆشێ، وە مرۆڤی لاواز و بێ توانا کەسێکە، کە لە هەوا و ئارەزووەکانی نەفس پەیڕەوی بکات و بە (لێبوردن و بەخشینی) پەروەردگار ئومێدەوار بێت.

## قسەی پێشینان لەبارەی موحاسەبەکردنی نەفسەوە:

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (خوای لێ ڕازی بێت) گێڕاوییەتەوە کە وتوویەتی: ((**حاسبوا أنفسكم قبل أن تحاسبوا، وزنوا أنفسكم قبل أن توزنوا، فإنه أهونعليكم من الحساب غداً أن تحاسبوا اليوم وتزينوا للعرض الأكبر يومئذ تعرضون لاتخفى منكم خافية**)).

واتە: پێش ئەوەی کە لێتان بپرسنەوە، لە نەفسی خۆتان بپرسنەوە! وە پێش ئەوەی بتان پێون و هەڵتان سەنگێنن، خۆتان هەڵ بسەنگێنن! ئەگەر ئەمڕۆ بارودۆخی خۆتان بخەنە بەر لێپرسینەوە و لێکدانەوە، لێپرسینەوەی سبەینێ و دواڕۆژتان ئاسانتر دەبێ، وە خۆتان بۆ کۆڕ و کۆنگرەی ڕۆژێکی گەورە (قیامەت) بڕازێننەوە! لەو ڕۆژەدا بوونتان دەبێ و هیچ شتێکتان لێ شاراوە و نادیار نابێت.

هەروەها لە ئیمام حەسەن (خوای لێ ڕازی بێت) گێڕاوییانەتەوە کە: ((هیچ مرۆڤێکی ئەهلی ئیمان و باوەڕ پەیدا ناکەیت کە لە نەفسی خۆی نەپرسیتەوە و موحاسەبەی نەکات و لە خۆی نەپرسێ کە بۆچی وام وتووە؟ بەڵام مرۆڤی ئەهلی

---

١٦ اخرجه الترمذي (٢٤٥٩) وابن ماجه (٤٢٦).

تاوان و خراپەکاری بە بێ ئەوەی کە خۆی بخاتە بەر پرسیار و لێپرسینەوەوە، درێژە بە رێگەی گومڕایی و بە هەڵە چوونی خۆی دەدات)).

قەتاددە سەبارەت بەم فەرموودەیەی پەروەردگار: ﴿وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا﴾ سوورەتی کەهف ٢٨.

واتە: بەگوێی ئەو جۆرە کەسە مەکە کە دڵیمان غافڵ کردووە لەیادی خۆمان (بەهۆی دونیا پەرستییەوە) شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتووە و هەرچی کاروباری هەیە بێ سەر و بنە و لەسنوور دەرچووە.

وتوویەتی کە: واتە نەفسی خۆی لەناو بردووە و هەڵخەڵەتاوە و لە هەمان کاتیشدا دین و ئایینی خۆی لە دەست داوە و هەردوو دەستی دونیای بەسراوە.

حەسەن (خوای لێ ڕازی بێت) وتوویەتی: ((ئەگەر مرۆڤێ خاوەنی ئامۆژگاری و ئامۆژیاری دەروونی بێت، لە خێر و چاکە و سەلامەتی دا دەمێنێتەوە. بە هەوڵ و ویستێکی تەواو موحاسەبە و لێپرسینەوەی خۆی فەرامۆش و لەیاد ناکات)).

مەیمونی کوڕی مهران وتوویەتی: بە ڕاستی مرۆڤ تەنیا کاتێ پارێزکردن و دووری کردن دەکاتە پیشەی خۆی کە بە هەمان شێوە شەریکی نا ئەهلی خۆی دەخاتە بەردەم موحاسەبە و لێپرسینەوە، نەفسی خۆشی دەخاتە بەر پرسیار کردن و لێپرسینەوەوە. بە هۆی ئەمەوەیە کە وتراوە: نەفس وەك شەریك و هاوڕێی ناپاك و دەست بڕ و دەم پیس وایە، ئەگەر ئاگاداری نەبیت و ئاگات لێی نەبێت سەروەت و سامانت حەیف و مەیل دەکات.

هەروەها مەیموونی کوڕی مهران وتوویەتی: ((مرۆڤی لە خوا ترس و خۆ پارێز زیاتر لەوەی کە چاودێر و ئێشکچی زۆری حاکمێکی ستەمکار و شەریك و هاودەمی خراپەکاری بێ، لێپرسینەوە لە نەفسی خۆی دەکات)).

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە وەهب دەگێڕێتەوە کە: ((لە نووسراو و نامەی ئالی داودا هاتووە: حەق ئەوەیە کە مرۆڤی ژیر و عاقڵ لە چوار کاتژمێر لە ژیانی خۆیدا بێ ئاگا و نائاگا نەبێت:

– کاتژمێرێك تەرخان بکات بۆ سەر قاڵ بوون بە یاد و ستایشی پەروەردگارەوە.

– کاتژمێرێك دابنێت کە تیایدا موحاسەبە و لێپرسینەوە لە نەفسی خۆی بکات.

– کاتژمێرێك تەرخان بکات کە لە گەڵ دۆستان و هاوڕێ دڵسۆز و ڕاستگۆکانیدا کەم و کوڕی و لاوازییەکانیان بۆ یەکتر باس بکەن، بە مەبەستی چارەسەر و چاکسازی کردنیان.

– کاتژمێرێك دیاری بکات بۆ ئەوەی تیایدا تەواوی خۆشییەکانی و کاروبارە ویستراوەکانی نەفسی خۆی بەجێ بهێڵێ، چونکە ئەم کارە لەم کاتژمێرەدا هاوکاری دەکات بۆ بە کردەیی کردنی هەستان بە جێ بەجێ کردنی ئەو سێ بابەتەی پێشوو و بۆ دڵی ئەو بە جۆرێك لە گەڕان و گەشت و گوزار دەژمێردرێ و حیسابی بۆ دەکرێت)).[١٧]

دەڵێن: ئەحنەف کوڕی قەیس هەندێك جار لە چرایەك نزیك دەبوویەوە و پەنجەی خۆی دەخستە سەر گڕ و کڵپەی چراکە و بەخۆی دەوت: ((ئەی حونەیف سزای ئاگر بچێژە! بۆچی فلان ڕۆژ تووشی فلان تاوان بووی؟ بۆچی فلان ڕۆژ فلان تاوان و گوناحت کرد؟))

حەزرەتی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) لە نامەیەکی دا بۆ یەکێ لە کارگوزارەکانی خۆی وە بیری دەخاتەوە کە: ((لەدۆخی خۆشی و سەلامەتی و تەندروستی و پێش ئەوەی ڕووبەڕووی بارودۆخی سەخت و ناڕەحەت ببیتەوە، نەفسی خۆت موحاسەبە بکەو لێی بپرسەوە، چونکە هەرکەسێ لە بارودۆخی ئاسوودەیی دا و پێش هاتنی بارودۆخی سەخت و گران نەفسی خۆی موحاسەبە بکات، بارودۆخی باش دەبێت و

---

١٧ رواه ابو حاتم وابن حبان مرفوعا.

خـەڵكانى تـر بـەخيلى و ڕژدى پـێ دەبـەن. بـەڵام هەركەسـێ ژيـانى دونيـا و هـەوا و ئارەزووى لە موحاسەبە و لێپرسينەوەى نەفس دوورى بخاتەوە و دواى بخات، تووشـى پەشيمانى و پاشگەز بوونەوە و لەناو چوون دەبێ)).

ئيمـامى حەسـەن (خـواى لێ ڕازى بێـت) دەفـەرمووێت: ((مرۆڤـى ئـەهلى ئيمـان بـە وردى‌و بە سەختى ئاگاى لە نەفسى خۆيەتى و چاودێرى دەكات. لـە پێنـاو ڕەزامەنـدى پـەروەردگاردا دەيخاتـە بـەر لێپرسـينەوە و موحاسـەبە كردنـەوە، لـە دواڕۆژدا بـانگ كردن‌و لێپرسينەوەى كەسانێ ئاسان دەبێ، كە لە دونيادا نەفسى خۆيانيـان خـستبێتە بەر لێپرسينەوە و سەرزەنشت كردنەوە.

هەركاتێ مرۆڤى ئەهلى ئيمان ڕووبەڕووى شتێكى سەر سوڕهێنەر و خـۆش بوويـەوە دەڵێ: سوێند بەخوا حەزت لێ ئەكەم و پێويستيم پێتە! بەڵام لێت دوور دەكەومـەوە و هيچ كاتێ لەبەر خاترى تۆ نا فەرمانى پەروەردگارم ناكەم.

بـەڵام هـەركاتێ سـەبارەت بـە كەمتەرخـەمى خـۆى بەرامبـەر بـە نەفـسى بگـەڕێ و پێداچوونەوە بكات دەڵێ: بۆچى وام كرد؟ چيمە بەسەر ئەم كارانـەوە؟ سـوێند بـەخوا جارێكى تر ناگەڕێمەوە بۆ سەر ئەم كارە!

ئـەهلى ئيمـان ئەوانـەن كـە قورئـانى پـيرۆز دەسـتيانى گرتـووە و لـە تياچـوونن پاراستوونى.

ئەهلى بـاوەڕ لـەم جيهانـەدا خۆيـان وەك ئـەو بەنـد كراوانـە دەزانـن كـە هەميـشە و بەردەوام لە ئەنديشە و بيرى ئازادى و ڕزگارى خۆياندان.

بـاوەڕدارانى ڕاسـتەقينە ئـەوانن كـە دڵـەكانيان جگـە بـە يـادو سـتايش و زيكـرى پەروەردگار بە هيچى تر ئاسوودەيى و ئارامى پەيدا ناكات و جگە لـەو بـە شـتێكى تـر پەيوەنددى و خۆشەويستى نييە.

ئەهلى ئيمان هەمان ئەو كەسانەن كە بە دڵنياييـەوە دەزانـن سـەبارەت بـە بيـستن، بينين، وتن و كار و كردەوەى خۆيان دەكەونە بەر لێپرسينەوە و موحاسەبەكردنەوە.

مالکی کوڕی دینار دەڵێت: ((پەروەردگار، سەبارەت بە کەسێ کە بە نەفسی خۆی دەڵێ: تۆ مەگەر فلان کاری نابەجێ و ناڕەوات ئەنجام نەدا و فلان قسەی خراپ و ناپەسەندت نەوت؟ دواتر لووتی دەگرێ و جڵەوی دەگرێ و بە پەیڕەوی کردن لە قورئان و فەرموودە (کیتاب و سوننەت) ناچار و مەجبووری دەکات و ئیمان و ویست و ئیرادەی خۆی دەکاتە ڕێبەر و ڕێنموونی کەری ئەو)).

## نموونەیەك بۆ چۆنییەتی موحاسەبەکردنی نەفس:

پێشتر نەفسمان بە شەریکێکی بازرگانی متمانە پێ نەکراو (جێ متمانە نەبوون) چوواند، بە هەمان شێوە کە یەکەم: دوای چاودێری کردن و ڕەچاو کردن و ماف و بەرپرسیارییەتی شەریکایەتی لە لایەن شەریکەوەیە، کە ئامانج و مەبەست لە شەریکایەتی کردن بەدەست هێنانی سوودو قازانجە، دێتە دی و دەستەبەر دەبێت، وە لە قۆناغی دووەمدا چاودێری کردن لە دەست بەکاربوون و هەنگاو هەڵگرتنی ئەو و سێیەم هەژمارکردن و دیاری کردنی دەست پێکردن و هەنگاونانەکانی و چوارەمیش بەرگری کردن لە دووبارە بوونەوەی خەوش و ناپاکییەکان کە بە هەڵکەوت تووشی بووە.

نەفسیش بەم جۆرەیە، سەرەتا لە پەیوەندی لە گەڵ پارێزگاری کردن لە ئەندامە حەوت لایەنەکە پارێزگاری کردن لێیان پاراستنی سەرمایەیە و دوای ئەو بەدەست هێنانی قازانج و سوود تەرح دەکرێ، چونکە کەسێ کە خاوەنی سەرمایە نەبێ ئیتر چۆن لە چاوەڕووانی سوود و قازانجدا بێت؟

ئەو ئەندامە حەوت لایەنانە بریتین لە: چاو گوێ، ددان، عەورەت، دەست و پێ[18]، کە ئامراز و هۆکارێکن بۆ بەختەوەری یاخود بەدبەختی (الشقاء، السعادة)، هەرکەسێ لەبارەی پاراستنی ئەوانە کەمتەرخەمی بکات، تووشی کێشە و گرفت گەلێ و

---

١٨ دانەر تەنها ئاماژەی بە شەش دانەیان کردووە.

چارەڕەش گەلێ دەبێ و هەرکەس پارێزگارییان لێ بکات، پارێزگاری لە خێر و چاکە و بەختەوەری خۆی کردووە. لە ڕاستی دا پاراستنی ئەوانە بنەما و بنچینەی تەواو خێر و بەرژەوەندییە و پشت گوێ خستنیشیان بە واتای تووش بوونە بە تەواوی شەڕ و خراپەیەك. پەروەردگاری مەزن و بە توانا دەفەرمووێت: ﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ﴾ سوورەتی نوور ٣٠.

واتە: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە سەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم) هەروەها ناموس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّكَ لَنْ تَخْرِقَ الْأَرْضَ وَلَنْ تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولًا﴾ سوورەتی ئەسرا ٣٧.

واتە: هەروەها بەسەر زەویدا بە کەش و فش و لەخۆبایی بوونەوە مەڕو چونکە تۆ هەرگیز ناتوانیت زەوی کوناودەر بکەیت، ناشگەیتە بەرزی چیاکان (ئیتر ئەم کەشخە و شانازییەت لە چییە)..؟

لە لایەکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا﴾ سوورەتی ئەسرا ٣٦.

واتە: (ئەی ئینسان) لە شتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەکەوە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بە ڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی، بەرپرسیارە لە بەرامبەرییەوە.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَقُلْ لِعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ سوورەتی ئەسرا ٥٣.

واتە: ئۆە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە بەندەکانم بڵێ: چاکترین گوفتار بڵێن (جوانترین گوفتار بنووسن).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا﴾ سوورەتی ئەحزاب ٧٠.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و پارێزکار بن، هەمیشە قسەی بەجێ و بەسوود بکەن.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ﴾ سوورەتی حەشر ١٨.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، خواناس و پارێزکار بن و لە سنوورەکانی خوا مەترازێن، با هەموو کەسێ سەرنج بدات و بزانێ چی بۆ سبەی دەست پێشخەری کردووە.

ئەگەر مرۆڤ سەبارەت بە نەفسی خۆی لە بارەی چۆنییەتی کەڵك وەرگرتن لە ئەندامەکانی توند بێ و بە سەختی لە نەفسی بپرسێتەوە سەبارەت بە چۆنییەتی بەکارهێنانی ئەندامەکانی، دەچێتە نێو قۆناغی چاودێری و پارێزگاری کردن کە بە هیچ شێوەیەك نابێ دەست بەکاربوونی نەفس لەبارەی کەڵك وەرگرتن لە ئەندامەکان پشتگوێ بخات، هەتا زیاتر لە چاودێری کردنیان بێ ئاگا بێ، نەفسیش زیاتر تووشی لادان و خەوش و ناپاکی دەبێتەوە و سەردەکێشێ بۆ لەناو بردنی دڵ و ئەندامەکان. بە هەر جۆرێ کەسێ کە هەستی بە کەم و کوڕی و قازانج و بەرژەوەندی مەعنەوی کرد، دەبێ بچێتە نێو قۆناغی موحاسەبە کردن و لێپرسینەوەی نەفسەوە.

دوای لێپرسینەوە و موحاسەبەکردنەوەیە کە ڕاستی و حەقیقەتی سوود و قازانج و زەرەر و زیانی لەلا ڕوون و ئاشکرا دەبێتەوە، هەرکاتێ سەبارەت بە زیان و خراپە دڵنیایی پەیدا کرد، بە هەمان شێوە کە شەریکی تاوانبار دەبێ ئەو خەوش و ناپاکییەی کە پەیدا بووە، قەرەبووی بکاتەوە و لە داهاتووشدا نەفس ناچار و مەجبوور بکات بە ئەمانەت داری و پارێزگاری و چاودێری کردن.

بەڵام نابێ لە بیرمان بچێ کە سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوەی شەریکایەتی لە گەڵ نەفسدا، مرۆڤ خاوەنی سەربەستی و ئازادی نییە و (اختیار بەدەست خۆی نییە)، هیچ ڕێگەیەك بۆ پچڕاندنی تەواوی پەیوەندییەکانی لە گەڵ ئەودا بۆی شیاو و گونجاو نابێ، واتە ناتوانێت نەفسێکی تر بخاتە جێگە و شوێنی ئەو وە لە ئاکامدا تەنیا ڕێگە چارەی ئەو چاودێری کردن و موحاسەبە و لێپرسینەوەیە لێی و دوورکەوتنەوە لە نەزانی و بێ ئاگایی سەبارەت بە دەست بەکاری و هەڵس و کەوتەکانی نەفس.

## ئەوەی کە کاری موحاسەبەکردنی نەفس ئاسان دەکات:

یەکێ لەو کاروبارانەی کە لە موحاسەبەکردن و چاودێری کردنی نەفسدا هاوکاریو هاریکاری مرۆڤ دەکات، ئەمە ناسین و ئاشنایەتی یە، کە ئەگەر تاکو زیاتر لە ژیانی دونیادا خەریکی چاودێری کردن و پاراستن و لێپرسینەوەی نەفسدا بێ، زیاتر خۆی لە بەختەوەری و کامەرانی و ئاسایش و ئارامی نزیک دەکاتەوە، وە ئەگەر ئەمڕۆ موحاسەبەکردنی نەفس لە ئەستۆی خودی خۆیدایە لێی بێ ئاگا نەبێ، سبەینێ کە کاری لێپرسینەوە کەوتە دەست پەروەردگار، ئاسوودە دەبێ، بەڵام بە هەر ئەندازەیەك ئەمڕۆ لێی بێ ئاگا بێت، دواڕۆژ کارەکەی لەسەر سەخت ترو قورستر دەبێ.

هەروەها ئاگایی و شارەزایی لەم بابەتەدا کە قازانجەکەی سەوداگەرای و بازرگانی و گەیشتنە بە بەختەوەری هەمیشەیی لە بەهەشتدا و سەیرکردنی پەروەردگاری میهرەبانە، وە زەرەر و زیانەکەیشی چوونە ناو دۆزەخ و بێ بەش بوونە لە بینینی پەروەردگاری. ئەگەر کەسێ لەم بارەیەوە ئیمان و دڵنیایی هەبێ، موحاسەبە و لێپرسینەوەی نەفسی خۆی لە ژیانی ئەم دونیایەدا بەلایەوە ئاسان دەبێ.

حەق وایە کە مرۆڤەکانی ئەهلی ئیمان، ویست و ئیرادەی کە بە دونیای دوای مردن باوەڕ و یەقینیان هەیە لە موحاسەبەکردن و چاودێری کردنی نەفسی خۆیان بێ ئاگا نەبن و تەواوی جووڵە و دانیشتنەکان و هەنگاو هەڵگرتنەکانیان بخەنە ژێر چاودێری کردن و کۆنترۆڵ کردنێکی توندی خۆیانەوە.

هەر ساتێ لە ساتەکانی تەمەن گەوهەرێکی بەنرخە کە دەتوانین بەهۆی ئەوانەوە، ماڵە پڕ لە ناز و نیعمەتەکان و بەردەوامەکانی بەهەشتی پێ بکڕین.

بە هەدەر دان و بە فیڕۆ دانی ساتەکانی تەمەن یاخود کڕین و فرۆشتن و سەوداگەرییان لە بەرامبەر شت هاتێك کە جگە لە زەرەر و زیان، لەناو بردن و تیاچوون، هیچ شوێنهات و دەست کەوتێکیان نییە، تەنیا کاری نەزان ترین، گەمژە

ترینــی مرۆڤەکانــە، وە تــەنیا لــە ڕۆژی (تغــابن)و پەشــیمانی دایــە کــە هەســت بــەم حەقیقەتو ڕاستییە ئەکەن.

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِنْ سُوءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ أَمَدًا بَعِيدًا وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ﴾ سوورەتی ئالی عیمران ٣٠.

واتە: ڕۆژێك دێت هەموو کەس، کار و کردەوەکانی خۆی دەبینێت ئامادەکراون بە خێر و شەڕییەوە، تاوانبار ئاوات دەخوازێ کە لە نێوان خۆیی و کردەوە خراپەکانی دا مەودایەکی دوور و درێژ هەبووایە، خوای گەورەش بێدارتان دەکاتەوە بە سیفەتی تۆڵە سەندنەوەی خۆی دەتان ترسێنێت (لەوەی کە کاری ناڕەوا بکەن)و خوا بە سۆز و بە بەزەییە بۆ ئەو بەندانەی (کە بەم ئاگادارییانە دڵیان ڕادەچڵەکێت پێش هاتنی ئەو ڕۆژە).

## تەوەری چوارەم: لێپرسینەوەی نەفس

موحاسەبە و لێپرسینەوەی نەفس دوو جۆرە: جۆری پێش کردەوە (ئەنجامدانی کارەکە)و جۆری دوای ئەو (دوای ئەنجامدانی کارەکە).

### موحاسەبەکردنی نەفس پێش کردەوە و دەست بەکاربوون:

حەق وایە کە مرۆڤ پێش ئیرادە و بڕیاردان بۆ ئەنجامدانی کارێ، تەواوی لایەنەکانی ئەو کارە لەبەرچاو بگرێ و هەرکاتێ ئەنجامنەدانی بەلاوە باشتر بوو لە ئەنجام دانیو بە کردەیی کردنی، هەنگاوی بۆ هەڵبگرێ و ئەنجامی بدات.

حەسەنی بەسری (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: کەسێ کە لە کاتی بڕیار دانی بۆ ئەنجامدانی کارێ تەواوی لایەنەکانی ئەو کارە لەبەرچاو بگرێ، وە دواتر ئەگەر بۆ پەروەردگار و ڕەزامەندی خوداوەند بێ، ئەنجامی بدات، وە بە پێچەوانەوە گەر وازی لێ بهێنێ، پەروەردگار دەیخاتە بەر ڕەحمەت و میهرەبانی خۆیەوە)).

هەندێ ئەم قسەیەی ئەویان لێکداوەتەوە و وتوویانە: هەرکاتێ نەفس بۆ ئەنجامدانی کارێ دەستی خستە پێش و لە ئەنجام دانیدا دەست پێشخەری کرد و مرۆڤیش ویستی بکات، پێویستە پێش ئەوەی پێی هەڵبستێ و هەنگاوی بۆ هەڵبگرێ بە مەبەستی جێ بەجێ کردنی لەبارەیەوە بیر بکاتەوە و لێکی بداتەوە، کە ئایا ئەو کارە لە ئاست توانایی ئەودایە یاخود نا؟ ئەگەر لە ئاست توانای دا نەبوو پێی هەڵنەستێ و ئەنجامی نەدات.

ئەگەر لە ئاست توانایی ئەودا بوو خۆڕاگر بێت و لەبارەیەوە بیر بکاتەوە و شی بکاتەوە، کە ئایا ئەنجامدان و کردەیی کردنی بۆ ئەو باشترە یاخود جێ بەجێ نەکردن و کردەیی نەکردنی؟

ئەگەر ئەنجام نەدانی ئەو کارە بۆ ئەو باشتر بوو خۆی لێ دوور بخاتەوە و ئەنجامی نەدات.

ئەگەر بیری کردەوە و لێکیدایەوە کە هەنگاو نان و دەست بەکار بوونی باشترە بۆی، بۆ جاری سێیەم پێویستە. لەبارەیەوە بیر بکاتەوە کە ئایا هۆکاری ئەو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگار و پاداشتی دوارۆژە، یا ئامانجی ئەو بەدەست هێنانی پلە و پایە، ماڵ و سامان و بەدەست هێنانی شۆرەت و ناودارییە لە نێو خەڵکی دا؟

ئەگەر ئامانجی ئەو مەسەلەی دووەم بوو لەدەست بەکاربوونی دەست بەردابێ و خۆی لێ دوور بخاتەوە (ئەنجامی نەدات)، هەرچەند کە بە ویستی و داخوازییەکەی خۆیشی بکات، تا وەکو نەفسی ئەو تووشی هاوەڵ بڕیاردان نەبێ (شەریك پەیدا کردن) و خووی پێوە نەگرێ، وە کار بۆ غەیری خوا بەلایەوە ئاسان نەبێ، چونکە بە هەر ئەندازەیەك ئەم کارە بەلایەوە ئاسان بێت، کارکردن بۆ پەروەردگار بەلایەوە سەخت و قورس تر دەبێت، وە بە قورس ترین کاری دەزانێ لە سەر خۆی، بۆیە ناتوانێ ئەنجامی بدات، (چونکە دڵ وەك پارچەیەکی سپی پاك وایە و بە هەر تاوان

کردنیّ که نەفس هانمان دەدات بۆ ئەنجام دانی، ئەو پارچە سپییەش (که دڵه) هێدی هێدی ڕەش دەبێتەوە و ئیتر گوناح و تاوانی بەلاوه ئاسان دەبیّ و بەپێچەوانەشەوه ئەنجامدانی کاری خێر و چاکەی بەلاوه قورس و گران دەبیّ و ناتوانیّ ئەنجامی بدات، ئەگەر چی بچووکیش بێت، ئەگەر ئەنجامیشی بدات کەمتەرخەمی تێدا دەکات و تام و چێژ و ئاسوودەییەکی ڕۆحی و دەروونی لیّ نابینیّ، وەرگێڕی کورد).

ئەگەر گەیشتە ئەو ئاکام و ئەنجامەی که کارەکەی بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگار و پاداشتی دواڕۆژه، جارێکی تر خۆڕاگر بێت و ببینیّ و بزانیّ. ئایا ئەگەر پێویستی به هاوکاری و هاریکاری هەبیّ یان نا، ئەگەر پێویستی به هاوکاری و هاریکاری هەیه ئایا یارمەتی دەرانیّ بوونیان هەیه که هاوکاری بکەن یان نا؟

ئەگەر یارمەتی دەر و هاوکار گەلێکی نەدۆزییەوه و پەیدای نەکردن له ئەنجام دان و دەست بەکار بوونی ئەو کاره دووره پەرێزی بکات و خۆی لیّ دوور بخاتەوەو. به هەمان شێوه که پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) له مەککەی پیرۆزدا له جیهاد و تێکۆشان (به واتای ڕووبەڕوونەوەی سەربازی) له گەڵ موشریکەکاندا تاوەکو زەمەنی بەدەست هێنانی توانا و دەسەڵات و دۆزینەوەی دەسیاران و ئاریکاران و یارمەتی دەران (ئەنصار) دووره پەرێزی کردن و خۆی دوور خستەوه.

بەڵام ئەگەر یارمەتی دەر و هاوکاری کەرانێکی دۆزییەوه هەنگاوی بۆ هەڵ بگریّ و دەست بەکار بێت.

تەنیا کەسانیّ سەرکەوتن بەدەست ناهێنن کە یەکیّ لەو بابەتانە ڕەچاو نەکات، بەڵام ئەگەر تەواوی ئەو قۆناغانە لێك بدرێنەوه و تێبینی و سەرنجیان بدریّ، به دڵنیاییەوه لەوکاره سەرکەوتو دەبیّ. ئەوەی باسکراو خرایه ڕوو چوار قۆناغ بوو که پێش دەست بەکاربوونیان و هەر جۆره هەنگاو هاوێژتنیّ دەبیّ لەبارەیانەوه نەفس بخەینه بەر موحاسەبه و لێپرسینەوەوه.

چونکه مەسەلەکە بەو جۆرە نییە کە مرۆڤ هەر کارێ کە بیەوێ بتوانێ ئەنجامی بدات. هەر کارێکی لەدەست هاتن و شیاویش بەجۆرێ نییە کە جێ بەجێ کردنی لە وازهێنانی باشتر بێ. تەواوی کارە چاك و سوودمەندەکانیش کە دەیەوێ ئەنجامی بدات. ئەم جۆرە نییە کە بێگومان لەپێناو ڕەزامەندی پەروەردگاردا بێت.

هەرکارێکیش کە مرۆڤ لە بارەی نیەت پاکی خۆی دڵنیایە بە جۆرێ نییە کە بە بێ هاوکاری و ئاریکاری خەڵکانی تر بتوانێ ئەو کارە کردەیی بکات، وەکو مرۆڤێ کە لە بارەی ئەم کارەوە نەفسی خۆی بخاتە بەر موحاسەبە کردن و لێپرسینەوەوە، بەلایەوە ئاشکرا و بەدیار دەکەوێت کە چ کارێ ئەنجام بدات وله هەنگاو نان و دەست بەکار بوونی چ کار گەلێکیش دوورە پەرێزی بکات و واز بهێنێ.

## موحاسەبەکردنی نەفس دوای کردەوە و دەست بەکاربوون:

جۆری دووەم کە دەگەڕێتەوە بۆ موحاسەبەکردنی نەفس دوای کردەوە و دەست بەکاربوون، خۆی سێ جۆرە:

**یەکەم:** لێپرسینەوەی ئەو (نەفس)ـە لەبارەی پەرستش و کارێکی چاکە کە لە بارەی هەر چ باشتر و سافی و بێ خەوشی ئەنجامدانییەوە کەمتەرخەمی کراوە و بەو جۆرەی کە پێویستە مافی پەروەردگار ڕەچاو نەکراوە و لەبەرچاو نەگیراوە. مافی پەروەردگار لەبارەی پەرستشەوە شەش شتە، کە بریتین لە: (زانست و شارەزایی لە بارەیانەوە، ئامۆژگاری و ئامۆژیاری ڕاستگۆیانەی خەڵکی، پەیڕەوی کردن لەپێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هەر چ باشتر ئەنجام دانی ئەو کارە، وە بیر هێنانەوە بەخششی ڕێنموونی پەروەردگار و ڕووکردنە کەمتەرخەمییەکان سەبارەت بەو کارە.

دەبێت سەبارەت بەمە نەفسی خۆمان بخەینە بەردەم لێپرسینەوە و موحاسەبەکردنەوە کە ئایا ئەو قۆناغانەی بەدرووستی خستووەتە بەر چاودێرییەوە،

وە لەو پەرستشەدا ئەو بابەتانەی (شەش مافەکەی پەروەردگار) ڕەچاو کردوون یان نا؟

**دووەم:** لە نەفسی خۆمان بپرسینەوە و موحاسەبەی بکەین سەبارەت بەو کارانەی کە واز لێ هێنان و دوورکەوتنەوە لێیان لە ئەنجام دان وجیّ بەجیّ کردنیان باشترە.

**سێیەم:** سەبارەت بە هەنگاو نان و دەست بەکار بوون بۆ ئەنجامدانی کار گەلێکی ڕەوا و ڕێگە پێدرا و نەفسی خۆی بخاتە بەر لێپرسینەوە و موحاسەبەکردنەوە کە بۆچی ئەو کارانەی ئەنجامی داون ئایا لەپێناو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگارو پاداشتی دواڕۆژ بووە یاخود نا؟ئەگەر مەبەست و ئامانجێکی چاك و درووستی بووە و کەڵك و قازانجی کردووە و ئەگەر ئامانج و مەبەستی ئەو ماددە و دونیای نا پایەدار بووبێ، ئەو کەڵك و قازانجەی لەدەست داوە.

## زەرەر و زیانەکانی دوورکەوتنەوە لە موحاسەبەکردنی نەفس:

گوێ نەدان و پشتگوێ خستنی لێپرسینەوە و موحاسەبەکردنی نەفس و ئازادکردنی و سەربەخۆ بوون و فەراهەم و ئامادەکردنی کاروبارە نەفسییەکان و چاوپۆشی و کەمتەرخەمی لەگەڵیدا، خراپترین زەرەر و زیانی پێ دەگەیەنێ، وە بواری لەناو چوون و مردنی بۆ فەراهەم دەکات، ئەمە بارودۆخی ئەهلی لە خۆبایی بووەکان‌و هەڵخەڵەتێنراوەکانە کە چاوی خۆیان دەنووقێنن و دایدەخەن بەرامبەر بە ئاکامی نەزانی و لە موحاسەبە و لێپرسینەوەی نەفس و لە گەڵ بارودۆخی ڕۆژانەدا هاوڕێ و هاودەم دەبن، وە بێ ئومێد و بێ هیوا بوون بەرامبەر بە لێبوردن و ڕەحمەت و میهرەبانی پەروەردگار.

هەرکاتێ کەسێ بەو جۆرە بێ، تاوان کردن بەلایەوە ئاسان دەبێ (واتە بە ئاسانی تووشی گوناح و تاوان دەبێ)، وە خووی پێوە دەگرێ (عادەتی پێ دەدات)، وە واز هێنان و دوورکەوتنەوە لە تاوان بەلایەوە قورس و گران دەبێت، بەڵام ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ ژیری و عەقڵ و زانست و تێگەیشتوویی خۆی، دەزانێ کە پاسەوانی و

چاودێری كردن له دەست بەكاری و هەنگاو هەڵگرتنەكانی نەفس لـه ئـازاد كردنـی ئـەو تەنانەت هەندێ جاریش واز هێنـان و دووركەوتنـەوه لـه كاروبـاری ڕەوا و خـوو پێـوه گرتنەكان بۆ ئەو باشتره.

كوڕی ئەبی دونیا دەڵێ: ((پیاوێكی قوڕەیش بۆی دەگێڕامەوه كه ئەو له بەرەبابـو ڕەچەڵەكی تەلحەی كوڕی عوبەیدوڵایه. ئەو دەیوت: كه نوبـه كـوڕی سـەممه لەگونـدی ڕقه (رقه) دەژیا، ئەو خووی بەوه گرتبوو كـه بـه سـەختی نەفـسی خـۆی بخاتـه بـەر موحاسەبه كردن و لێپرسینەوەوه.

ئەو ڕۆژێ سەبارەت بـه تەمـەنی خـۆی بـیری دەكـردەوه و بینـی كـه گەیـشتووەته تەمەنی (٦٠) ساڵ و ژمارەی ڕۆژەكـانی (٢١٦٠٠) ڕۆژه، هـاوارێكی كـردو وتـی: وای بـۆ من! ئەگەر هەر ڕۆژێ تاوانێكم ئەنجام دابێ، هاوكات دەبێ لـه گـەڵ (٢١٦٠٠) تـاوان دا ببرێمه خزمەتی پەروەردگار؟! لەوانەیه له هەر ڕۆژێكدا تاوانێكم ئەنجام دابێ!؟ ئەو له تاو فرەیی پەژاره و دڵتەنگی دا له هۆش خۆی چـوو و كەوتـه سـەر زەوی و ماڵئـاوایی كرد و كۆچی دوایی كرد.

یەكێ دەیوت: خۆزگەم بەو بەختەوەری و كامەرانییەت بـۆ ئـەو هەڵبەزینـەت بـەرەو بەهەشت!)).

## موحاسەبەكردنی نەفس سەبارەت به یەك هەڵوێستی و شوێنكەوتن:

كورتەی ئەم بابەته بەم جۆرەیه كه:

– مرۆڤ لەبارەی بەجێهێنانی ئەركەكانی، نەفسی خۆی بخاتـه بـەر لێپرسینەوەوه. ئەگـەر كـەم و كـوڕی و ناتەواوییـەكی بینـی لـه ڕێگـەی قەرەبووكردنـەوەوه یـاخود چاكسازی گرفتەكانەوه، چارەسەری بكات.

– لەپاڵ ئەوەشدا، سەبارەت به كاروباری حەرام و نـاڕەواوه نەفـسی خـۆی بخاتـه بەردەم موحاسەبەكردن و چاودێرییەوه، هەركاتێ زانی و هەستی بەوه كرد كه كارێكی ناڕەوا و ڕێگه پێنەدراوی – له ڕووی شەریعەتی ئیسلامەوه – ئەنجام داوه، لـه ڕێگـەی

تۆبەکردن و داوای لێبوردن – لە پەروەردگار – وە هەنگاو نان و ئەنجامدانی کارێکی چاك، ئەو کارە – کارە خراپەی کە کردوویەتی یاخود تووشی بووە – قەرەبوو بکاتەوە.

– سەبارەت بە بێ ئاگایی و تەمەڵی کردنییەوە لە بارەی پەروەردگارەوە نەفسی خۆی موحاسەبە بکات و لێی بپرسێتەوە، ئەگەر بەڕاستی سەبارەت بە نەفسی خۆی تووشی بێ ئاگایی و پشت گوێ خستن بووە، بە یادکردن و ڕووکردنە پەروەردگار – ئەو کەمتەرخەمی و بێ ئاگاییە – قەرەبوو بکاتەوە.

– هەروەها سەبارەت بە قسە و لێدوان و هاتووچۆ و بینین و بیستنییەکانییەوە نەفسی بخاتە بەر موحاسەبەکردن و لێپرسینەوەوە، وە لە خۆی بپرسێ کە بە مەبەستی ئەو لەو کارانە – قسە و لێدوان و هاتووچۆ – چی بووە..؟ بۆ چ کەسێ ئەنجامی داون؟ وە بە چ شێوەیەك پێی هەڵساوە و هەنگاوی هەڵگرتووە بۆ جێ بەجێ کردنیان؟

هەروەها لەم بارەیەوە دڵنیا بێ کە بۆ هەر کارو کردەوەیە کە ئەنجامی دەدات دوو دۆسیە (پەروەندە) دەکرێنەوە:

– یەکێ لەو دۆسێیانە سەبارەت بە ئامانج و هۆکاری.

– دووەمیش سەبارەت بە چۆنییەت و چۆنایەتییەوەی.

لە دۆسیەی یەکەمدا لەبارەی (یەك دڵی) واتە (اخلاص)، وە لە دۆسییەی دووەمیشدا سەبارەت بە چۆنییەتی پەیڕەوکردن و ڕێژە و ئەندازەی هاودەنگی قسە و کردەوەیی لەگەڵ شەریعەتدا پرسیاری لێ دەکرێ.

پەروەردگاری بەدەسەڵات دەفەرموێت: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ (٩٢) عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ سوورەتی حەجر ٩٢ – ٩٣.

واتە: سوێند بە پەروەردگارت پرسیار لە هەموویان دەکەین بەگشتی (لە بیرو باوەڕی هەموویان دەکۆڵینەوە)، لەو کارو کردەوانەی کە دەیان کرد.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿فَلَنَسْأَلَنَّ الَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ (٦) فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِمْ بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَائِبِينَ﴾ سوورەتی ئەعراف ٦ — ٧.

واتە: ئینجا سوێند بێت بە خوا بێگومان ئێمە پرسیار دەکەین لەوانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ ڕەوانەکراوە، سوێند بێت بەخوا لە پێغەمبەرانیش دەپرسینەوە (دەربارەی هەڵوێستی ئەو خەڵکە بەرامبەریان).

وە دەفەرمووێت: ﴿لِيَسْأَلَ الصَّادِقِينَ عَنْ صِدْقِهِمْ﴾ سوورەتی ئەحزاب ٨.

واتە: تا لە ڕۆژی قیامەتدا، خوا پرسیار بکات لە ڕاستگۆیان دەربارەی ڕاستییەکەیان.

کاتێ کە لە ڕاستگۆیان پرسیار دەکرێ سەبارەت بە ڕاستگۆییان، لەبارەی درۆزنەکانەوە چۆن گومان دەبەن؟

موقاتل لەبارەی ئەو ئایەتانەوە دەڵێ: ((پەروەردگار دەفەرمووێت: بەڵێن و پەیمانمان وەرگرتووە کە لە ڕاستگۆیان — واتە پێغەمبەرەکان — لەبارەی ڕاگەیاندنی پەیامەکەیانەوە پرسیار بکەین)).

موجاهید دەڵێ: ((پەروەردگار لە ئەهلی بانگەواز و بانگهێشت کەران دەپرسێ: هەر وەکو چۆن پێغەمبەران پەیامی خۆیان بەو جۆرەی کە هەیە گەیاندوویانەتە خەڵکی، ئێوەش پەیامی منتان بە خەڵکی ڕاگەیاند یاخود نا؟))

بەڵام حەقیقەتی بابەتەکە ئەمەیە کە ئایەتەکە هەردووکیان لە خۆ دەگرێ، چونکە هەم پێغەمبەران و هەم ڕاگەیەنەر و بانگەشەکەران هەردووکیان سەر بە ڕاستگۆیانن، وە لە پێغەمبەرەکان (سەلامی خوایان لەسەر بێت) لەبارەی گەیاندنی پەیامەکە و لە بانگ خوازانیش سەبارەت بە بانگ کردن بۆ پەیامی پێغەمبەران پرسیار دەکرێ، وە دوای ئەوە ئەوانەی کە پەیام و نامەی بانگ هێشت کردنیان پێ گەیشتووە لەبارەی قبووڵ کردنی پەیامەکەیانەوە لێپرسینەوە و بەدواداچوون دەکرێ.

وەك چۆن پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ﴾ سوورەتی قەصەص ٦٥.

واتە: ڕۆژێك دێت خوا بانگیان دەكات و پێیان دەفەرمووێت: ئەوە وەڵامی پێغەمبەرانتان چۆن دایەوە؟

قەتادە دەڵێ: سەبارەت بە دوو بابەتە پرسیار لە پێشینەكان (مردووەكان)و داهاتووەكان دەكرێ:

– چ كەسێكتان دەپەرست؟

– كاردانەوە و پەرچەكرداری ئێوە لەبارەی بانگهێشتی پێغەمبەرانەوە چی بووە؟

واتە سەبارەت بە پەرستراو پەرستش و بەخششی ڕێنموونی، لە هەموویان پرسیار دەكرێ.

پەروەردگاری بەدەسەڵات دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾ سوورەتی تەكاسور ٨.

واتە: پاشان سوێند بەخوا لەو ڕۆژەدا پرسیارتان لێ دەكرێت دەربارەی هەموو ناز و نیعمەتەكانی دونیا (چۆنتان پەیدا كردووە و لەچیدا بەكارتان هێناوە).

موحەممەدی كوڕی جەریری تەبەری دەڵێ: ((پەروەردگار مەزن دەفەرمووێت: دوای ئەوەی كە لەو بەخششانەی كە لە دونیادا لێیان بەهرەمەند بوون، پرسیار دەكرێ كە: لەگەڵیاندا – بەخششەكان – چیتان كردووە؟ بەهۆیانەوە گەیشتوونەتە كوێ؟ چۆن بەدەستتان هێناون و بە چ شێوەیەك بەكارتان هێناون و كەڵكتان لێ وەرگرتوون؟))

قەتادەش دەڵێ: ((پەروەردگار لە تەواوی مرۆڤەكان لە بارەی ئەو بەخششانەی كە پێیانی داوە و ئەو بەرپرسیارییەت و ئەركانەی كە لە بارەیانەوە – لەبارەی ئەو بەخششانە – هەیانبووە، پرسیار دەكات)).

ئەو بەخششانەی كە لە بارەیانەوە پرسیار دەكرێ، دوو جۆرن:

– **جۆری یەكەم:** ئەو بەخششانەی كە لە ڕێگەی ڕەوا و حەڵاڵەوە بەدەست هاتوون و لە ڕێگەی درووستدا بەكارهاتوون و سوودیان لێ وەرگیراوە، كە ئایا سەبارەت بەو بەخششانە ستایشی پەروەردگاری بەجێهێناوە یان نا؟

– **جۆری دووەم:** لە ڕێگەی ناڕەوا و حەرامەوە بەدەست هاتوون و لە ڕێگەی ناڕەواو ڕێگە پێنەدراوەوە بەكار هێنراون و كەڵكیان لێ وەرگیراوە، كە لە بارەی بەدەست هێنانی و كەڵك وەگرتن و بەكارهێنانیان دەخرێنە بەر لێپرسینەوەو موحاسەبەكردنەوە. وەك چۆن مرۆڤەكان لە بارەی هێزی بیستن و بینین و دڵ و تەواوی كار و كردەوە و قسەو گفت و گۆكانییەوە دەكەوێتە بەر لێپرسینەوە و پرسیار كردنەوە. بە هەمان شێوە كە پەروەردگاری مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولا﴾ سوورەتی ئەسرا ٣٦.

واتە: ئەی ئینسان لە شتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەكەوە كە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونكە بە ڕاستی دەزگاكانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی، بەرپرسیارە لە بەرامبەرییەوە.

حەق و شیاوە كە پێش ڕۆژی لێپرسینەوە و موحاسەبەكردن، خۆمان بخەینە بەر موحاسەبەكردن و لێپرسینەوەوە سەبارەت بە كار و كردەوە و قسە و لێدوانەكانمانەوە.

## پێویستی موحاسەبەكردنی نەفس:

ئەم فەرموودەیەی پەروەردگارە بە پێویستی (موحاسەبەكردنی نەفس) ئاماژە دەكات كە دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ سوورەتی حەشر ١٨.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، خواناس و پارێزكار بن و لەسنوورەكانی مەترازێن، با هەموو كەسێك ڕەنج بدات و بزانێت چی بۆ سبەی دەست پێشخەر

کردووە، هەوڵ بدەن هەمیشە و بەردەوام پارێزکار و دیندار و خواناس بن، چونکە بەڕاستی خوا زۆر ئاگایە بە هەموو ئەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

واتە پەروەردگاری مەزن و بەدەسەلآت بە ئەهلی ئیمان دەفەرموویت: هەر یەکێ لە ئێوە بیر بکاتەوە و ببینێ کە چ کوڵ و توێشوویەکی بۆ دواڕۆژی خۆی ئامادە و فەراهەم کردووە؟ ئایا کارو کردەوەی چاکی کردووە تاوەکو هۆکاری دەرباز بوون و بەختەوەری و کامەرانی ئەو ئامادە و فەراهەم بکات، یاخود تووشی کارو کردەوەی ناڕەوا و تاوان بووە کە بواری بەدبەختی و چارەڕەشی و پەرێشانی و کلۆڵی ئامادە بکەن؟

قەتاددە دەڵێت: پەروەردگار لەم ئایەتەدا – ئەو ئایەتەی سەرەوە – بە وشەی (غدا) واتە سبەینێ ڕۆشنی کردووەتەوە و لێکیداتەوە، کە بە نزیکی سات و زەمەنی ئەو وەکو سبەینێ بۆ ئەمڕۆ ئاماژە دەکات. (واتە: ئەو وشەی (غدا) کە بە مانای سبەینێ دێ، زەمەنەکەی لەلای پەروەردگار ئەوەندە کەم و نزیکە تەشبیهی نەبێ وەك ئەوە وایە کە ئێمە بە یەکێ بڵێین سبەینێ فلآن کارت بۆ دەکەم ئەو سبەینێیە زۆر نزیکە بۆ ئەمڕۆی ئێمە، ئەو وشەی (غدا) ەش لەلای پەروەردگارە لە ڕووی زەمەنەوە هێندەی سبەینێکەی ئێمە بۆ ڕۆژی ئەمڕۆ نزیکە، وەرگێڕی کورد).

کورتەی باسەکە ئەمەیە کە خێر و چاکە، چاك کردن و چاکسازی کردنی دڵ، تەنیا لە ڕێگەی چاودێری و لێپرسینەوەی دڵ و خراپە و شەڕ، لەناوچوون و مردنی دڵیش بەهۆی پشتگوێ خستن و کەمتەرخەمی و بەرەڵلآ کردنییەوەیە کە دێتە دیی.

## تەوەری پێنجەم: كەڵك و قازانجەكانی موحاسەبەكردنی نەفس:

لێپرسینەوە و موحاسەبەكردنی نەفس زۆرێك لە بەرژەوەندییەكان دەستەبەر دەكات كە بریتین لە:

### ١. ئاگایی و ئاگاداری لە كەم و كوڕی و خەوشەكانی نەفس:

یەكێ لە قازانج و سوودەكانی موحاسەبەكردن و لێپرسینەوەی نەفس ئاگایی و شارەزاییە لە كەموكوڕیو خەوشەكانی (عەیبەكانی). هەركەسێ ئاگای لە كەموكوڕیو خەوشەكانی نەفسی خۆی نەبێ ناتوانێ لەناویان ببات، بەڵام هەركاتێ لە كەموكوڕیو نەخۆشییەكانی نەفس بەئاگا بێت، بەهۆی كەمتەرخەمی لە بەندایەتی كردن و پەرستشتی پەروەردگاردا دەیخاتە بەر سەركۆنە و لۆمەكردن و موحاسەبە كردنەوە.

ئیمام ئەحمەد لە ئەبوو دەرداوە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((زانست و تێگەیشتن (فقه) ناسینی مرۆڤ كاتێ تەواو و كامڵ دەبێ كە، ئامۆژگاری و لۆمەی خەڵكانی تری كردبێ بەهۆی كەمتەرخەمی لە بەجێهێنانی ئەركە ئایینی و بەندایەتییەكانی پەروەردگارەوە، بەڵام ڕوو بكاتە نەفسی خۆی و چاودێری بكات و بەهۆی لاوازی و كەمتەرخەمییەكانییەوە زیاتر لە خەڵكی سەرزەنشت و لۆمەی بكات. (واتە زیاتر لە خەڵكانی تر لۆمە و سەرزەنشتی دڵی خۆی بكات بەهۆی ئەو كەمتەرخەمی و لاوازییانەوە كە تووشی بووە لەكاروباری چاكەدا، وەرگێڕی كورد).

موترەفی كوڕی عبدالله وتوویەتی: ((ئەگەر بەهۆی ناسینی خۆمەوە نەبووایە لەگەڵ خەڵكی دا پەیوەندیم دەپچڕاند و لێیان دوور دەكەوتمەوە)).

هەروەها لە نزایەكی دا كە لە بەرە جەژناندا (عرفات) دەیخوێند، دەیوت: ((پەروەردگارا بەهۆی منەوە خەڵكی لەخۆت دوور مەخەرەوە)).

بەكری كوڕی عبداللەی مزی دەڵێت: ((كاتێك كە سەیری قاپی و حەساری عەرەفاتم دەكرد، بیرم دەكردەوە ئەگەر من لە نێوان ئەمانەدا نەدەبووم. تەواوی ئەو خەڵكانە دەكەوتنە بەر ڕەحمەت و میهرەبانی و لێبووردنی پەروەردگارەوە)).

ئەیووبی سەختیانی وتوویەتی: ((هەرکاتێ باسی پیاوچاکان دەکەن و ناویان دەهێنن، شەرم دەکەم کە خۆم بەڕیزی ئەوان و هاوشانی ئەوان لە قەڵەم بدەم)).

کاتێك کە سوفیانی سەوری لە کۆتا ساتەکانی مردنیدا بوو باوکی ئەشب و حماد کوڕی سەلەمە چوون بۆلای، حماد وتی: باوکی عبدالله مەگەر لەو شتەی کە لێی دەترسای پارێزراو نەبوویت؟ تۆ بۆ دیوان و بارەگای پەروەردگارێکی بە ڕەحم و بە بەزەیی دەڕۆی کە ئومێدەواری بە ڕەحمەت و بەخشندەیی و لێبوردنی؟

وتی: ئەی ئەبوو سەلەمە! وا دەزانی کەسێکی وەك من لە ئاگری دۆزەخ ڕزگار و دەربازی دەبێ؟ وتی: بەڵێ! سوێند بەخوا هیوادارم کە ئەهلی ڕزگار بووان و دەرباز بووان بیت!

یونس کوڕی عبید دەڵێ: ((سەد ڕەوشت لە ڕەوشتە خێر و چاکەکان دەناسم و دەزانم کە تەنانەت یەکێ لەوانە لە نەفسی خۆمدا نادۆزمەوە)).

محمد کوڕی واسع وتوویەتی: ((ئەگەر تاوان دەبوو بەهۆی هەڵکردن و جووڵەی باو تۆفان، هیچ کەسێ نەیدەتوانی خۆی لەسەر زەوی ڕابگرێ)).

لەلای یەکێ لە حاکم و فەرمانڕەواکان کەسێ بە چاکە باسی (داودی تایی) دەکرد، ئەو وتی: ((ئەگەرخەڵکی لە هەندێ لەو شتانەی کە ئێمەی تێدا جێگیرین ئاگادار دەبوون، هیچ کاتێ هیچ کەسێ قسەیەکی لەباری پێناسەکردن و پێداهەڵگوتنی من نەدەهێنایە سەر زاری)).

باوکی حەفص دەڵێ: ((هەر کەسێ لە هەر ئان و سات و بارووودۆخێکدا نەفسی خۆی تۆمەتبار نەکات و نەیخاتە بەر سەرکۆنە و تان و توانجەوە و لە هەر بارووودۆخێکدا دژایەتی لەگەڵدا نەکات و ناچاری نەکات و هەڵی نەنێ بۆ ئەو شتەی کە بەلایەوە سەخت و گرانە! تووشی زەرەر و زیان و لەناوچوون دەبێتەوە، وە هەر کەسێ یەکێ لە ڕەوشت و ڕەفتارەکانی نەفسی خۆی بخاتە بەر ئافەرین گوتن و پیاهەڵنان و چاك زانینەوە، نەفسی لەناوی دەبات)).

سروشتی نەفسی ئادەمی بەجۆرێکە کە مرۆڤ بەرەو لێژگە و خلیسکەی تیاچوون ڕادەکێشێ، هاوکاری و ئاریکاری دوژمن و ناحەزەکانی دەکات، ڕوو دەکاتە تەواوی پیسی و خراپییەکان، پەیڕەوی لە تەواوی پیسی و چەپەڵییەکان دەکات، وە خوو و نەریتی ئەو بەجۆرێکە کە هەمیشە و بەردەوام لە ڕێگەی دژایەتی و ناحەزیدا هەنگاو هەڵدەگرێ.

بەخشش و بەختەوەرییەک کە لەگەڵ هیچ بەخشش و خۆش بەختییەکی تردا شایەنی بەراورد و هەڵسەنگاندن نییە، دەرباز بوونە لە کۆیلایەتی و داوەکانی نەفس، چونکە خراپترین و گەورەترین ڕێگر و لەمپەر لە نێوان پەروەردگار و مرۆڤدا نەفسە. هەر مرۆڤێ زیاتر نەفسی بناسێ. زیاتر دەیخاتە بەر سەرکۆنە و تانە و توانج و سەرزەنشتەوە.

یوسنی کوڕی حەبیب دەڵێ: ئەبوو داود لە سلەتی کوڕی دینار و ئەویش لە بقیەی کوڕی سەهبان هەنانی گێڕاوییەتەوە کە لە دایکی باوەڕداران عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) سەبارەت بە واتای ئایەتی لای خوارەوە پرسیار کرا: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ﴾ سوورەتی فاتر ٣٢.

واتە: پاشان کەسانێکمان کردە خاوەن و ڕاگەیەنەری ئەم قورئانە کە هەڵمانبژاردوون لە بەندەکانمان، جا هەیانە ستەمی لەخۆی کردووە (چاکەی کەمە و گوناهی زۆرە)، هەشیانە مام ناوەندییە، هەشیانە زۆر گەرم و گوڕە لە چاکەکاریدا بەویست و یارمەتی خوا، ئا ئەو هەڵبژاردنە و ئەو گەرم و گوڕییە لە چاکەکارییدا، ڕێز و خەڵاتێکی زۆر گەورەیە.

خاتوو عائیشە فەرمووی: ((کوڕەکەم! ئەوانە ئەهلی بەهەشتن! ((دەست پێشخەران)) لەخێر و چاکەدا کەسانێ بوون کە لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەژیان و پێغەمبەری خوداش بە بەهەشتی بوون و بەهرەمەند بوونیان لە

بەخششەکانی بەهەشت بەڵێنی داوە، بەڵام ((دەست پێوەگران))واتە((مقتصدین))، ئەو ئەسحاب و هاوەڵانەن کە تا کۆتایی تەمەنیان پەیڕەوییان لە ڕێگە و ڕێبازی پێغەمبەر و شەریعەتیان کردووە، بەڵام ستەمکاران و دەست درێژیکەران بۆ سەر نەفسی خۆیان خەڵکانێکی وەکو من و ئێوەن)).

تێبینی ئەوە دەکەن کە حەزرەتی عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) خۆی بە ستەمکارانی نەفسی خۆی لە قەڵەم داوە.

بەڵام ئیمام ئەحمەد گێڕاویەتەوە کە: عبدالرحمن لەلای ئوم سەلەمە بوو ئەو وتی: لەپێغەمبەری خوام (صلی الله علیە وسلم) بیستووە کە دەیفەرموو: ((هەندێ لەم خەڵکە دوای مردنم بۆ هەمیشەیی نام بیننەوە)). عبدالرحمن بەنیگەرانییەوە لەلای ئەو هاتە دەرەوە! دوای چەند کاتژمێرێ جارێکی تر گەڕایەوە و بە ئوم سەلەمەی وت: سوێندت دەدەم بە پەروەردگار بلێ: کە ئایا من لەوانەم کە تۆ نامبینیەوە یان نا؟! ئوم سەلەمە وتی: نەخێر، بەڵام جگە لە تۆ ناتوانم هیچ کەسێکی تر ڕزگار بکەم[19])).

(لێرەدا مەبەست لەو وشەی ڕزگار کردنە ئەوەیە کە ئیتر ناتوانم بە کەسی تر بڵێم کە ئایا دوای مردنم دەمبیننەوە یان نا، وەرگێڕی کورد).

لە مامۆستاکەمم بیست کە دەیوت: ((مەبەستی ئوم سەلەمە ئەمە بووە کە ئەم دەرگایە بە ڕووی خۆمدا ناکەمەوە و لەبارەی هیچ کەسێکەوە نێو بژیوانی ناکەم، مەبەستی ئەم ئەمە نەبووە کە لە نێوان ئەسحاب و هاوەڵەکاندا تەنیا عبدالرحمن بەهەشتی بووە)).

## ٢. لۆمە و سەرزەنشت کردنی نەفس:

سەرزەنشت کردنی نەفس بەهۆی کەمتەرخەمی لە بەندایەتی کردن و گوێڕایەڵی کردنی پەروەردگاردا کاری ڕاست بێژ و ڕاستگۆیانە، وە ئەم کارە هەندێ جار زیاتر لە کار و کردەوە و قسەی چاکە، مرۆڤ لە پەروەردگار نزیک دەکاتەوە.

---

١٩ اخرجه الأمام احمد فی المسند ج ٦ — ٢٩٨.

ابن ابی دینار له مالکی کوڕی دینار گێڕاویەتەوە کە: ((ژمارەیەك لە خەڵکی بەنی ئیسرائیل ڕۆژێ جەژن لە یەکێك لە پەرستگاکانی خۆیاندا بوون کە گەنجێ هات و لە پاڵ ئەودا وەستاو وتی: گونجاو و شیاو نییە کە کەسێکی وەك من بێتە ناو ئێوەوە و تێکەڵ بەو قەرەباڵغییە ببێ! من مرۆڤێکی خراپم و فلان و فلان کاری خراپە و ناپەوام ئەنجام داوە و بە هەمان شێوە بەخراپە باسی خۆی دەکرد.

تاوەکو پەروەردگار پەیام و ئیلهامی نارده خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەیان و وتی: فلان گەنج لە زومرەی ڕاستگۆیانە)).

بەلام ئەحمەد دەڵێت: محمدی کوڕی حەسەنی کوڕی ئەنەس دەڵێ: مەنزەر لە وەهبەوە گێڕاویەتییەوە کە: ((پیاوێکی گەڕۆك و گەشتیار حەفتا ساڵ پەرستشی خوای کردبوو ڕۆژێ لە دیوانی پەروەردگاردا پەرستشەکانی خۆی بە کەم دەزانی، وە لە دیوان و بارەگای بەدەسەلات و مەرانی پەروەردگار داوای لێ بوردن و لێخۆش بوونی کرد! دەنگ و هاوارێ لەلایەن پەروەردگارەوە هات کە، ئەم نزا و پاڕانەوە و قسانەت لە پەرستشی حەفتا ساڵەت، بۆ من شیرین تر و خۆشەویست ترە!)).

هەروەها ئیمام ئەحمەد گێڕاویەتەوە کە: ((حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: من دڵ نەرم و خاوەن بەزەییم (رقيق القلب) و نەفسی خۆم بە لاواز دەزانم! ئێوە لێم بپرسن!)).

ئیمام ئەحمەد لە عبدالله کوڕی ڕباحی انصاری گێڕاوییەتەوە کە: ((داود دەڕۆیشتە نێو گەورەترین کۆبوونەوەکانی خەڵکی بەنی ئیسرائیلەوە و لەنێویاندا دادەنیشت و دەیوت: پەروەردگار لەگەڵ منی هەژار و بێنەوادا لە نێو ئەم بێنەوا و هەژارانەدا بەبەزەیی و میهرەبان بە)).

لە عیمرانی کوڕی موسی القصیر هاتووە کە وتوویەتی: ((حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) ڕۆژێ وتی: ئەی پەروەردگارا لە کوێ بەدواتا بگەڕێم؟! پەروەردگار

فەرمووی: لەلای خەفەتبار و دڵتەنگەکاندا بمدۆزەرەوە! من هەموو ڕۆژێ تۆزێک لێیان نزیک دەبمەوە، ئەگەر ئەمە نەبووایە لەناو دەچوون)).

لە پەرتووکی (الزهد)ی ئیمام ئەحمەددا هاتووە: ((کەسێ لە کەسەکانی بەنی ئیسرائیل بۆ هێنانەدی نیاز و داخوازییەکەی شەست ساڵ پەروەردگاری پەرستش کردو دەیپەرست، بەڵام بە ئامانج و مەبەستی خۆی نەگەیشت! ڕۆژێ بە خۆی وت: ئەگەر خێر و چاکەت تێدا بووایە بە مەبەست و ئامانجی خۆت دەگەیشتی! سەو کەسێ هاتە خەوی و پێی وت: ئەو ساتەی کە تێیدا لۆمە و سەرزەنشتی نەفسی خۆتت کرد دەبینی؟ ئەو ساتە لە پەرستشی ئەو شەست ساڵەی تۆ بە نرختر و بە بایەخ تر بووە)).

## ٣. ناسینی پەروەردگار:

یەکێ لە سوودەکانی موحاسەبە کردن و لێپرسینەوەی نەفس ئەمەیە کە لەم ڕێگەیەوە دەتوانرێ شارەزا و ئاشنای بەرپرسیارییەتی خۆمان بین لە بەرامبەر پەروەردگاردا. چونکە هەرکەسێ ئاگای لە مافی پەروەردگار و بەرپرسیارییەتی خۆی نەبێ، پەرستشەکەی سوود و قازانجێکی ئەوتۆ لە خۆ ناگرێ و کاریگەری و نیشانەکانی زۆر کەم دەبێ.

ئیمام ئەحمەد (خوای لێ ڕازی بێت) گێڕاوییەتەوە کە: ((حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) دای بەلای پیاوێکدا و بینی خەریکی نزا و پاڕانەوە و لاڵانەوەیە و! پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: پەروەردگارا! بیخەرە بەر ڕەحمەت و میهرەبانی و بەزەیی خۆتەوە! پەروەردگار ئیلهامی بۆ نارد کە: ئەگەر شارەزا و ئاشنای مافەکانی من و بەرپرسیاریەتی و ئەرکەکانی خۆی نەبێ، ئەگەر ئەوەندەش بپاڕێتەوە کە بەهۆیەوە ڕیخۆڵەکانی پارچە پارچە بن، نزا و پاڕانەوەکەی لێ قبووڵ ناکەم)).

یەکێ لە گرنگترین و بە سوود ترین کاروبار، ڕووتێکردن وچاودێرییە بە مافەکانی پەروەردگار بەسەر بەندەکانییەوە! چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ نەفسی خۆی بخاتە بەر لێپرسینەوە و موحاسەبەکردنەوە و کلۆڵی و لاوازی خۆی دیاری بکات و لە خۆ بە گەورە زانین و شانازی کردن بە کار و کردەوەکانی پاك بکاتەوە، لەلایەکی ترەوە دەرگای خۆ بە کەم زانین و کزی لە بەرامبەر پەروەردگاردا بە ڕوویدا دەکاتەوە، وە دەربازی دەبێت لە خۆ بە زل زانین، وە بەم ئەنجامە بگات کە تەنیا بەهۆی لێبوردن و ڕەحمەت و میهرەبانی و بەخششی پەروەردگارەوە ڕزگاری دەبێت.

یەکێ لە مافەکانی پەروەردگار بەسەر ئەهلی ئیمانەوە ئەمەیە کە، گوێڕایەڵی بکرێت و نافەرمانی و سەرپێچی نەکرێ بەرامبەر بە فەرمانەکانی و یاد و ستایشی بکرێ و لەبیر نەکرێ و شوکر و ستایشی بکرێ و لە بێ ڕێزی و نا شوکری کردن بەرامبەر بە بەخششەکانی دوورە پەرێزی بکرێت و خۆمانی لێ دوور بخەینەوە.

هەرکەسێ ئاشنا و شارەزای ئەو مافەی پەروەردگار بێت کە بە سەرییەوەیەتی، بەدڵنیاییەوە دەزانێ کە ئەو مافی بەندایەتی کردنی پەروەردگاری بەجێ نەهێنانەوە و تەنیا ڕێگەی ڕزگاری و دەرباز بوون و بەختەوەری ئە کەسە ئومێدو هیوابوونە بەڕەحمەت و میهرەبانی و لێبوردەیی پەروەردگار و (جلّ جلاله) ئەگەر پێوانەی ڕزگار بوونی کردەوەکانی بێت، لەناو دەچێ و تەفرو تونا دەبێت.

ئەمە بارودۆخی کەسانێکە کە پەروەردگار و نەفسی خۆیانیان ناسیوە و ئاگادارن لێی، ئەمە ناسین و ئاشنایەتییە، کە ئەوانی لە باوەڕ بەخۆ بوون و پشت سوور بوون بەرامبەر بە خۆیان دوور دەخاتەوە و تەواوی ئومێد و هیوای خۆیان دەبەستنەوە بە لێبوردەیی و ڕەحمەت و بەزەیی پەروەردگارەوە.

ئەگەر سەیری بارودۆخی زۆربەی خەڵکی بکەیت و تێ بفکریی و لێی ورد بیتەوە، بۆت دەردەکەوێ و دەزانی کە پێچەوانەی ئەمەن و هەمیشە لەبیری حەق و مافی خۆیانن بەسەر پەروەردگارەوە و سەبارەت بە حەق و مافی پەروەردگارە

بەسەریانەوە بیر ناکەنەوە! لێرەوە بوار و زەمینەی پچڕاندنی پەیوەندی ئەمان لەگەڵ پەروەردگاردا فەراهەم دەبێ و لە نێوان دڵەکانیان و ناسین و خۆشەویستی و تامەزرۆیی بینینی پەرستراوەکەی و چێژ وەرگرتن لە یادو ستایش کردنی پەروەردگاردا، لەمپەر و بەربەست درووست دەبێت و سەر هەڵدەدات. ئەمە کۆتایی نەزانی و سەر لێشێواوی مرۆڤە بەرامبەر بە خود و پەروەردگاریش.

## موحاسەبە و لێپرسینەوەی نەفس:

گرنگی و پێویستی ڕووتێکردن و چاودێری و بیرکردنەوەی مرۆڤ، سەرەتا سەبارەت بە ماف و حەقی پەروەردگارە بەسەر خۆیەوە (واتە بەسەر خودی مرۆڤەوە). دوای ئەوە لەم بارەیەوە نەفسی خۆی موحاسەبە بکات و لێی بپرسێتەوە کە ئایا ئەو شێوەیەی کە پێویست بووە کاری بە بەرپرسیارییەتییەکانی خۆی کردووە و بەجێی هێناون یان نا؟

چاکترین و بەرزترین ڕامان و بیرکردنەوە، بیرکردنەوەیە لەم بارەیەوە، چونکە دڵ ڕادەکێشێ بەرو پەرستراو و مەعبوودی ڕاستی و لەدیوان و بارەگای مەزن و گەورەی پەروەردگاردا ناچاری دەکات و هەڵی دەنێ بۆ ئەوەی ملکەچ و گوێڕایەڵ بێت و بە تەواوی خۆی بە داواکار و هەژار لە قەڵەم دەدات، پێویستی و داخوازی کە وەك نا پێویستی و سەرچامەندن و سەرکزی کە وەك سەربەرزی وایە. بەلام هەروەکو چۆن مرۆڤ بە هەر ئەندازەیەك کارو کردەوەیەکی باش کە حەز دەکات ئەنجامی بدات، ئەگەر موحاسەبە و لێپرسینەوەی نەفسی خۆی لە بیر بکات و پشت گوێی بخات، گەورەیی و چاکەی زۆر زیاتر لەوەی کە ئەنجامی داوە لەدەستی داوە.

ئیمام ئەحمەد دەفەرمووێت: ابن قاسم لە سالحی مەرئی و ئەویش لە عمرانی جەونی و ئەویش لە ئەبی جەلد گێڕاویەتەوە کە: ((پەروەردگار پەیام و ئیلهامی بۆ پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) دابەزاند کە، هەر کاتێ خەریکی زیکر و یاد و ستایش کردنی منی، ئەندامەکانت بلەرزن و بکەونە جووڵە جووڵ و لەکاتی یاد

کردنمدا ملکەچ و هێمن و ئاسوودە بە! لەکاتی ستایش کردندا زمانت بخەرە دوای دڵتەوە و لەپشت دڵتدا جێگیری بکە!

(لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە کاتێ ستایشی پەروەرودگار دەکەیت ئەو ستایشەی کە دەیکەیت لەدڵتەوە سەرچاوە بگرێ و هەڵقوڵێ، نەك تەنیا زمان ئاگای لێ بێت و دڵ لێی بێ ئاگا بێت، ئەگەر لە دڵەوە هەڵقوڵێ زمان و تەواوی ئەندامەکانی تریش بە ئاگان لەو یادکردن و ستایش کردنە، چونکە دڵ نێوەنچو سەرچاوە و فەرمانڕەوای تەواوی شتەکانە بەسەر ئەندامەکانی ترەوە، وە بە پێچەوانەشەوە، وەرگێڕی کورد).

هەرکاتێ هاتیتە بارەگاو دیوانی من وەکو بەندەیەکی هەژار و پەرێشان و کڵۆڵ وەرە! نەفست کە لە خراپە گوتن و پاش ملەدا لە پێش ترەوە بیخەرە بەر موحاسەبە کردن و لێپرسینەوەوە! وە هەرکاتێ لەگەڵمدا ڕاز و نیازت دەکەیت بەدڵێکی پەرێشانو نیگەران و زمانێکی پاك و ڕاستگۆوە بپارێرەوە و دەست بکە بە لالانەوەو داواکردن)).

یەکێکی تر لە کەڵك و قازانجەکانی ڕووتێکردنی مرۆڤی ئەهلی ئیمان بە حەق و مافەکانی پەروەردگار بە سەریەخۆیەوە ئەوەیە، ڕێگەی پێ نادات کەوا متمانە بە هەر کارو کردەوەی لە کاروکردەوەکانی بکات و — هەر شتێ کە بێت — پشتی پێ ببەستێ، چونکە هەرکەسێ تەنیا متمانە بە کارو کردەوەکانی خۆی بکات و پشتیان پێ ببەستێ ناتوانێ بەرەو لای پەروەردگار بەرز بێتەوە و بڕوات. (ئێمەی مرۆڤ هەرچەندە کە گوێڕایەڵی و پەرستشی پەروەردگار بکەین و کار و کردەوەی چاکە ئەنجام بدەین، گەر چی بە ئەندازەی کەفی سەر دەریاکانیش بێت، نابێ شانازی بەخۆمانەوە بکەین، وە دەبێ بپاڕێینەوە و بڵێین کە: ئەی پەروەردگارا لە ڕۆژی دوایی دا و لەساحەی مەحشەردا بەکردەوەی خۆمان لەگەڵماندا نەجووڵێیتەوە و لەگەڵمان نەکەیت و بەچاوی ڕەحم و میهرەبانی خۆتەوە موحاسەبە و لێپرسینەوەمان لەگەڵدا بکەیت، چونکە گەر ڕەحم و میهرەبانی پەروەردگار نەبێت لەو لێپرسینەوەو موحاسەبەکردنەی

خوداوەندا دەربازمان نابێت، ئەگەر چی چاکەی گەلێ زۆریشمان کردبێت و هەمان بێ، وەرگێڕی کورد).

هەروەك چۆن ئیمام ئەحمەد (خوای لێ ڕازی بێت) لە یەکێ لە ئەهلی ناسینی پەروەردگار (واتە ئەو کەسانەی کە پەروەردگاریان بەچاکی ناسیوە) گێڕاویەتەوە کە پیاوێ پێی وتووە: ((من لە نوێژەکانمدا ئەوەندە دەگریم و فرمێسك دەڕێژم خەریکە بەهۆی فرمێسکەکانی چاومەوە سەوزەڵانی و گیا بڕوێ و شین ببێ)). ئەو ئەهلی ناسین و زانایە بەو پیاوەی وت: ((ئەگەر بەڕاستی پەروەردگارت بناسیایە و ئاشنای بوویتایە لەوە باشتر بوو کە دەگریای و فرمێسکت دەڕشت و باست لە پەرستش و کارو کردەوەی خۆتت دەکرد! چونکە نوێژی خەڵکانێ کە کارو کردەوەی خۆیان باس دەکەن و دەیدەن بە نێو چاوانی ئەم و ئەودا، لە سەریان بەرزتر نابێتەوە)).

پێی وت: ئامۆژگارییەکم بکە! وتی: ((سەبارەت بە دونیا پارێزگاری و چاوتێر و ڕەزا بە بەش بە و لەگەڵ ئەهلی دونیادا مشت و مڕو بەر بەرەکانێ مەکە! وە وەکو مێشە هەنگ وابە! کە لە پاکی دەخوات و پاکیش بەرهەم دەهێنێت، وە ئەگەر بە سەر چڵ و پۆیەکەوە بنیشێتەوە زەرەر و زیانی پێ ناگەیەنێت!

ڕات دەسپێرم بەوەی کە لە ئەمەکداری و وەفاداری سەگ بەرامبەر بە خاوەنەکەی پەند و ئامۆژگاری وەربگرە! چونکە ئەوان هەندێ جار ئەو سەگە بە برسییەتی دەهێڵنەوە و هەندێ جاریش لەخۆیانی دوور دەخەنەوە و ڕاوی دەنێن، بەڵام ئەو کەمتەرخەمی ناکات لە مانەوەیان و پاسەوانی کردن لەماڵ و سەروەتیان)).

بەڵام شاعیرێ لەم وتەیە ئیلهامی وەرگرتووە و ئەم هۆنراوەیەی وتووە کە:

كن كالكلب يقصيه اهله      ولا يأتل فى نصحهم مبتذلا

واتە: ((وەك ئەو سەگە وابە کە خاوەنەکەی دووری دەخاتەوە و ڕاوی دەنێ، بەڵام تووڕە نابێ و لە خزمەت کردن پێیان کەمتەرخەمی ناکات)).

# بەشی پێنجەم

# پاراستنی دڵ لە بەرانبەر زاڵبوونو دەسەڵاتی شەیتاندا

## تەوەری یەكەم: چارەسەری نەخۆشی زاڵبوونی شەیتان بەسەر دڵدا

### بازنەی زاڵ بوونی شەیتان بەسەر مرۆڤدا:

پەروەردگار لەسەر بناغە و بنچینەی كارزانی و كارامەیی خۆی دوژمنێكی بە ئاگای لە سەر ڕێگەكانی لەناو بردنی مرۆڤ و هۆكار و ئامرازی هێنانەدی خێر و چاكە و بەدبەختی و چەرمەسەری بۆ جێگیر كردووە.

دوژمنێكی زانا و كارامە و پابەند بوون و ئۆگر بوونی بەسەر لێشێواندنی مرۆڤ كە بەجۆرەها شێوە و لە تەواوی ئان و ساتەكاندا بۆ زەبر و زەرەر و زیان گەیاندن پێی تێدەكۆشێ و هەوڵ دەدات. وە لە هیچ جۆرە هەوڵ و كۆششێ بۆ بەدەست هێنان و گەیشتن بە یەكێ لەم شەش ئامانجەی خوارەوە كەمتەرخەمی ناكات:

**یەكەم:** ئەوەی كە بەلایەوە گرنگە و جێی بایەخ پێدانە و كۆتا ئامانجی ئەوە، ئەمەیە كە نێوان مرۆڤو زانست و ئیمان مەودایەكی قووڵ درووست بكات و لە گومڕاییو نەزانی و بێ باوەڕی دا جێگیری بكات، ئەگەر لەم كارەدا سەركەوتوو بێت ئەوا بە تەواوی بەسەریدا سەركەوتوو دەبێ و بیر و هۆشی لەو مرۆڤە ئاسوودە دەبێت.

**دووەم:** ئەگەر شەیتان نەیتوانی بەو ئامانج و مەبەستەی خۆی بگات، وە ئەو مرۆڤە ڕووی كردە ئیسلام و ڕێنموونی وەرگرت، هەوڵ دەدات و تێدەكۆشێ كە ناچاری بكات بە بەدیهێنان (البدعة) — كە پلەیەكە دوای بێ باوەڕی — شەیتان زیاتر ئەو مرۆڤانەی خۆش دەوێ كە ئەهلی بەدیهێنان و تازەگەرین، نەك ئەوانەی كە ئەهلی سەرپێچی كردن و گوناح وتاوانن. چونكە ئەهلی سەرپێچی و گوناح و تاوان دەتوانێ بگەڕێتەوە و تۆبە بكات، بەڵام ئەهلی بەدیهێنان و تازەگەری (بدعة) بەهۆی ئەوەی كەوا كارەكەی خۆیان وەك ڕێنموونییەك و ڕێنیشاندەرێ لە قەڵەم دەدەن لەبیری گەڕانەوە و تۆبەكردندا نین.

له هەندێ له فەرموودەدا هاتووه كه: شەیتان دەڵێ من مرۆڤـەكانم بـەهۆی گوناح و تاوانەوه تووشی گومڕایی و سەر لێشێواندن كردووه، بەڵام ئەوان به تۆبەكردن و داوای بەخشش ولێبوردن له پەروەردگار و دان پێدانان و پەیوەست بوون بـه یەكخواپەرستی و تاك و تەنیایی پەروەردگار له خوداوەندی خواوەند (الالوهیه) دەستی منیان بەست و گرێیان دا. كاتێ بەو جۆره بینیم كەوا ڕۆحـی هـەوا و ئـارەزوو پەرستیم لـه نێوانیانـدا پەره پێداو ڕەواجم دایه! چونكه ئەهلی بەدیهێنان (بدعة) و هـەوا و ئـارەزوو گونـاح و تاوان دەكەن و تۆبه ناكەن و ناگەڕێنەوه، چونكه ئەوان وا هەست ئەكەن كەوا خەریكی ئەنجامدانی كارێكی ڕاست و درووستن. !

ئەگەر شەیتان له مەسەلەی تازەگەری و بەدیهێنان و زیاد و كەمكردندا (لەبنـچینەو بناغەكانی باوەڕی ڕەوشت و ئەحكام) بەسەر كەسێكدا سەركەوتوو بێـت، ئـەو دەكاتـه شوێنكەوته و سەربازی خۆی.

**سێیەم:** ئەگەر شەیتان لـەوەدا سـەركەوتوو نـەبوو كـەوا مـرۆڤ بخاتـه نێـو گۆمـاوی تازەگەری و بەدیهێنانەوه، ئەوا هەوڵ دەدات تووشی گوناح و تاوانی گەورەی بكات.

**چوارەم:** ئەگەر هاتوو لەوەدا سەركەوتوو نەبوو كـەوا مـرۆڤ تووشـی تـاوانی گـەوره بكات، ئەوا تووشی لەمەموو خلیسكان و هەڵه و تاوانی بچووكی دەكات.

**پێنجەم:** گەر هاتوو مرۆڤ به ئەندازەیەك له بەرامبـەر شـەیتان ڕاوەسـتاو سـەقامگیر بوو و ئامادەش نەبوو تاوانی بچووك ئەنجام بدات، شەیتان سەرقاڵی كارووبار گـەلێكی بێ بایەخ و بێ پله و پایەی دەكـات، تـا وەكـو تەمـەن و هێـز و توانـای بـه بـێ كـەڵكو قازانج به فیڕۆ بدات و دووری بخاتەوه له كارو كردەوەی باشتر و گرنگتـر.

**شەشـەم:** هـەروەها گـەر دیسان هـاتوو شـەیتان لـەم كـارەی دا بـێ توانـا بـوو و سەركەوتنی بەدەست نەهێناو مرۆڤ به ئاگایی و ئیمان و ویست و ئیرادەی خـۆی تـوانی خـۆی لـەو داوه مەترسـیداره دەربـاز بكـات، شـەیتان هـەر وازی لێ نـاهێنێ و دەسـت بەرداری نابێ، وه ئەمجاره دەست و پێوەنـد و یارمـەتی دەران و ئاریكـارانی خـۆی لـه

دژی ئەو کەسە بەکاردەهێنیٚ و دەیانخاتە جووڵە، تاوەکو تووشی ئەزییەت و ئازاری بکات و تاوان و درۆ دەلەسەی گەورەی دەداتە پاڵ، تاوەکو تووشی خەم و خەفەت و دڵتەنگی بکات، وە دووری بخاتەوە لە زانست، ئیمان، ویست و ئیرادە و کارو کردەوە.

کەسیٚ کە ئاگایی و شارەزایی لەم بوارەدا نییە و دوژمن و ناحەزی خۆی بە دروستی ناناسیٚ، لە داو و تەڵەکەبازی و فرو فێڵەکانی بیٚ ئاگایە، چونکە دەتوانیٚ خۆی لیٚ بپارێزیٚ و خۆی دوور بخاتەوە؟!

چونکە تەنیا کەسانیٚ دەتوانن لە پیلانی پیلانگێڕان و کەین و بەینەکانی دوژمنان و ناحەزان لەپەنا و ئەماندا بن کە، لە ڕێگەکانی چوونە ناوە و ڕێباز و میتۆدی دەست بەکاربوونیان و یارمەتی دەران و دەست و پێوەند و سەربازەکانیان و چۆنییەتی ڕووبەڕوو بوونەوە و ئامراز و هۆکاری بەرامبەر کیٚ و چۆنییەتی چارەسەرکردنی ئەو زامانەی کە تووشیان دەبن و کاروبار گەلیٚ کە هێز و توانایان پیٚ دەبەخشی بۆ ئەم ڕووبەڕوو بوونەوەیە، بە جوانی ئاگایی و شارەزاییان هەبیٚ.

تەواوی ئەو کاروبارانە لە ڕێگەی زانست و ئاگاییەوە لە تواناادا نابن. بەڵام مرۆڤە نەزان و بیٚ ئاگاکان لەم بابەتە زۆر گرنگ و هەستیار و چارەنووس سازە لە بیٚ ئاگاییدان و هیچ شارەزایی و ئاگایەکیان نییە.

لەبەر ئەوەیە کەوا بەشێوەیەکی زۆر دوور و درێژ باس لەو دوژمنی و ناحەز و بارودۆخەی ئەو و سەرباز و پیلان و فرو فێڵەکانی کراوە. چونکە خەڵکی بە توندی پێویستیان بە ئاشنایەتی لە گەڵ دوژمن و ڕێگەکانی ڕووبەڕوو بوونەوە و بەرامبەر گرتن هەیە. ئەگەر زانست (بە قورئان) ئەم حەقیقەت و ڕاستییەی نەدۆزیبایەتەوە هیچ کەس لەو دام و فرو فێڵانەی ئەو دەرباز نەدەبوو لەسەر ئەم بنچینە و بناغەیە کە دەبیٚ بوتریٚ: ڕزگار بوون و بەختەوەری و کامەرانی میوەی درەختی زانست و ئاگاییە.

## مەترسی شەیتان لە مەترسی نەفس ترسناکترە:

ئەم بەشە لە گرنگترین و بەسوود ترین بابەتەکانی ئەم پەرتووکەن، بەلأم دواکەوتووان و شوێنکەوتووانی ئەهلی ڕەوشت و نەریت، بەو ئەندازەیەی کە باسیان لە حەقیقەت و ڕاستی نەفس و کەم و کوڕی و بەلأکانی نەفس کردووە و بە دوور و درێژی باسیان کردووە، گرنگیان بەم بابەتە نەداوە.

کەسێ لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ورد بێتەوە و بیر بکاتەوە، تێدەگات کە دوای لاکردنەوە و گرنگیدان بە نەفس، گرنگی بە مەسەلەی شەیتان و ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو داوە.

نەفسی ئەممارە لە ئایەتی: ﴿...إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ...﴾ سوورەتی یوسف ٥٣.

واتە: بەڕاستی نەفس ئەگەر بە نووری خواناسی ئاوەدان نەبێت، زۆر فەرماندەرە بە گوناه و هەڵە و تاوان.

نەفسی لەووامە لە ئایەتی: ﴿وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾ سوورەتی قیامە ٢.

واتە: سوێند دەخۆم بە ویژدانی زیندوو و نەفسی ڕەخنە لە خۆگر کە لۆمە لەخۆی دەکات.

هەروەها نەفسی کەسن و ناپەسەند لە ئایەتی: ﴿...وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَىٰ﴾ سوورەتی نازعات ٤٠.

واتە: ئەوەی جڵەوی نەفسی گرتبێتەوە لە هەموو هەوا و هەوەس و ئارەزوویەکی نادرووست.

باسکراوە و وە بیرمانیانی هێناوەتەوە:

بەلأم لە زۆربەی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئاندا باس لە شەیتان کراوە و سوورەتێك[٢٠] تایبەت کراوە بەوەوە (شەیتان)، وە پەروەردگاری بە دەسەلأت و مەزن پێش ئەوەی

---

[٢٠] بە ڕواڵەت مەبەست لەو بە هەمان شێوە کە حامد الفقی دەڵێ: سوورەتی (الفلق)ــە.

ئەهلی ئیمان ئاگادار بکاتەوە سەبارەت بە مەترسییەکانی نەفس، ئەوانی ئاگادار کردووەتەوە سەبارەت بە داو و مەترسییەکانی شەیتان، حەقیش هەر ئەمەیە، چونکە سەرهەڵدانی شەڕ و خراپە و خراپەکاری نەفسیش لە دڵەڕاوکێ و وەسوەسەی شەیتانەوە سەرچاوە دەگرێ و نەفسیش وەك مورەکەبی شەیتان یاخود وەك زەوییەکە کە تۆوی خراپە و خراپەکاری تێدا دەچێنێ.

پەروەردگار داوای لە ئەهلی ئیمان کردووە و بانگیانی کردووە کەوا لەکاتی خوێندنی قورئانی پیرۆز و کارو کردەوەکانی تردا پەنا بە پەروەردگاری مەزن بگرن لە شەڕ و خراپەی شەیتان. ئەمە بەهۆی ئەوەیە کەوا پەنا بە پەروەردگار بگرین بۆ دوورکەوتنەوەمان لە شەڕ و خراپە و بەدکاری شەیتان. بەڵام پەروەردگاری مەزن و بەدەسەڵات تەنانەت لە یەك بواریشدا داوای لە ئەهلی ئیمان نەکردووە کەوا پەنای پێ بگرن لە شەڕ و خراپەی نەفسی خۆیان، وە تەنیا لە ئامۆژگاری و نزایەکدایە کەوا پەنا بۆ پەروەردگار براوە بۆ دوورکەوتنەوە لە شەڕ و خراپەکاری نەفس، بە هەمان شێوە کە هاتووە: ((**ونعوذ بالله من شرور انفسنا ومن سيئات اعمالنا**)).

واتە: پەنا دەگرین بە پەروەردگار لە خراپە و بەدکارییەکانی نەفس و کار و کردەوە خراپەکانمان.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاوار و پەناگرتن بە خوا لە هەر خراپە و بەدکاری هەردوو — نەفس و شەیتان — لە فەرموودەیەکدا کە لە ئەبوو هورەیرەوە گێڕدراوەتەوە، لەپاڵ یەکتردا دایناون: ئیمامی ئەبووبەکر (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).! شتێکم فێر بکە کە لە دەستپێکی ڕۆژو و لە سەرەتای شەودا بیڵێم.! پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ((**قل اللهم عالم الغيب والشهادة فاطر السموات والأرض رب كل شيء و مليكه، أشهد أن لا اله الا أنت أعوذ بك من شر نفسي وشر الشيطان و شركه، وان**

**اقترف على نفسى سوءاً او اجره على مسلم. قله اذا أصبحت وإذا أمسيت وإذا اخذت مضجعك)).**[٢١]

واتــە: بڵــێ خوایــە زانــای نێهنــی و ئاشــکرای، بەدیهێنــەری ئاسمــان و زەوی، پەروەردگارو پادشای هەموو شتێك، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە تو پەنا ئەگرم پێت لە خراپەی نەفسم و لە شەڕ و خراپە و هاوبەش دانانی شەیتان. وە لەوەی کە نەفسم تووشی خراپەیەك بکەم یان بیئاڵێنم لە موسڵمانێکەوە.

(ئەمە یەکێکە لەو زیکرانەی کە پێویستە موسڵمان بەیانیان و ئێواران بیڵێ و لە پەرتووکی قەڵای موسڵمان، لە زیکرەکانی ڕۆژانە و شەوانە لە قورئان و سوننەتدا، هاتووە، ئەم نزایە لەکاتی بەیانیان و ئێواران و هەرکاتێ چوویتە ناو جێگەی نووستنەوە بیڵێ! دیارە هەموو شتێ کات و شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، جا لێرەدا مەبەست لە بەیانیان، ئەو دەمەیە کە بانگبێژ بانگی بەیانی دەدا تا ئەو کاتەی کە خۆر هەڵدێ، وە مەبەست لە ئێوارانیش ئەو دەمەیە کە بانگبێژ بانگی عەسر دەفەرمووێت تاوەکو بانگی ئێوارە (مەغریب) دەوترێ، بۆیە پێویستە ئەو نزایە لەو دوو کاتەدا بوترێ باشترە، خواش خۆی باشتر دەزانێ، وەرگێڕی کورد).

لەم فەرموودە پیرۆزەدا پەنا گیراوە بە پەروەردگار لە شەڕ و خراپە و خراپەکاری و ئامراز و هۆکار و شوێنهاتەکان، چونکە تەواوی شەڕ و خراپە و زەرەر و زیانەکان، یان لە نەفسەوە سەرچاوە دەگرن یاخود لە شەیتانەوە و ئاکام و شوێنەما و شوێنهاتەکان، یان بە زەرەر و زیانی ئەنجامدەر و جێ بەجێ کەرەکەیەتی، یاخود بە زەرەر و زیانی موسڵمانانی ترە، کە ئەم فەرموودەیە باسی لە هەردوو سەرچاوەی شەڕ و خراپە و شوێنەما و شوێنهاتەکانی بەسەر ئەنجامدەر و خەڵکانی ترەوە کردووە و قسەی لەسەر کردووە.

---

٢١ اخرجه ابو داود (٥٠٦٧) والترمذی (٣٣٩٢)، واتای ئەم فەرموودەیە لە قەڵای موسڵمانەوە وەرگیراوە.

## پەنا بردن بۆ پەروەردگار لە کاتی خوێندنی قورئاندا:

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەڵات دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ (٩٨)لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (٩٩) إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ﴾ سوورەتی نەحل ٩٨ – ١٠٠.

واتە: ئینجا کاتێك قورئانت خوێند و دەوورت کردەوە، ئەوە پەنا بگرە بەخوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو بێگومان شەیتان دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە کە پشتیان پێ بەستووە و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئەو دەبن، هەروەها ئەوانەش کە هاوەڵگەرن (مشرك) بۆ پەروەردگار.

پەروەردگار داوای کردووە و فەرمانی فەرمووە کە ئەهلی ئیمان لەکاتی خوێندنی قورئانی پیرۆزدا، پەنا بەو بگرن و هاوار بۆ لای ئەو ببەن، ئەمە بەهۆی ئامراز و هۆکار گەلێکە کەبریتین لە:

١. قورئانی پیرۆز چارەسەر و دەوا و دەرمانی نەخۆشییە دەروونییەکان و لەناوبەری دوو دڵی و دڵەڕاوکێ و پەرێشانی و ڕاکێشان و خواستە ناڕەواکانی شەیتانە.

قورئانی پیرۆز دەوا و دەرمانی ئەو ئازار و ناڕەحەتی و ئێش و سەختییانەیە کە شەیتان لە نەفسی مرۆڤدا درووستی کردوون، بەهۆی ئەمەوەیە کە پەروەردگار فەرمانی فەرمووە کە هۆکاری نەخۆشییەکە واتە شەیتان دوور بخرێتەوە و ڕاو بنرێ و دڵ لەو هۆکاری نەخۆشیە کە شەیتانە پاك بکرێتەوە، تاوەکو دەرمان و جێگەیەکی گونجاو و شیاو بۆ کاریگەرییەکانی خۆی پەیدا بکات. بە هەمان شێوە کە وتراوە:

أتاني هواها قبل أن أعرف الهوى فصـادف قلبـا خاليا فتمكنا

واتە: پێش ئەوەی نەفس بناسین، هەوا و ئارەزووەکەی بەدوامدا هات و ڕووبەڕووی دڵێکی خاڵی بوویەوە و زاڵ بوو بەسەریدا.

ئەم دەوا و دەرمانە چارەسەرکەرەشی لە دڵێکدا جێگیر دەبێ کە ئەو دڵە خاڵی کرابێ لە ناحەز و نەیارەکانی، ئەوسا کاریگەری و شوێنهات و شوێنەمای خۆی بەجێ دەهێڵێ و کاریگەری دەبێ بەسەرییەوە.

٢. قورئانی پیرۆز سەرچاوەی ڕێنموونی و زانست و کەڵك و قازانج و دەسکەوتە لە دڵدا. هەر وەکو چۆن ژیانی ڕووەك و گژو گیاکان پەیوەستە بە بوونی ئاوەوە (واتەگەر ئاو نەبێ ژیانی ئەو ڕووەك و گژو گیایانەش کۆتایی پێ دێت و بوونی نابێ، وەرگێڕی کورد). شەیتانیش هەر وەکو ئاگر کە تەواوی گژو گیاو درەختەکان دەسووتێنێ، هەرکاتێ هەستی بەوە کرد و زانی کەوا نەمامێکی خێر و چاکە لەدڵدا نێژراوە و ڕوواوە، هەوڵ دەدات و تێدەکۆشێ کەوا وشکی بکات و بیسووتێنێ و لەناوی ببات.

بەهۆی ئەمەوەیە کەوا فەرمان کراوە بە ئەهلی ئیمان و داوایان لێ کراوە کە بەهۆی ڕێگە گرتن لە وشك بوونی نەمامی زانست، ڕێنموونی، ئیمان و کاروکردەوەی چاکە لەلایەن شەیتانەوە، پەنا بۆ پەروەردگار ببەن و دەستەو دامێنی بن (واتە پەنا ببەنە بەر ڕێنموونییەکان و ئامراز و هۆکاری گەشەکردنی زانست، ڕێنموونی و ئیمان و هاوکاری و ئاریکاری پەروەردگار). جیاوازی نێوان ئەم بابەتە و بابەتی پێشووتری، ئەمەیە کە لە شێوەی یەکەمدا پەنا بردن بۆ پەروەردگار لە شەڕی خراپەی شەیتان، بەهۆی گەیشتن و بەدەستهێنانی کەڵك و قازانجی قورئانی پیرۆزە. بەڵام لەباری دووەمدا بۆ پاراستن، مانەوە و چەسپاندن و گەشەکردنی ئەو کەڵك و قازانجانەیە.

وەك چۆن کەسێ بڵێ: پەنا بردن و داواکردن دوای قورئانیش بەم بابەتە ڕاستی دەبەخشێ.

ئەمە وتەو تێبینییەکی زۆر بەجێ و جوانە، بەڵام شەریعەت و شوێنەمای هاوەڵان (اصحاب) ڕوونکەرەوەی داواکردن و پەنا بردنە بۆ پەروەردگار لە شەڕ و خراپەی

شـەیتان بـەر لـە خوێندنـەوەی قورئـانی پـیرۆزدا. وە ڕاو بۆچـوونی زۆربـەی زانایـانی پێشینە (سلف)و دواینە (خلف)ی گەل، بەرهەمی هەردوو بۆچوونەكەیە.

٣. مەلائیكەكان لە قورئان خوێنـەكان نزیـك دەبنـەوە و گـوێ لـە خوێندنەوەكـەیان دەگرن.

بە هەمان شێوە كە لە فەرموودەیەكدا لە ئوسەیدی كوڕی حوزەیرەوە هـاتووە كـە لەكاتی خوێندنەوەی قورئانی پـیرۆزدا هـاڵێكی دڵڕفێنـی بینیـوە كـە تێیـدا چـرا گـەلێ داگیرسا بوون و پێكرابوون. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فـەرموویان: ئەوانـە مەلائیكـەكانن. بـەڵام شـەیتان درووسـت لـە بەرامبـەر مەلائیكەكانەوەیـە و لەگەڵیانـدا دوژمنـی و ناحـەزی و نـا تـەباییان هەیـە، بۆیـە پـەروەردگار داوای لـە ئـەهلی قورئـان كردووە كە بۆ پاراستن و دووركەوتنەوەیان لە شەڕ و خراپەی شەیتان، پەنای بۆ ببـەن ونزیكان و خۆشەویستان وفریشتەكان لێی نزیك ببنـەوە. جـوان خوێندنـەوەی قورئـانی پیرۆز وەك میـوانێكی تایبـەتی وایـە كـە فریـشتەكان و چاكەكان لەگـەڵ شـەیتانەكاندا لەوێدا پێكەوە كۆ نابنەوە و ئامادە نابن.

٤. شەیتان تەواوی توانا و یارمـەتی دەرانـی و ئاریكـاران و دەسـت و پێوەنـدەكانی خۆی بۆ سەرقاڵ كردنی قورئان خوێنان و گوێگران لـە ئامـانج لـە خوێندنـەوە، تـەگبیر كردن و ڕاوێژ و تێگەیشتن و زانـایی ویـستراوی خـاوەن قورئـان — واتـە پـەروەردگاری مەزن — ئامادە دەكات و لێدەبڕێ وهەوڵ دەدات و تێدەكۆشێ، كـە دووریـان بخاتـەوە لە تێگەیشتن و كاركردن بە قورئانی پیرۆز و بەهرەمەنـد بوونیـان لـە قورئـان تـەواو و كامڵ نەبێ. لەبەر ئەوەیە كە پەروەردگار قورئان خوێنـانی ڕاسپاردووە بـۆ پاراسـتن و پارێزگاری كردنی خۆیان بەرامبەر بەو هەوڵ و كۆششانەی شەیتان پەنا بۆ پەروەردگار (جل جلاله) ببەن و هاواری لێ بكەن.

٥. خوێنەری قورئان لە كاتی خوێندنەوەی قورئاندا لە ڕاستیدا سەرقاڵی وتـوو وێـژو پاڕانەوەیە لەگەڵ پەروەردگارداو لە گێڕانەوەیەكدا هاتووە كە: پەروەردگار لە گـوێرانی

بێژان بەدەنگی ئاهەنگ و ساز و دەهۆڵی خۆیان بە بیستنی خوێندنەوی قورئان خوێنان بۆ گوێدانە ئاواز و چۆنییەتی خوێندنی شیرینی قورئان تامەزرۆترە.

لەلایەکەوە شەیتان لە ئاواز و گۆرانی خراپ و لادەر تام و چێژ وەردەگرێ، بۆیە پەروەردگار قورئان خوێنانی ڕاسپاردووە و وریاری کردوونەتەوە کە: لەکاتی خوێندنەوەی قورئاندا پەنا بگرن بە پەروەردگار لە شەڕ و خراپەی شەیتان.

٦. پەروەردگاری گەورە و بەدەسەڵات فەرموویانە: کەوا هیچ نێردراو و پێغەمبەرێ نەبووە کە شەیتان دوو دڵی نەخستبێتە نێو هیوا و ئارەزووەکانییانەوە، تەواوی زانایانی سەلەف لەم باوەڕەدان کە هەرکاتێ قورئان خوێنان قورئان دەخوێننەوە شەیتان بۆ درووست کردن و هێنانە کایەی سەرقاڵی و دوور خستنەوەیان لە قورئان، دەست بەکار دەبێ و تووشی دوو دڵی و سەرقاڵییان دەکات. کاتێك کە شەیتانی — نەفرین لێکراو — بەم جۆرە لە گەڵ پێغەمبەران و نێردراوانی خواوەند هەڵس و کەوت دەکات و دەجووڵێتەوە، ڕوون و ئاشکرایە کە دەیەوێی چۆن لەگەڵ خەڵکانی تردا هەڵس و کەوت بکات.

لەم پەیوەندییەدا هەندێ جار قورئان خوێنەکە تووشی هەڵە دەکات و هەندێ جاریش تووشی بێ ئاگایی و زمانیشی تووشی گرفت دەکات (واتە جاری وا هەیە وشەکانی بۆ نایەو زمانی تەتەڵە دەکات و کورد واتەنی وشەکان وەك خۆیان نایەنە سەر زاری، وەرگێڕی کورد)، هەندێ جاریش لە ئامادەیی دڵ و تێگەیشتن دووری دەخاتەوە. هەرکاتێ شەیتان لەکاتی خوێندنی قورئاندا ئامادە ببێ بێ شك یەکێ لەو کارانە ئەنجام دەدات و هەندێ جاریش لەوانە تەواوی ئەو کێشە و گرفتانە بۆ قورئان خوێنان و گوێگرەکان درووست بکات و بیانهێنێتە دی. بۆیە پەنا گرتن بە پەروەردگار لە دوور کەوتنەوە لە شەڕ و خراپەی شەیتان یەکێکە لە کارو کردەوە چاکە و بەنرخەکان.

٧. كاتێ كه‌ ئینسانێ ویست و ئیراده‌ ده‌كات و ده‌یه‌وێ هه‌نگاو هه‌ڵبگرێ به‌روه‌ كارێكی خێر و چاك،شه‌یتان ته‌واو نیگه‌ران ده‌بێت و ته‌واوی هه‌وڵ و كۆششه‌كانی خۆی بۆ به‌ستنی رێگه‌ لێی به‌كار ده‌هێنێ. (واته‌ ئه‌وپه‌ڕی هه‌وڵ و كۆششی خۆی ده‌خاته‌ گه‌ڕ بۆ ئه‌وه‌ی كاره‌كه‌ی پێ په‌ك بخات و سوود و قازانج و خێر تووشی ئه‌و كه‌سه‌ نه‌بێت، وه‌رگێڕی كورد).

له‌ فه‌رمووده‌یه‌كی صه‌حیحه‌وه‌ كه‌ له‌ پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ (صلى الله علیه وسلم) گێڕدراوه‌ته‌وه‌ هاتووه‌ كه‌: ((**ان شیطاناً تفلّت عليّ البارحة فأراد ان يقطع عليّ صلاتي**)).[22]

واته‌: ((دوێنێ شه‌و شه‌یتانێك به‌ده‌ستمه‌وه‌ ڕزگاری بوو ده‌یویست كه‌وا نوێژه‌كه‌م ببڕێ)).

به‌ هه‌ر ئه‌ندازه‌ی ئه‌و هه‌نگاو نان و ده‌ست به‌كاربوونه‌ بۆ مرۆڤ به‌ سوودترو به‌ كه‌ڵك تر بێ و په‌روه‌ردگار زیاتر — ئه‌و كاره‌ی — خۆش بووێ، هه‌وڵ و كۆششی شه‌یتان بۆ درووستكردن و هێنانه‌ كایه‌ی كێشه‌و گرفت تێیدا زیاتره‌.

له‌ مسندی ئیمام ئه‌حمه‌ددا له‌ فه‌رمووده‌یه‌كدا له‌ سه‌بره‌ی كوڕی ئه‌بیلفاكیه‌ هاتووه‌ كه‌ له‌ پێغه‌مبه‌ری خوای (صلى الله علیه وسلم) بیستووه‌(ان الشيطان قعد لابن آدم باطرقه، فقعد له بطريق الاسلام، فقال اتسلم وتذر دينك ودين آبائك؟ فعصاه فأسلم، ثم قعد له بطريق الهجرة :فقال اتهاجر وتذر ارضك وسمائك؟ وانما مثل المهاجر كالفرس في الطول، فعصاه وهاجر، ثم قعد له بطريق الجهاد– وهو جهاد النفس والمال فقال:تقاتل فتقتل، فتنكح المرأة ويقسم المال؟ قال فعصاه فجاهد ((شه‌یتان له‌سه‌ر ته‌واوی ئه‌و ڕێگایانه‌ی كه‌ مرۆڤ ده‌یان گرێته‌ به‌ر، بۆسه‌ و كه‌مین داده‌نێ، سه‌ره‌تا له‌سه‌ر ڕێگه‌ی موسڵمان بوونی ئه‌و داده‌نیشێ و پێی ده‌ڵێ: ده‌ته‌وێ واز له‌ ئایینی باب و باپیران بهێنێ و ببیته‌ موسڵمان؟!

---

٢٢ متفق علیه (٤٦١) م (٥٤١).

ئەگەر ئادەمیزاد واز لە فەرمانەکەی ئەو – شەیتان – بهێنێ و سەرپێچی لێ بکات و بە موسڵمانی بمێنێتەوە و موسڵمان بێ، شەیتان سەبارەت بە کۆچکردنی ئەو دێتە ناوەوە و هەنگاو هەڵدەگرێ و پێی دەڵێ: دەتەوێ واز لە زەوی و ئاسمانی وڵاتەکەت بهێنی و بەجێی بهێڵی و برۆیتە شوێنێکی ترەوە؟!... ئەگەر دژی فەرمانەکەی – شەیتان – جووڵایەوە و سەرپێچی لێ کرد و ڕێگەی کۆچکردنی گرتە بەر، لەسەر ڕێگەی ویست و نیازی تێکۆشانی (جیهاد)، واتە تێکۆشانی گیانی وماڵی بۆسەو کەمین دادەنێ و پێی دەڵێ: دەتەوێ برۆی بۆ جیهاد و تێکۆشان (مەیدانی جەنگ و جەنگ کردن لە پێناو پەروەردگاردا لەگەڵ ستەمکاران و ملهوڕان و بێباوەڕاندا، وەرگێڕی کورد). تاوەکو بکوژرێیت و خەڵکانی تر ژنەکەت بۆ خۆیان مارە بکەن و ماڵ و سامانەکەت لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن؟! بەڵام (مرۆڤی ئەهلی ئیمان و ویست و ئیرادە و زانست) سەرپێچی و نافەرمانی لێ دەکات و ڕێگەی تێکۆشان (جیهاد) دەگرێتە بەر)).

شەیتان لە سەر تەواوی ڕێگەی کارە چاکەکانی مرۆڤ کەمین و بۆسە دادەنێ.

مەنسور لە موجاهیدەوە گێڕاوییەتەوە کە: ((هەرکاتێ کاروانێ بۆ ڕۆیشتن بۆ مەککە باری سەفەری بپێچێتەوە، شەیتانیش بە ئەندازەی ئەوان هێز و توانا و خەڵك بۆ ئەو سەفەرە ئامادە و فەراهەم دەکات)).[٢٣]

شەیتان بەردەوام بەدوای دەرفەتێکەوەیە بۆ زەربە و زەنگ دان بە مرۆڤ، بە تایبەتی لەکاتی قورئان خوێندندا. بۆیە پەروەردگار فەرمانی بە بەندەکەی داوە کە پەنا بگرێ بە پەروەردگار لە شەڕ و خراپەی ئەو دوژمنەی کە دەیەوێ لەمپەر و ڕێگر لە سەر ڕێگەی درووست بکات! وە دواتر ڕێگەی خۆی بگرێتە بەر. هەر وەکو چۆن ڕێبوار و موسافیرێ کە ئەگەر لەمپەر و ڕێگرێ لەسەر ڕێگەی خۆیدا ببینێ لە سەر ڕێگەکەی لای دەبات و پاشان درێژە بە ڕێگەکەی دەدات.

---

٢٣ رواه ابن ابی حاتم فی تفسیره.

٨. پەنا گرتن پێش قورئان خوێندن نیشانە و ئاگادارییەکە کەوا ئەوەی کە دەخوێندرێتەوە قورئانی پیرۆزە. واتە وتنی (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم). پێشەکیو بیرهێنانەوەیەکە بۆ گوێگران کە وا خوێندنی وتەی پەروەردگار — قورئانی پیرۆز — خەریکە دەست پێ دەکات و هەرکاتێ گوێگر ئەو پەنا گرتنەی بیست، خۆی ئامادە دەکات بۆ بیستنی وتە و کەلامی پەروەردگار (جل جلالە). تەنانەت ئەگەر قورئان خوێن هەر خۆیشی بێت و بە تەنیا بێت، دووبارە وتنی پەناگرتن (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) بەهۆی بابەت گەلێ کە وترا، پێویستە.

ئەوەی کە باسکراو خرایە ڕوو هەندێکە لە کەڵك و قازانجەکانی پەنا گرتن بەخوا، ئیمامی ئەحمەد لە گێڕانەوەیەکدا هێناوییەتی کە پێش نوێژ و کاروبارەکانی ترەوە پەنا گرتن (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) ناوترێ، مەگەر ئەو پەناگرتنەی کە پەروەردگاری بە توانا و بەدەسەڵات لەبارەیانەوە فەرموویانە: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ سوورەتی نەحل ٩٨.

واتە: ئینجا کاتێك قورئانت خوێند و دەورەت کردەوە، ئەوە پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو.

لە گێڕانەوەی ئیبن مەشیدا هاتووە کە: ((هەرکاتێ کە قورئانی دەخوێندەوە پەنای بە پەروەردگار دەگرت بە وتنی (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم)،)).

## پەناگرتن لە شەیتانەکانی جین و ئینس:

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەڵات دەفەرمووێت: ﴿وَقُلْ رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ (٩٧) وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ﴾ سوورەتی موئمینوون ٩٧ — ٩٨.

واتە: خۆت بسپێرە بە خوا و بڵێ: پەروەردگارا من پەنا دەگرم بە تۆ لە هەموو خەتەرە و خەیاڵ و وەسوەسەی شەیتانەکان، پەنا دەگرم بە تۆ ئەی پەروەردگارم کە شەیتانەکان بە دەورمدا کۆ ببنەوە و سەرم لێ بشێوێنن.

هەمەزاتى (همزات) شەياتين، درووستكردن و هێنانەدى دوو دڵى و فريودانى ئەوانە بەسەر دڵدا.

ئيبن عەبباس و حەسەن وتوويانە: ((هەمەزاتى شەيتانەكان درووستكردنى دوو دڵىو هەڵخەڵەتاندنە)).

سەبارەت بەمەى كە وا پەروەردگار دەفەرموويت: ﴿وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ﴾.

ئيبن زەيد دەڵێ: ((واتە پەناگرتن لەوەى كەوا لە كاروبارى ژيانى مندا بەشدارى بكەن)).

كەلبيش دەڵێت: ((واتە بۆ ئەوەى كە وا لە كاتى خوێندنەوەى قورئاندا ئامادە نەبن و بوونيان نەبێت)).

عەكرەمەش دەڵێت: ((واتە لە كاتى مردن و ڕۆح كێشان و ڕۆح دەرچووندا ئامادە نەبن)).

پەروەردگار موسڵمانانى بە هەردوو جۆرى شەڕ و خراپەى شەيتان واتە كەوتنە ژێر كاريگەرى دوو دڵييەكانى و ياخود نزيك بوونەوە و ئامادە بوونيان فەرمانى فەرمووە (داوە).

پەروەردگار ئەو ئايەتەى دواى ئەم ئايەتە باس فەرمووە كە: ﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ﴾ سوورەتى موئمينوون ٩٦.

واتە: هەوڵ بدە بە چاكترين و جوانترين شێوە پاڵ بە هەڵە و ناڕێكى ناحەزانەوە بنێيت و خەمت نەبێت ئێمە چاك ئاگادارين لە گوفتار و قسەى ناڕەوايان.

فەرمانى پێكردووە كە بە جوانترين و چاكترين ڕێگە ڕووبەڕووى خراپەكارى و قسە خراپەكانى خەڵكى بێتەوە و لە ڕێگەى پەنا بردن بۆ پەروەردگار و پەناگرتن بەو شەڕو خراپەى شەيتانە ديار و نادیارەكان، ياخود جنۆكە و مرۆڤ، لە خۆى دوور بخاتەوە. چەشنى ئەمەش لە سوورەتى ئەعرافدا فەرموويەتى كە: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾ سوورەتى ئەعراف ١٩٩.

واتە: کاری ئاسان لە خەڵکی داوا بکەو چاوپۆشی لە هەڵە و کەم و کوڕییەکانیان بکە و فەرمان بدە بە چاکە و کردەوەیەك کە پەسەندی شەرعە، ڕووش وەرگێڕە و پشت بکە لە نەفام و تێ نەگەیشتووان.

پەروەردگار فەرمانی بە مرۆڤەکان کردووە کە لە ڕێگەی پشت کردن و ڕوو هەڵچەرخاندن لە نەزان و نەفامەکان خۆیان لە شەڕ و خراپەی ئەوان دوور بخەنەوە و بپارێزن. دواتر فەرمانی پێکردوون کە وا لە ڕێگەی پەناگرتن بە پەروەردگار خۆیان لە شەڕ و خراپەی شەیتان دوور بخەنەوە و خۆیان بپارێزن: ﴿وَإِمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ سوورەتی ئەعراف ٢٠٠.

واتە: ئەگەر وەسوەسەیەکت لە لایەن شەیتانەوە بۆ پێشهات و ویستی لە خشتەت بەرێ و تووشی هەڵەت بکات، جا ئەوە تۆ پەنا بگرە بە خوا و پشت بەو ببەستە، چونکە بەڕاستی ئەو بیسەر و زانایە.

وتەیەکی تری هاوچەشنی ئەمەی لە سوورەتی (فوصیلەتدا) فەرمووە کە: ﴿وَلا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾ سوورەتی فوصیلەت ٣٤.

واتە:بێگومان چاکە و خراپە وەك یەك نیین، (تۆ ئەی بڕوادار) بە جوانترین و چاکترین شێوە بەرەنگاری خراپە و نادرووستی بکە، ئەو کاتە ئیتر دەبینیت ئەوەی کە لە نێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتی و ساردییەك هەیە، دەبێتە دۆستێکی دڵسۆز و گیانی بە گیانی.

ئەمە بۆ دوورکەوتنەوە و پەنا گرتنە لە شەڕ و خراپەی شەیتانە ئینسییەکان، بەلاَم دوای ئەوەش دەفەرموێت: ﴿وَإِمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ سوورەتی فوصیلەت ٣٦.

واتە: ئەی ئیماندار، ئەگەر لە لایەن شەیتانەوە خەتەرە و خەیاڵی نادرووست لە دڵو دەروونتدا دروست بوو ئەوە تۆ داوای یارمەتی لە خوا بکە و پەنای پێ بگرە، چونکە بەڕاستی ئەو بیسەر و زانایە.

## پەیوەندی نێوان خۆڕاگری و پەناگرتن:

قورئانی پیرۆز ئەهلی ئیمانی بە سادەترین شێوەی ڕووبەڕوو بوونەوە لە گەڵ ئەو دوو دوژمن و ناحەزەدا – واتە نەفس و شەیتان – ڕێنموونی کردووە، شێوە گەلێ وەك: پەناگرتن لە شەیتان و ڕوو هەڵچەرخان و پشت تێکردن لە نەزان و نەفامەکان و دوور کردنەوە و لابردنی خراپە و شەڕی خەڵکیش ئەویش بە چاکەکردن. وە ئەم بابەتەی وە بیر خستووینەتەوە کە هەر کەسێ ئەو جۆرە ڕێگەیە بگرێتە بەر لە بەش و پشکی گەورە و مەزن بەهرەمەند دەبێ و نەك ئەوەی کەوا لە شەڕ و خراپەی دوژمن و ناحەز ڕزگاری دەبێت، بەڵکو وەکو هاوڕێیەکی دڵسۆز و میهرەبانی لێدەکات، وە دەبێتە هۆی بەدەست هێنانی خۆشەویستی و دۆستایەتی و پێ هەڵنان و باسکردنی خەڵکی و لەناو بردنی ڕاکێشانەکانیان و تەندروستی و تەواوی دڵ لە ڕق و کینە، وە تەنانەت ناحەز و دوژمنەکانیش بە هاوڕێیەتی لە گەڵیدا هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی دەکەن.

ئەوەی وترا، بەرژەوەندی گەلێکە، زیادە لەسەر ڕێز و پاداشت و ڕەزامەندی پەروەردگار، ئەمە ئامانج و مەبەستی کۆتایی و ماوە درێژی هەر مرۆڤێکی ئەهلی ئیمانو ئەندێشەیە.

چونکە شتێکی وەك ئەمە جگە لە ڕێگەی خۆڕاگرییەوە شیاو و مومکین نییە، چونکە پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَمَا يُلَقَّاهَا إِلاَّ الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلاَّ ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾ سوورەتی فوصیلەت ٣٥.

واتە: جا کەسیش ناتوانێت بەو ڕەفتارە هەڵسێت جگە لەوانەی کە ئارامیان گرتووە، هەروەها کەسیش ناتوانێت هەڵوێستی وا بنوێنێت جگە لە کەسێك نەبێت کە خاوەنی بەهرەیەکی گەورە بێت.

چونکە مرۆڤی شێت و نەفام، پەلەکەر، هەستیار و خۆڕانەگر، توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی نییە لە گەڵ شەیتانە جنۆکە و ئینسییەکان (شياطين الجن والإنس).

لەبەر ئەوەی تووڕەیی ئامرازێکە لە خزمەت شەیتاندا، نەفسی تووڕەو شەیتان هەردووکیان دژ بە نەفسی موتمەئینەن کە مرۆڤ بانگ دەکات بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی هەر چ باشتر لە گەڵ خراپەی خەڵکی دا یەك دەگرن، بەڵام داوا لە مرۆڤ کراوە و فەرمانی پێکراوە کەوا بۆ گەشەکردن و بەهێزکردنی نەفسی موتمەئینە هانا بۆ پەناگرتن بەرێت. چونکە پەناگرتن توانای مرۆڤ بەهێز دەکات بۆ ڕووبەڕو بوونەوەی سوپاکانی نەفسی تووڕە و فیتن ئاوی و پشتیوان و لایەنگرانی گەورە و مەزنی وەك: (خۆڕاگری و ئیمان و پشت بەستن) بە هانای نەفسی (موتمەئینەوە) دێن و هاوکاری دەکەن و دڵ و ویست و ئیرادە لە زاڵ بوون و دەسەڵاتی شەیتان ڕزگار دەکەن و بەسەریداو سەرکەوتوو دەبن، چونکە: ﴿لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ سوورەتی نەحل ٩٩.

واتە: بێگومان شەیتان دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە کە پشتیان پێ بەستووە و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئەو دەبن.

## شەیتان دەسەلاتی بە سەر ئەهلی ئیماندا نییە، یانی چی؟

موجاهید و عەکرەمە و ڕاڤەکەرانی تری قورئان دەڵێن: ((واتە شەیتان هیچ بەڵگە و بیانووی نییە بەسەر ئەهلی ئیماندا)). بەڵام درووست تر ئەمەیە کەوا بوترێ: شەیتان ڕێگەیەکی نییە تاوەکو زاڵ ببێ بەسەر ئەهلی ئیماندا، نە لە ڕووانگەی بەڵگە و بیانووەوە و نە لە ڕووانگەی هێز و تواناوە. چونکە سوڵتان و پاشا هێز و توانایشی هەیە، لەو ڕووەوە بە بیانو و بەڵگە دەوترێ سوڵتان و پاشا، چونکە لەڕێگەی ئەوەوە خاوەنی سوڵتان وەکو خاوەنی هێز و توانا بە تەواوی زاڵ دەبێ بەسەر لایەنی بەرامبەریدا و دەسەڵاتی بەسەردا پەیدا دەکات.

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەڵات ئاماژەی بەم بابەتە کردووە کە دوژمن و ناحەزێکی وەك شەیتان هیچ هێز و توانایەکی نییە بەسەر بەندە دڵپاك و ئەهلی پشت بەستنەکاندا (توکل).

له سووره‌تی حیجردا ده‌فه‌رموویێت: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ (٣٩) إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ (٤٠) قَالَ هَذَا صِرَاطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ (٤١) إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلَّا مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ﴾ سووره‌تی حه‌جه‌ر ٣٩– ٤٢.

واته: ئیبلیس به بوغزو کینه و حه‌ساده‌ته‌وه وتی: په‌روه‌ردگارم، ماده‌م به‌هۆی ئه‌م ئینسانه‌وه منت سه‌ر لێشێواو کرد، شه‌رت بێت له زه‌ویدا هه‌موو گوناه و لادان و تاوانێکیان لا جوان و شیرین بکه‌م و هه‌ر هه‌موویان سه‌ر لێشێواو و سه‌ر گه‌ردان بکه‌م، بێجگه له به‌نده پوخته و دڵسۆزه‌کانی خۆت نه‌بێت، چونکه دڵیان به باوه‌ڕ به تۆ و یادی تۆ ئاوه‌دانه، هه‌وڵ و کۆششی من بۆ وێڵ کردنیان ناکامه، خوای گه‌وره فه‌رمووی: ئایا ئه‌وه ڕێگه و ڕێبازێکی ڕاست و درووسته هه‌ر بۆ لای من دێت و هه‌ر من چاودێری ده‌که‌م، به‌ڕاستی به‌نده چاك و پاکه‌کانی من به تۆ فریو نادرێن و تۆ هیچ ده‌سه‌ڵاتێکت نییه به‌سه‌ریاندا، جگه له‌وانه‌ی که شوێنت که‌وتوون له سه‌رکه‌ش و یاخی و سه‌رگه‌ردانه‌کان.

هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموویێت: ﴿لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (٩٩) إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ﴾ سووره‌تی نه‌حل ٩٩ – ١٠٠.

واته: بێگومان شه‌یتان ده‌سه‌ڵاتی به‌سه‌ر ئه‌وانه‌دا هه‌یه که پشتیان پێ به‌ستووه و ملکه‌چ و فه‌رمانبه‌رداری ئه‌و ده‌بن، هه‌روه‌ها ئه‌وانه‌ش که هاوه‌ڵگه‌رن بۆ په‌روه‌ردگار.

ئه‌م ئایه‌ته دوو بابه‌ت له خۆ ده‌گرێت:

**یه‌که‌م:** لابردن و لادانی زاڵبوون و ده‌سه‌ڵاتی شه‌یتان به‌سه‌ر ئه‌هلی یه‌کخواپه‌رستیدا (توحید)، یه‌ك دڵی و یه‌ك ئیمانی.

**دووه‌م:** سه‌لماندنی زاڵبوون و ده‌سه‌ڵات و فه‌رمانڕه‌وایی (حاکمییه‌ت) شه‌یتان به‌سه‌ر ئه‌هلی هاوه‌ڵ بۆ خوا دانه‌ران (شرك)، بێ باوه‌ڕ و ڕووباز و که‌سانێ که سه‌رپه‌رشتیان (الولایة) هه‌ڵبژاردووه و په‌سه‌ندیان کردووه.

کاتێك که ئه‌و دوژمن و ناحه‌زه‌ی ئایینی په‌روه‌ردگاره – شه‌یتان – زانی که‌وا په‌روه‌ردگار ڕێگه نادات که زاڵ ببێ به‌سه‌ر ئه‌هلی یه‌کخواپه‌رستی و پاك دڵاندا (توحید

اخلاص): ﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ (٨٢) إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾ سوورەتی ص ٨٢ – ٨٣.

واتە: ئینجا شەیتان وتی:سوێند بەدەسەلاّتی بێ سنوورت شەرت بێت هەر هەموویان گومڕا و سەرگەردان بکەم، جگە لە بەندە و عەبدە دڵسۆزەکانت کە هەڵبژاردەی خۆتن (دەسەلاّتی ئەوانم نییە).

شەیتان زانی بەوەی کەوا هەرکەسێ بە ئاگایانە و شارەزایانە و دڵپاکانە، هۆگری ئایینی پەروەردگار (جل جلاله) بێ و دەستی پێوە بگرێ و پشتی پێ ببەستێ، ئەوە – شەیتان – ناتوانێ گومڕای بکات و هەڵی بخەڵەتێنێ و لە ڕێگەی ڕاست لای بدات، بەڵکو تەنیا بەسەر ئەو کەسانەدا دەتوانێ زاڵ ببێ و دەسەلاّتی هەبێ بەسەریاندا کەوا خۆشەویستی و سەرپەرشتیاری ئەو قبوولّ بکەن و هاوەڵ وشەریك بۆ پەروەردگار بڕیار بدەن. ئەوانە خزمەتکار و شوێنکەوتووانی شەیتانن و تەنیا بەسەر ئەواندا زاڵ دەبێ و دەسەلاّتی هەیە.

ئەگەر بوترێ وەکو چۆن پەروەردگار لێرەدا زاڵ بوون و دەسەلاّتی ئەوی بەسەر سەرپەرشت و سەرپەرشتیارەکاندا ((وەلی)) دیاری کردووە و سەلماندوویەتی، چۆن لەم ئایەتەی خوارەوەیدا ڕەدی دەداتەوە: ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (٢٠) وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِمْ مِنْ سُلْطَانٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَنْ يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ﴾ سوورەتی سەبە ٢٠ – ٢١.

واتە: لەڕاستی دا گومانی شەیتان بە ڕاست دەرچوو بەرامبەر ئەو جۆرە کەسانە (کە ڕوو بە پەروەردگار کاتی خۆی وتبووی: دەبینیت زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزار نابن)، کەچی خەڵکی بێ پەروا هەر شوێنی کەوتن، جگە لە دەستەیەك لە بڕواداران. جا وە نەبێت ئیبلیس هیچ دەسەلاّتێکی بەسەریاندا ببێت، بەڵکو ئێمە ویستوومانە ڕوون بێت و دەربکەوێت، کێ باوەڕی بە قیامەت و ڕۆژی دوایی هەیە و کێش لە شك و

گوماندایە (دڵنیابە ئەی پێغەمبەر) کە پەروەردگاری تۆ ئاگادار و چاودێرە بەسەر هەموو شتێکدا و هیچ شتێکی لێ بزر نابێت.

لە وەڵامدا دەبێ بوترێ کە: ئەگەر ئەو جێناوە لە ئایەتی: ﴿وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِمْ مِنْ سُلْطَانٍ﴾ بۆ موسڵمانان و باوەڕداران بگەڕێتەوە، لە بنچینەدا شوێنی یاخود جێگەی بۆ ئەم پرسیارە بوونی نابێ، چونکە جیاوازی و جوداکردنەوە (جوداکردنەوە و جیاوازییەکی پساو و بڕاوەیە)، واتە: بەڵام ئەوانمان لە ڕێگەی شەیتانەوە تاقیکردەوەو هەڵمان سەنگاندن تاوەکو بزانین کەوا چ کەسێ بڕوای بە دواڕۆژ هەیە و چ کەسێکیش لەگومان و دوو دڵیدایە سەبارەت بەڕۆژی دوایی.

بەڵام ئەگەر بۆ ئەم فەرموودە و ئایەتە پیرۆزەی پەروەردگار بگەڕێتەوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ سوورەتی سەبە ٢٠.

واتە: لەڕاستی دا گومانی شەیتان بە ڕاست دەرچوو بەرامبەر ئەو جۆرە کەسانە (کە ڕوو بە پەروەردگار کاتی خۆی وتبووی: دەبینیت زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزار نابن)، کەچی خەڵکی بێ پەروا هەر شوێنی کەوتن، جگە لە دەستەیەك لە بڕواداران.

کە بە ڕووالەت ئەمە درووستە. تاوەکو جیاوازی و جووداکردنەوەی یەکلاکەرەوە، بەهۆی هەڵکەوتنییەوە لەدوای لابردن و دوورخستنەوەی ڕاست بێت و ئەم واتایە بگەیەنێ کەوا: ((شەیتانمان بەسەریاندا زاڵ نەکردووە و توانامان پێ نەبەخشیوە، مەگەر بەهۆی ئەوەی کەوا بزانین کە چ کەسێ بە ڕاستی بڕوای بە ڕۆژی دوایی هەیە و لێی دوو دڵ نییە)).

ئیبن قوتەیبە دەڵێت: ((کاتێ کە شەیتان داوای دەرفەت و مۆڵەتی کرد لە پەروەردگار، پەروەردگاریش مۆڵەت و ماوەی پێدا و دواتر شەیتانی نەفرین لێکراو وتی: ئەوان تووشی گومڕایی و هەڵخەڵەتاندن دەکەم و فەرمانیان پێ دەکەم بە فلانە کار و کردەوە و لەنێوان بەندەکانتدا بەدڵنیاییەوە کەسانێ بۆ خۆم هەڵدەبژێرم و

دەست نیشان دەکەم، کاتێك کە شەیتان وەهای دەوت: دڵنیا نەبوو ئەوەی کە لەبەر چاوی گرتووە بێ شك دێتە دی، بەڵکو ئەوەی کە دەیوت لەسەر بنچینە و بناغەی گومان و دوو دڵی بوو)). بەڵام دواتر کە بینی و بۆی دەرکەوت کەوا ژمارە و ڕێژەیەك شوێنی کەوتوون و پەیڕەوی لێ دەکەن، گومان و دوودڵییەکەی گۆڕا و بوو بەڕاستی (یەقین). دواتر پەروەردگار (جل جلاله) فەرمووی: زاڵ بوون و دەسەڵات پەیدا کردنی شەیتان بەسەریاندا بەهۆی شارەزایی و ئاگاییە لە سروشتی ئەهلی ئیمان و ئەهلی گومان و دوو دڵی بووە، واتە لە باروودۆخێکی کردەیی و ڕاستەقینەدا (عملی و واقعی) بیان بینین تاوەکو بەڵێنەکەمان بەسەریاندا بچەسپێ و بێتەدی و شیاوی پاداشت و سزادان و تۆڵە بن.

لەسەر ئەم ئەساس و بنچینەیەدا شەیتان بەسەر ئەو کەسانەدا زاڵ دەبێ و دەست دەگرێت بەسەریاندا کەوا بڕوایان بەڕۆژی لێپرسینەوە — ڕۆژی دوایی — نییە و سەبارەت بەو ڕۆژە لە گومان و دوو دڵیدان، ئەوانە هەمان ئەو کەسانەن کە سەرپەرشتی و سەرپەرستی شەیتانیان هەڵبژاردووە و کردوویانەتە شەریك و هاوەڵی پەروەردگار! بەم جۆرە دەسەڵات و توانای شەیتان بەسەریاندا دەچەسپێ و دەسەلمێنرێ و نکوڵی لێ ناکرێت و ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتەکانی تردا هاوڕێ و هاودەنگ دەبێ.

ئەگەر بێت و پرسیار بکرێت سەبارەت بەوەی کەوا ئایەتی سوورەتی ئیبراهیم چۆن ڕاڤە دەکەن و لێکی دەدەنەوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الْأَمْرُ إِنَّ اللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدْتُكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ وَمَا كَانَ لِي عَلَيْكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ إِلَّا أَنْ دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنْفُسَكُمْ مَا أَنَا بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنْتُمْ بِمُصْرِخِيَّ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِ مِنْ قَبْلُ إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ سوورەتی ئیبراهیم ٢٢.

واتـە: کاتێـك هـەموو شـتێك تـەواو دەبێـت بەهەشـتییەکان دەچـنە بەهەشـتەوە و دۆزەخییەکان دەخرێنە دۆزەخـەوە، شـەیتان بـە فـەرمانی خـوا دێتـە قـسە و ڕوو بـە پەیڕەوانی دەڵێت: بە ڕاستی خـوا بـەڵێنی ڕاسـت و درووسـتی پـێ گەیانـدبوون منـیش بەڵێنی درۆو نا درووستم پێدان و جا توانیم گومڕاتان بکەم و لە ڕێبازی ڕاست وێڵتـان بکەم، وە نەبێت من هیچ زۆر و دەسەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا هەبووبێت، جگە لـەوەی بـە وەسوەسـە و خەتـەرە و خـەیاڵ بـانگم کـردن (بـۆ خـوا نەناسـی و تـاوان) ئێـوەش بەدەممەوە هاتن و بە قسەتان کردم، ئەمڕۆ من ناتوانم بە هانا و هـاواری ئێـوەوە بـێم، ئێوەش ناتوانن بە هانا و هاواری منەوە بێن، بێگومـان مـن بـاوەڕم نـەبوو بـەوەی کـە کاتی خۆی منتان کردبوو بە شەریك و هاوبەش لە پێشدا، بە ڕاستی ئەمڕۆ ستەمکاران سزای زۆر بە ئێش دەدرێن.

ئەگەر چی لە بنچینەدا ئەمە وتەی شـەیتانە، بـەڵام پـەروەردگار – ئـەو وتەیـەی – هێناوە و بۆی گێڕاوەتەوە و بڕیاری بۆی داوە، نەك ئەوەی کەوا نکوڵی لێ بکـات. ئەمـە ڕوونکەرەوەی ئەوەیە کە بابەتەکە بە هەمان شێوەیە.

دەبێ بوترێ: ئەم پرسیارە پرسیارێکی چاك و جوانە و وەڵامەکەیشی ئەمەیـە کـە مەبەست لـە دەسـەڵات و توانـای دوورخـراوە (نفـی) لـەم بارەیـەوە زاڵ بوونـە بـەهۆی بەڵگەو نیشانەوە. واتە من بەسەر ئێوەدا بەڵگە و نیشانەیە کە لە دژی ئێوە بەڵگـەیان پێ بهێنمەوە نیمە.

بە هەمان شێوە کـە ئیبن عـەبباس دەفـەرموێت: واتـە مـن خـاوەنی ئـەو بەڵگـە و نیشانەیە نیم کـە لـە دژی ئێـوەدا بـەکاری بهێـنم، هـیچ بەڵگـە و ڕێ نیشاندەرێکم پـێ ڕانەگەیاندوون و پیشانم نەداون. من – شەیتان – تەنیا ئێوەم بانگ کردووە بۆ لای بێ بـاوەڕی و هـاوەڵ بڕیـاردان بـۆ پـەروەردگار و (شـرك)، گـومڕایی و سـەر لێـشێواوی و ئێوەش قبووڵتان کردووەو وەرتان گرت و. باوەڕتان بە قسەکەم هێناو بەبێ هیچ جۆرە بەڵگەو نیشانەیەك کەوتنە دوام و شوێنم کەوتن و پەیڕەویتان لێ کردم.

بەڵام سەلماندن و چەسپاندنی دەسەڵات و توانای شەیتان لەم ئایەتەدا كە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ...﴾ سوورەتی نەحل ١٠٠.

واتە: بە ڕاستی تەنها دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە كە پشتیان پێ بەستووە و ملكەچ و فەرمانبەرداری ئەو دەبن.

زاڵ بوون و دەسەڵاتی ئەو بەسەریاندا لە ڕێگەی فڕ و فێڵ و گومڕاكردن و دەستەمۆكردنیان بەجۆرێكە كەوا بانگیان دەكات بۆ بێ باوەڕی و هاوەڵ بڕیار دان (كفر و شرك)و وابەستەیان دەكات بەخۆیەوە و وازیان لێ ناهێنێ و ڕێگە نادات كەوا واز لە بێ باوەڕی و هاوەڵ بڕیاردان بهێنن. بە هەمان شێوە كە پەروەردگاری مەزن و بەدەسەڵات دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا﴾ سوورەتی مەریەم ٨٣.

واتە: ئایا نابینیت بەڕاستی ئێمە چۆن شەیتانەكان دەنێرینە سەر خوانەناسان، بە گەرمی هانیان دەدەن بۆ تاوان و گوناهو خراپە.

ئیبن عەبباس دەڵێت: ﴿تَؤُزُّهُمْ أَزًّا﴾ واتە: بە توندی و بە سەختی ئەوان هەڵدەخەڵەتێنێ. لە گێڕانەوەیەكدا هاتووە كە: ئەوان تووشی شەلەل و ئیفلیجی و بێ توانایی و لاوازی دەكات. لە لێكدانەوەیەكی تردا: واتە ئەوان هان دەدات و ناچاریان دەكات بۆ تاوان و سەرپێچی كردن.

بەڵام حەقیقەت و ڕاستییەتی بابەتەكە ئەمەیە كە: وشەی "أزا" بە واتای جووڵان و هەڵنان و بزواندن دێت. بۆیە بە كوڵاندنی مەنجەڵ و قازان دەڵێن "ازیز" چونكە ئاو لەناویدا بەتوندی جووڵە و كوڵانی هەیە.

بە هەر جۆرێ بێ وشەی "أزا" هەڵگری دوو واتایە:

**یەكەم:** بزواندن و بە جووڵە دەرهێنان.

**دووەم:** داگیرسان و ڕۆشنكردن.

هەردوو واتاکە پێکەوە پەیوەندییەکی نزیکیان هەیە، چونکە جووڵە و بزواندن دۆخێکی تایبەتییە کە دەبێتە هۆی کوڵان و هەڵگیرساندن. ئەمە بەشێکە لە هەمان دەسەڵات و هێز و توانای شەیتان بەسەر شوێنکەوتووانی خۆی و ئەهلی هاوەڵ بڕیاردەراندا (شرك)، بەڵام بۆ ئەو پاشایەتی و هێز و دەسەڵاتی خۆی خاوەنی هیچ جۆرە بەڵگە و نیشانەی نییە و ئەوان تەنیا خۆیان داوەتە دەست بانگهێشت و بانگ کردنە فڕ و فێڵ کارییەکانی شەیتان و بەبێ داواکردنی بەڵگە و نیشانە لە شەیتان شوێنی - شەیتان - کەوتوون و خۆیان داوەتە دەست ئەو چونکە بانگهێشت و بانگ کردنەکانی شەیتان لەگەڵ هەوا و ئارەزوو و ڕاکێشانە نەفسییەکانی ئەواندا سازگاری هەیە و هاودەنگە لەگەڵیدا. ئەوانە بواری زاڵ بوون و دەسەڵاتی دوژمنیان بەسەر خۆیاندا فەراهەم کردووە و هاوکاری و ئاریکارییان کردووە، چونکە ئەویان لەگەڵ خواست و ئامانجە ناڕەواکانی خۆیدا هاو هەنگاو لە قەڵەم داوە. کاتێك کە بە ویستی خۆیان گەورەیی و سەرکردایەتی کردنی شەیتانیان قبووڵ کرد و خۆیان کرد بە دیلی، وەك تۆڵە سەندنەوە و سزایەك شەیتانی بەسەریاندا زاڵ کردووە.

لێرەدایە کەوا واتای ئەم فەرموودەیەی پەروەردگار"جل جلالە" زیاتر ئاشکرا و ڕوون دەبێتەوە کە دەفەرمووێت: ﴿الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِنْ كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِنَ اللَّهِ قَالُوا أَلَمْ نَكُنْ مَعَكُمْ وَإِنْ كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوا أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُمْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فَاللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾ سوورەتی نیسا ١٤١.

واتە: ئەوانەی کە خۆیان بۆ ئێوە مەڵاس داوە چاوەڕووانی بەسەرهاتتان دەکەن، ئەگەر سەرکەوتنێکتان لەلایەن خواوە دەست بکەوێت دەڵێن: ئەی ئێمە لەگەڵتاندا نەبووین..؟! خۆ ئەگەر کافرەکان بەشێکیان ببێت لە سەرکەوتن، دوو ڕووەکان دەڵێن: ئایا ئێمە لەسەر ئێوەمان نەدەکردەوە و نەمان هێشت ئیمانداران زیانتان پێ

بگەیەنن، ئینجا خوا لە ڕۆژی دواییدا داوەری دەکات لە نێوانتاندا (ئەی بێ باوەڕ و دوو ڕووەکان) دڵنیابن هەرگیز خوا نایەڵێت بێ باوەڕان بەسەر ئیمانداراندا دەست ڕۆیشتوو بن و ریشەکەنیان بکەن.

ئایەتەکە بەسەر بناغە و بنچینەی هەمان ڕواڵەت و گشتگیرییەوە جێگیرە، ئەوە باوەڕدارانن کەوا بە تووش بوون بە گوناح و سەرپێچی و نافەرمانی پەروەردگار، کە لەگەڵ ئیمانەکەیاندا دژایەتی دەکات و لە بەر بەرەکانێدایە، بوار دەڕەخسێنن بۆ چوونەوە پێش و زاڵ بوونی بێ باوەڕان، بەگوێرەی ئەو سەرپێچی و تاوانەی کە تووشیان بووە و ئەنجامیان داوە، (واتە مرۆڤ چەندە تووشی گوناح و تاوان و نافەرمانی بێت لە بەرامبەر پەروەردگاردا، بە هەمان ئەندازە خۆی ڕێگە خۆشکەرە بۆ ئەوەی شەیتان زاڵ ببێ بەسەریدا و دەسەڵاتی هەبێ بەسەریدا، وەرگێڕی کورد).

ئەوە خودی خۆیان بوون کەوا ئامراز و هۆکاری ئەو دەسەڵات و چوونە پێشەوە و زاڵ بوونەیان – زاڵ بوونی شەیتان بەسەر خۆیاندا – هێناوەتە دی و فەراهەمیان کردووە. (وەك کورد واتەنی دەڵێ: بەدەستی خۆم چیم کرد بەخۆم، وەرگێڕی کورد). وەك ئەو نافەرمانییەی کەوا موسڵمانان کردیان بەرامبەر بە فەرمانەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە جەنگی ئوحوددا کە بووە هۆی سەرکەوتنی موشریکەکان بەسەر موسڵمانەکاندا.

پەروەردگار خۆی شەیتانی زاڵ نەکردووە بەسەر ئەهلی ئیماندا و دەسەڵاتی پێ نەبەخشیوە، مەگەر کاتێ کەوا ئەوان – ئیمانداران – بە هۆی پەیڕەوی کردن و شوێنکەوتنی شەیتان و بەهاوەڵ دانانی شەیتان بۆ پەروەردگار (واتە شەیتانیان کردووەتە هاوەڵ وشەریکی پەروەردگار)، بواری زاڵ بوونی شەیتانیان بەسەر خۆیاندا

فەراهەم كردووە، لەم ئان و ساتەدایە كەوا پەروەردگار (جل جلالە) شەیتانی زاڵ كردووە بەسەر ئەو جۆرە كەسانەدا و سەری خستووە.

هەركەسێ گەیشتە ئەو بەختەوەری و كامەرانییەی كەوا پەروەردگار ڕێنموونی پێ ببەخشێ و بیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست، ئەوا با سوپاس و ستایشی پەروەردگار بكات و هەر كەسێكیش لە ڕێگەی گومڕایی و نەزانیدا هەنگاوی هەڵگرت با جگە لە خۆی لۆمە و سەركـــۆنەی كەس نەكات.

((یەكخواپەرستی، پشت بەستن و نیەت پاكی و یەك دڵی)) دەبنە ڕێگر و لەمپەرێ لــە بــەردەم زاڵ بــوونی شــەیتاندا، بــەڵام هــاوەڵ بڕیــاردان بــە هــەموو جــۆر و چەشنەكانییەوە، بوار دەڕەخسێنێ بۆ زاڵ بوونی شەیتان و تێكڕای ئەوانە لەسەر بناغە و بنچینەی نەریتی تاكە كەسێكە كە هەوسار و لەغاوی تەواوی كاروبارەكان بەدەست ئەو و لەژێر دەسەڵاتی ئەودایە و سەرجەم كارو كردەوەكان بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە و كۆتایی بەڵگە و بیانوو لای ئەوە و بۆ ئەو دەبێت. — واتە پەروەردگار — ئەگەر ئەو ویستی لەسەر بووایە و بیویستایە دەیتوانی تەواوی خەڵكی بكاتە گەلێكی یەكپارچە. بەڵام كارزانی و تەگبیر كردنی بەو جۆرەی نەویستووە. ﴿فَلِلَّهِ الْحَمْدُ رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَرَبِّ الْأَرْضِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٣٦) وَلَهُ الْكِبْرِيَاءُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ سوورەتی جاسیە ٣٦ — ٣٧.

واتە: جا هەر لە بۆ خوایە سوپاس و ستایش، كە پەروەردگاری ئاسمانەكانە، پــەروەردگاری زەویــشە، پــەروەردگاری هــەموو جیهانیانــە، هەرچــی گــەورەیی و شكۆمەندی هەیە لە ئاسمانەكان و زەویدا هەر هەمووی شایستەی ئەوە، بە ڕاستی ئەو زاتە باڵادەست و دانایە.

## تەوەری دووەم: ئامرازەکانی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ شەیتاندا:

ئیبن قەییم (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ئێستە چەند بنامەیەکی سوودمەند باس دەکەین کە بە دڵنیاییەوە بە کەڵك وەرگرتن لێیان و بەکارهێنانیان، مرۆڤ دەتوانێ لەگەڵ شەیتاندا ڕووبەڕوو ببێتەوە و لە شەڕ و خراپەی پارێزراو بێت و دوورە پەرێزی لێ بکات.

ئەوانە بنەما، ئامراز و هۆکار و سەنگەر و پارێزگەلێکی دە لایانەن کە بریتین لە:

**سەنگەر و پارێزگەی یەکەم: پەناگرتن و پەنابردن بۆ پەروەردگار:[24]**

**سەنگەری دووەم: خوێندنەوەی هەردوو سوورەتی "فلق" و "ناس"**: چونکە خوێندنەوە، تێگەیشتن و کارکردن بەو دوو سوورەتە بۆ لابردن و دوورخستنەوەی خراپە و شەڕی شەیتان و پارێزراویمان لە لۆمە و بیانوەکانی شەیتان زۆر کاریگەر و سوودمەندن. بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((**ما تعوذ المتعوذون بمثلهما**)).[25]

واتە: ((هیچ شتێ هێندەی ئەو دوو سوورەتە بۆ ئەوانەی پەنا دەگرن لە شەڕ و خراپەی شەیتان کاریگەر و سوودمەندتر نین)). ((پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەموو شەوێك لە کاتی خەوتندا ئەو دوو سوورەتەی (الفلق و الناس) دەخوێند[26]، وە فەرمووی بە عوقبە کە: دوای هەموو نوێژەکانیش بیانخوێنێ)).[27] (دیارە لێرەدا مەبەستی لە نوێژە فەرزەکان بووە نەك سوننەتەکان، خواش باشتر دەزانێ، وەرگێڕی کورد).

---

٢٤ ئەم بابەتە پێشتر بە دوور و درێژی باسکراوەو خراوەتە ڕوو.

٢٥ رواه النسائي والدارمي.

٢٦ رواه البخاري عن حديث عائشة.

٢٧ رواه ابو داود والترمذي والنسائي.

**هەروەها فەرموویەتی:**

((هەر کەسێك ئەو دوو سوورەتە لە گەڵ سوورەتی "إخلاص"ـدا سێجار لەکاتی ئێواراندا و سێ جار لەکاتی بەرەبەیاندا (بەیانیان) بخوێنێتەوە، ئەوەی بەسە بۆ هەموو شتیٚ)).

((هەروەها لە جێگەیەکی تردا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت: ئەگەر چووە ناو جێگەی نووستن دەستی بدات لە یەك و پاشان فووی پێدا بکات و سوورەتی "إخلاص" و "فلق" و "ناس"ی پیادا بخوێنیٚ، پاشان دەستی بهێنیٚ بەسەر ئەو شوێنەدا ئەتوانیٚ لە لەشی، وە سەری و لەگەڵ دەم و چاوی و لەپێشەوەی لەشییەوە دەست پیٚ بکات وە ئەمە سیٚ بارە بکاتەوە)).[٢٨]

**سەنگەری سێیەم: خوێندنی "أیە الکرسی"، چونکە لە فەرموودە صەحیحەکاندا لە موحەممەدی کوڕی سیرین و ئەویش لە ئەبوو هورەیرەوە هاتووە کە وتوویەتی:**

((پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێکردم بە پارێزگاری کردن لە سەرفیترە و زەکاتی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان، کەسیٚ هاتوو و دەیویست بەبیٚ پرس هەندێکی لیٚ هەڵگریٚ و بیبات گرتم و پێم وت: دەتبەمە لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو ئەو فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە و دواتر وتی: هەرکاتیٚ چوویتە ناو جێگەی نووستنەوە، "أیە الکرسی" بخوێنەرەوە! چونکە ئەم کارەی دەبێتە هۆی ئەوەی کەوا پەروەردگار هەمیشە پاسەوان و چاودێری تۆ بێت و تاکو بەرەبەیان شەیتان لێت نزیك نەبێتەوە)).

٢٨ البخاری مع الفتح ٦٢/٩ و مسلم ١٧٢٣، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئاوای دەکرد، ئەمە لە قەڵای موسڵمانەوە وەرگیراوە، لە بەشی زیکرەکانی بەیانیان و ئێواراندا، ل ٣٤، چاپی سیی و یەکەم، وەرگێڕی کورد.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ((ئەو لەگەڵ تۆدا ڕاستی وتووە، بەڵام شەیتان تەواو درۆزنە)).[٢٩]

**سەنگەری چوارەم: خوێندنەوە و تێگەیشتن و کارکردن بە سوورەتی "بەقەرە":** چونکە لە فەرموودەیەکی صەحیحدا لە سەهلی کوڕی عبدالله و ئەویش لە ئەبوو هورەیرەوە گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **((لاتجعلوا بيوتكم قبورا وان البيت الذى تقرأ فيه البقرة لا يدخله الشيطان)).**[٣٠]

واتە: ((ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان، بەڕاستی شەیتان ناچێتە ئەو ماڵانەوە کە سوورەتی "بەقەرە"ی تێدا دەخوێنرێتەوە)).

**سەنگەری پێنجەم: دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتی بەقەرە:** چونکە لە فەرموودەیەکی صەحیحدا لە ئەبوو موسای ئەنصارییەوە هاتووە کە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((هەرکەسێ شەوێ هەر دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتی بەقەرە بخوێنێتەوە، بۆ ئەو کەسە بەسە)).[٣١]

لە صەحیحی ترمزیدا لە نیعمانی کوڕی بەشیرەوە هاتووە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((پەروەردگار دوو هەزار ساڵ پێش بەدیهێنان و خولقاندنی بوونەوەرەکان کتێبێکی نووسی کە کۆتاییەکەی بە دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتی بەقەرە کۆتایی دەهات، ئەگەر ئەو دوو ئایەتە سێ شەو لە ماڵێکدا بخوێنرێتەوە، شەیتان لەو ماڵە نزیك نابێتەوە)).[٣٢]

---

٢٩ رواه البخاري معلقا (٢٣١١).

٣٠ رواه مسلم (٧٨٠).

٣١ رواه البخاري ومسلم.

٣٢ رواه الترمذي (٢٨٨٢) والدارمي (٣٣٨٧).

**سەنگەری شەشەم: ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی "حم" تا "الیه المصیر" لەگەڵ "آیه الکرسی" دا:**

لە صەحیحی ترمزی دا لە عبدالرحمن کوڕی ئەبوویەکرەوە هاتووە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

**((من قرأ حم المؤمن الی (الیه المصیر) وآیة الکرسي حین یصبح حفظ بهما حتی یمسي، ومن قرأهما حین یمسی حفظ بهما حتی یصبح)).**[٣٣]

واتە: هەرکەسێ سوورەتی حم (موئمین) تا (الیه المصیر) لەگەڵ ئایەتول کورسی لە بەیانی دا بخوێنێتەوە تا ئێوارەی لێ دەبێتەوە پارێزراو دەبێت، وە هەر کەسێکیش ئێوارە بیان خوێنێت تا بەیانی لێ دەبێتەوە پارێزراو دەبێت.

**سەنگەری حەوتەم: وتن، تێگەیشتن و کارکردن بە واتای:**

**((لا اله الا الله وحده لاشریك له، له الملك وله الحمد، وهو علی کل شیء قدیر)).**

چونکە لە صەحیحەیندا فەرموودەیەك لە ئەبوو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((من قال: لا اله الا الله وحده لاشریك له، له الملك وله الحمد، وهو علی کل شیء قدیر، فی یوم مئة مرة، کانت له عدل عشر رقاب، وکتبت له مأة حسنة و محیت عنه مأة سیئة وکانت له حرزا من الشیطان یومه ذلك حتی یمسي ولم یأت احد یافضل مما جاء به الا رجل عمل اکثر من ذلك)).[٣٤]

واتە: هەر کەسێك سەد جار بڵێ: هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە (الله)، تەنهاو بێ هاوتایە، موڵك و سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەوە و بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، بە ئەندازەی ئازادکردنی(١٠) کۆیلە پاداشت و چاکەی بۆ هەیە، (١٠٠) چاکەی بۆ دەنووسرێ و (١٠٠) گوناح و تاوانی لەسەر لادەبرێ، ئەو شەوە تاکو بەیانی (کە

---

٣٣ رواه الترمذی (٢٨٧٩) والدارمی (٣٣٨٦).

٣٤ متفق علیه.

ڕۆژی لێ دەبێتەوە) لە شەڕ و خراپەی شەیتان پارێزراو دەبێت و هیچ کەس لەو دەسهات و سەرمایەیەکی چاکی نییە مەگەر کەسێ زیاتر و چاکتر لەمی وتبێ.

**سەنگەری هەشتەم: زۆر یادکردنی پەروەردگار،** که لە بابەتەکانی تر زیاتر جێگەی گرنگی پێدانە.

لە صەحیحی تورموزیدا فەرموودەیەك لە حارسی ئەشعەرییەوە هاتووە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((پەروەردگار فەرمانی کرد بە یەحیای کوڕی زەکەریا بۆ جێ بەجێ کردنی پێنج ڕستە و پێی فەرموو کە، بە بەنی ئیسرائیلیش بڵێت کەوا کردەوەیان پێ بکەن، بەڵام یەحیا لەبارەی گەیاندنیان بە گەلی بەنی ئیسرائیل تۆزێ درەنگ کەوت و دواکەوت. عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) وتی: پەروەردگار تۆی ڕاسپاردووە بە بەجێهێنانی پێنج بابەت و فەرموویەتی کەوا بە بەنی ئیسرائیل بڵێیت کەوا جێبەجێیان بکەن و کردەوەیان پێ بکەن، یا تۆ – یەحیا – پێیان ڕابگەیەنە یاخود من – عیسا – پێیان دەڵێم.

یەحیا وتی: لەوە دەترسم کەوا ئەگەر تۆ – عیسا – پێش من – یەحیا – ڕایان بگەیەنی، زەوی من هەڵ لوشێ و لەناو خۆیدا نوقمم بکات، یاخود تووشی سزایەك بم! خەڵکی بانگهێشت کرد بۆ (بیت المقدس)و خەڵکێکی زۆر لەوێدا کۆ بوونەوە و گوێبیستی وتەکانی بوون و گوێیان لێ ڕاگرت.

یەحیا وتی: پەروەردگار فەرمانی کرد پێم بە بەجێهێنانی پێنج تەوەر (بابەت)و فەرمانیشی پێ کردووم بە ئێوەیشی ڕابگەیەنم.

یەکەم: ئەمەی کەوا تەنیا پەروەردگار بپەرستن و هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار نەدەن‌و پەروەردگار فەرمانی پێ کردوون بەچاکە و چاکە کردن. کاری مرۆڤی چاکەکار وەك ئەوە وایە کە کەسێك دوژمنێکی ئەوی – دوژمنی مرۆڤە چاکە کارەکە – بە دیل گرتبێ و دەست و پێی بەستبێتەوە و ئامادەی کردبێ بۆ ئەوەی لە ملی بدات و

بیکوژێت، بەڵام ئەو مرۆڤە چاکەکارە هەڵسێتەوە و بڵێت: من هەرچی ماڵ و سامان و داراییم هەیە دەیدەم بە تۆ بە مەرجێ کەوا نەیکوژێ و لەمردن ڕزگاری بکات.

هەروەها پەروەردگار فەرمانی پێ کردوون کەوا: یاد و ستایشی پەروەردگار بکەن.یادکردنی پەروەرگار وەك ئەوە وایە کەوا دوژمن بکەوێتە شوێن کەسێك و ئەویش بە خێرایی خۆی بگەیەنێتە قەڵاو سایە و پەنایەکی پارێزراو و بەهێز و خۆی لە ئەوان بشارێتەوە و بپارێزێت. مرۆڤیش بەم جۆرەیە و تەنیا بە یاد و ستایشی پەروەردگارە، کەوا دەتوانێ نەفسی خۆی بپارێزێ لە بەرامبەر شەیتاندا و پارێزگاری لێ بکات)).

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((...**وأنا آمركم. بخمس، الله امرني بهن، السمع، والطاعة، والجهاد والهجرة والجماعة فان من فارق الجماعة قيد شبر فقد خلع ربقة الإسلام من عنقه الا ان يراجع ومن ادّعى دعوى الجاهلية فانه من جثا جهنم**)).

**فقال رجل: يا رسول الله. وإن صلى وصام.**

**قال: ((وان صلى وصام، فادعوا بدعوى الله الذي سماكم المسلمين المؤمنين عباد الله)).**

واتە: ((من فەرمانتان پێ دەکەم بە پێنج شت کە پەروەردگار فەرمانی پێ کردووم: بیستن، پەیڕەوی کردن، تێکۆشان (جیهاد)، کۆچکردن و بوونمان لەگەڵ کۆمەڵدا. چونکە هەرکەسێ بە ئەندازەی بستێ لەکۆمەڵ (جماعەت) دوور بکەوێتەوە نیشانەی ئیسلامی لە ملی خۆیدا دەرهێناوە و لایبردووە، مەگەر ئەوەی کە جارێکی تر بگەڕێتەوە ناویان و هەرکەسێ بانگەشە و بیروباوەڕەکانی ئەهلی نەفام و نەزانەکان زیندوو بکاتەوە، لە زومرەی جەهەننەمییەکانە (واتە ئەهلی دۆزەخە))).

پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر چی نوێژیش بکات و ڕۆژوویش بگرێت؟

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ((ئەگەر چی نوێژ بکات و ڕۆژوویش بگرێ، درووشم و بانگەشە خواییەکانیش تەرح بکەن، پەروەردگارێ کە ئێوەی بە موسڵمان و ئەهلی ئیمان و بەندەی خۆی زانیوە)).[٣٥]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەم فەرموودەیەدا ئەهلی ئیمانی ئاگادار کردووەتەوە و پێی فەرموون کە، مرۆڤ تەنیا لە ڕێگەی یاد و ستایشی پەروەردگارەوە دەتوانێ خۆی لە فێڵ و تەڵەکە و خراپەی شەیتان بپارێزێ و خۆی دوور بخاتەوە و ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە سوورەتی "ناس" باسی دەکات.

پەروەردگار لەم سوورەتەدا شەیتانی بە "خناس"پێناسەکردووە و ناوی هێناوە، خەنناس کەسێکە کە هەر کاتێ مرۆڤ یاد و ستایشی خوا بکات و بیپەرستێ و پەیڕەوی لێ بکات، تووڕە و نادیار و شاراوە دەبێت. بەڵام هەرکاتێ بێ ئاگا بێت لە پەروەردگار، شەیتان دڵی بچووک دەکاتەوە و دوو دڵی و دڵە ڕاوکێکانی خۆی کە ڕێگە خۆشکەری تەواوی خراپە و تیاچوونەکانە هەڵی دەخەڵەتێنێ، بەڵام هیچ شتێ وەك یاد و ستایش کردنی پەروەردگار ناتوانێ مرۆڤ دوور بخاتەوە لە دوو دڵی و دڵەڕاوکێ و فێڵ و تەڵەکەکانی شەیتان وپارێزگاری لێ بکات، (واتە مرۆڤ تەنیا لە ڕێگەی یادو ستایش کردنی پەروەردگارەوە دەتوانێ خۆی لە شەڕ و خراپە و دوو دڵییەکانی شەیتان بپارێزێ و خۆی لێ دوور بخاتەوە، وەرگێڕی کورد).

**سەنگەری نۆیەم: دەست نوێژ و نوێژ کردن،** کە لە گرنگترین و بنچینە ترین قەڵا و سایە و پەنا گەلێکن، کە دەتوانین خۆمانی تێدا بپارێزین و خۆمان دوور بخەینەوە لە دوو دڵی و دڵەڕاوکێکانی شەیتان. بە تایبەت کاتێك کە تووڕەیی و هەوا و ئارەزوو وەك ئاگر لە ناخی مرۆڤدا بڵێسە بسێنێ، هیچ ڕێگەیەکی تر وەك دەست نوێژ و نوێژ کردن ناتوانێ ئەوانە بکوژێننەوە و لەناویان ببات.

---

٣٥ قال الترمذی حدیث غریب حسن صحیح.

له صەحیحی تورموزیدا له ئەبوو سەعیدی خدرییەوە، لەپێغەمبەری خوداوە (صلی الله علیه وسلم) هاتووە کە فەرموویەتی: ((**ألا وان الغضب جمرة من قلب ابن آدم، اما رأيتم الى حمرة عينيه و انتفاخ اوداجه، فمن احسّ بشيء من ذلك فليلصق الأرض**)).[٣٦]

واتە: بزانن کە تووڕەیی ئاگرێکە[٣٧] لە دڵی ئادەمیزاددا پەیدا دەبێت، مەگەر سووری چاوەکانی و هەڵئاوسان و باکردنی دەمارەکانی نابینن؟ هەرکاتێ کەسێ تووشی ئەم بارودۆخە هات دانیشێ و هیچ کارێ ئەنجام نەدات.

(سەبارەت بەو دۆخەی کە مرۆڤ تووڕە دەبێت، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت: گەر تووڕە بوون و لەو کاتەشدا بەپێوە بوون ئەوا دابنیشن، وە ئەگەر لەکاتی تووڕە بووندا دانیشتبوون ئەوا ڕابکێشرێن، وەرگێڕی کورد).

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە:((شەیتان لە ئاگر دروست کراوە و ئاگریش بە ئاو دەکوژێتەوە)).[٣٨] هیچ شتێ بە ئەندازەی دەست نوێژ و نوێژ کردن ناتوانێت زاڵ ببێت بەسەر ئاگری تووڕەیی و هەوا و ئارەزووەکانیدا. چونکە ئاوی دەست نوێژ جەستەی گەرم و ئاگر ئاسا و هەڵگیرساوی مرۆڤی تووڕە سارد دەکاتەوە و ئەگەر نوێژ بە ملکەچی و زەلیلی و دڵپاکییەوە بەجێ بهێنرێ، ئارامی و ئاسوودەیی دەبەخشێتە ڕۆح و دەروونی هەڵگیرساو و نا ئارامی ئەو. ئەمە ڕاستییەکە کە تاقیکردنەوە و ئەزموونی مرۆڤ لە هێنانەوەی بەڵگە و نیشانە بێ نیاز دەکات.

**سەنگەری دەیەم: دوورە پەرێزی لە زیادەڕۆیی لە قسەکردن، تەماشاکردن، خواردن و خواردنەوە و تێکەڵاوی کردنی نا پێویست لەگەڵ خەڵکی دا**، چونکە شەیتان لەم ڕێگەیانەوەیە کە دەتوانێ زەفەر بە مرۆڤ ببات و بچێتە نێو دڵ و ڕۆحی مرۆڤەوەو هێلانەی تێدا درووست بکات و زاڵ بێت بەسەریدا و دەستی بەسەردا بگرێت.

---

٣٦ رواه الترمذي (٢١٩١) وابن ماجه (٤٠٠٠).

٣٧ (جمره) به واتای ورده بەردیش هاتووه

٣٨ شێخی ئەلبانی ئەم فەرموودەیە بە لاواز دادەنێ.

# بەکورتی:

هەر مرۆڤێکی ژیر و عاقڵ و تێگەیشتوو دەزانێ کە شەیتان تەنیا لە سێ لاوە دەتوانێ زاڵ بێ بەسەریدا:

**یەکەم:** زیادەڕۆیی و خەسارکردن و ئەمەی کەوا لە هەر شتێکدا زیاد لە پێویست هەنگاو بنێ، ئەم زیادەڕۆییە زەمینە و بوارێکە بۆ چوونە ناوەوەی شەیتان بۆ ناو دڵ و ڕێگەی ڕووبەڕوو بوونەوە لە گەڵیدا – لەگەڵ شەیتان دا – دەرفەت نەدانە بە نەفس بۆ بەدەست هێنانی ئەو حەز و ئارەزووە زۆر و لە ڕادەبەدەرانە بۆ خەوتن و خواردن و تام و چێژ، هەرکاتێ ئەم دەرگایەی داخست بە ڕووی نەفسی خۆیدا، لە ڕاستی دا دەرگای بەسەر سەرسەخترین و ترسناک ترین دوژمنی خۆیدا بەستووە.

**دووەم:** نا ئاگایی و کەمتەرخەمی، چونکە ئەهلی زیکر و یاد و ستایش کردن، لە پاڵ قەڵایەکی پۆڵایینی یادکردندا جێگیرن، بەڵام هەرکاتێ تووشی نا ئاگایی و کەمتەرخەمی ببنەوە، دەرگاکانی ئەو قەڵا و پەناگایە دەکرێنەوە و دوژمن دەچێتە ئەو ناو قەڵایە و لەم کاتەدا ڕاونان و دەرکردنی شەیتان بۆ ئەوان تەواو قورس و گران دەبێت.

**سێیەم:** ڕووتێکردن و کەڵك وەرگرتن و بەکردەیی کردنی کار و قسەکان و شت گەلێکی بێ بەها و هیچ و پووچ، کە هاوکاری و کۆمەکی ئەو ناکات بۆ گەشەکردنی زانست و ئیمان و کاری خێر و چاکە و بەرژەوەندی خۆی و خەڵکانی تر.

(لەکۆتایی ئەم تەوەرەدا دەڵێم: ئەم بابەتانەی لەم تەوەرەدا باسکراون وخراونەتە ڕوو وەك ئامرازێك بۆ بەرگری کردن و ڕووبەڕوو بوونەوەی شەیتان، بابەت و فەرموودە گەلێکی پیرۆز و بەسوودن، بەڵام وا بە باشتر دەزانم کەوا بەخوێنەرانی بەڕێزیش بڵێم بۆ وەدەست خستنی ئامراز و فەرموودەی زیاتر و بەسوودتر سەبارەت بەم باسە، سەردانی نامیلکەی "قەڵای موسڵمان لە زیکرەکانی بەیانیان و ئێوارانـدا" بکەن، بە تایبەتی بەشی "زیکرەکانی بەیانیان و ئێوارانی" ئەو نامیلکە بە سوود و بە کەڵکە، وەرگێڕی کورد).

# بەشی شەشەم

# کاریگەری ئاژاوە و تاوانەکان بەسەر دڵەوە

## تەوەری یەکەم: ڕووتێکردنی بەلاّ و تاوانەکان بۆ سەر دڵ:

حوزەیفەی کوڕی یەمان (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **((تعرض الفتن على القلوب كعرض الحصر عوداً عوداً، فأى قلب أشر بها نكتت فيه نكتة سوداء واى قلب انكرها نكتت منه نكتة بيضاء حتى تعود القلوب على قلبين: قلب اسود مرياداً كالكوز مجخيا لايعرف معروفا ولامنكراً الا اشرب من هواه. وقلب أبيض لاتضره فتنة مادامت السموات والأرض)).**[39]

واتە: ((گۆبەند (فتنە)و تاوان و سەرپێچییەکان وەکو (چنینی حەسیر) دانە دانە لە بەرامبەر دڵەکانەوە ڕێژە[40] دەڕۆن. هەر دڵێ کە بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەوانەوە، خاڵێکی ڕەشی بەسەرەوە پەیدا دەبێت، بەلاّم هەر دڵێ کەوا پشت بکاتە ئەوان و ڕوویان لێ هەڵجەرخێنێ، خاڵێکی سپی بەسەرەوە پەیدا دەبێت، تاوەکو ئەمەی کەوا دڵ لە شێوەی یەکێ لەم دوو گرووپە دڵانەی خوارەوەی لێ دێت:

دڵێکی ڕەش و تاریك وەکو گۆزەیەکی ئاوەژوو و هەڵگەڕاوە، کە چاکە ناناسێ و پشت ناکاتە خراپە و تاوان و ڕووی لێ هەڵناجەرخێنێ و تەنیا پەیڕەوی لە هەوا و ئارەزووی خۆی دەکات.

ئەوی تریان دڵێکی سپی و (پاك)ـە، کە تاوەکو ئاسمانەکان و زەوی بوونیان هەبێت، گۆبەند و تاوان و سەرپێچی کردن، زەرەر و زیانێکی پێ ناگەیەنێ)).

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕوو هێنان و ڕوو تێکردنی کەم کەمی گۆبەندو ئاژاوەکانی (فتنە) بۆ سەر دڵەکان، چواندووە بە چنین و ڕێکخستنی حەسیر

---

٣٩ أخرج مسلم برقم (١٤٤).

٤٠ ڕێژە واتە ئەوەی کەوا تاقمێك یاخود گرووپێك لە بەرامبەر کەسێکی گەورەدا بەڕێك و پێکی دەچن بەڕێوە وەرگێڕی کورد.

لـه دانـه دانـەی قامیـشەکان. وه ئـەو دڵانـەی کـه دەکەونـه بـەر هێـرش و هەڵمـەتی گۆبەندەکانەوه دابەشی کردوون بۆ سەر دوو جۆر:

**یەکەم:** دڵێکه کاتێك که گۆبەند و فیتنەکان ڕووی تێدەکـەن، بـه هـەمان شـێوه کـه ئیسفنج ئاو هەڵدەمـژێ، ئـەو گۆبەنـد و (فتنـە)و ئاژاوانـه لـه خۆیـدا کـۆی دەکاتـەوه و بەهۆی هەر تاوان و سەرپێچی و گۆبەندێکەوه خاڵێکی ڕەشی لەسەر پەیدا دەبێت. ئەو دڵه هەروەها بەئامێز و باوەشێکی کراوەوه و به ڕوویەکی خۆش پێشوازی لـەو تـاوان و سەرپێچییانه دەکات، تـاوەکو بـه تـەواوی ڕەش دەبێـت و ڕوونـاکی و ڕۆشـنایی خـۆی لەدەسـت دەدات و ژێـرەو ژوور ئـاوێزان دەبێـت، دوونەخۆشـی تـەواو مەترسـیدار ڕوو دەکاته ئەو دڵه و بەرەو مردن و لەناوچوونی مەعنەوی دەبات و لەکاری دەخات.

**یەکەم:**لێ تێکچوون و کەوتنه هەڵەوه بەرامبەر بـه ڕەوا (معـروف) و نـاڕەوا (منکـر)، واته چاکه و خراپه و خێر و شەڕ بەلایەوه جیاوازی نییـه و هـەر یـەکێ لەوانـه واتـای خۆیان لەدەست دەدەن. تەنانەت لەوانەشه ئەم نەخۆشـییه بـەجۆرێ ڕەگ و ڕیـشەی خۆی دابکوتێ کەوا ڕەوا و ڕێگه پێدراو به ناڕەوا و ڕێگه پێنـەدراو (معـروف، منکـر) و ناڕەوا بەڕەوا و بەدیهێنان(بدعت) به شەریعەت و شەریعەت به بـەدیهێنان (سـونەت و، بیدعەت) و حەق به هیچ و پووچ و هیچ و پووچی به حەق له قەڵەم بدات.

**دووەم:** بـه حـاکم و فـەرمانڕەوا زانینـی هـەوا و ئارەزووەکـانی خـۆی بەسـەر ئـەو شـتانەی کـەوا پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم) هێناوییـەتی. (واتـه هـەوا و ئارەزووەکانی خۆی دەکاته حاکم و فەرمانڕەوای خۆی و پەیڕەوییان لێ دەکات و پشت دەکاته ئەو پەیامه و ئەو شەریعەتەی که پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێناوییەتی، خوا پەنامان بدات، وەرگێڕی کورد).

**دووەم:** دڵێکی سپی و پاك: که هەتاوی ئیمان لەو دڵەدا هەڵهاتووه و پـڕ لـه نـوور و ڕۆشنایی کردووه، ئەم جۆره دڵه هـەرکاتێ بکەوێتـه بـەر هێـرش و هەڵمـەتی گۆبەنـد و تاوانەکانەوه، ڕووبەڕوویان دەبێتەوه و لەخۆیانی دوور دەخاتەوه و لایان دەبات. ئەمـه دەبێته هۆی ئەوەی کەوا ڕووناکی و ڕۆشنایی و هێز و توانایی ئەو دڵه زیاد بکات.

ئەو گۆبەند و تێكدەرانەی (فتنه) ڕوو دەكەنە دڵەكان و دەبنە هۆی نەخۆشی و پەك كەوتنی مەعنەوی دڵ، بریتین لە:

– گۆبەندی هەوا و ئارەزوو.
– گۆبەندی دوو دڵی و دڵەڕاوكێكان .
– گۆبەندی خراپە و لەناو بردن و گومڕایی
– تاوان و سەرپێچی و تازەگەرییەكان.
– ستەم و زۆرداریيەكان .
– نەزانی و نەفامییەكان .

گۆبەندی یەكەم، دەبێتە هۆی لەناو بردن و خراپی ویست و نیاز.

دووەمیش دەبێتە هۆی خراپە و لەناوچوونی زانست و بیروباوەڕ و ئیمان.

هەندێ لە هاوەڵان (اصحاب) دڵەكانیان دابەش كردووە بۆ سەر چوار بەش. هەروەها هاتووە كەوا حوزەیفەی یەمانی (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: ((دڵەكان چوار جۆرن:

یەكەم: دڵێكی پاك و بێ خەوش كە تێیدا چرایەكی ڕووناك و ڕۆشن داگیرساوە و ئەو دڵەش دڵی مرۆڤی ئەهلی ئیمانە.

دووەم: دڵێكی بێ تیشك و نا ڕۆشن و شاراوە، كە دڵی مرۆڤی بێ باوەڕە.

سێیەم: دڵێكی هەڵگەڕاوە و سەر لێشێواو كە دڵی مرۆڤی دوو ڕووە (منافق).

دڵێك كە خێر و چاكە دەناسێ، بەڵام ڕووی لێ هەڵدەجەرخێنێ و پشتی تێ دەكات، وە حەق و ڕاستی دەبینێ بەڵام خۆی لە ئاستی دا هەڵە دەكات و خۆی بە كوێر لە قەڵەم دەدات، بە واتای ئەوەی كە ئەو حەق و ڕاستییە نابینێ. !

چوارەم: دڵێ كە هەر دوو هێزی – هێزی ئیمان و هێزی دوو ڕوویی _هەر یەكێكیان بەرەو لای خۆی ڕایدەكێشێ، وە لە كۆتایی دا دەبێتە شوێنكەوتە و ژێر دەستەی ئەو هێزەی كەوا زیاتر بەسەریدا زاڵ دەبێت.

مەبەستی ئەو لە (دڵی تەنیا و سەڵت) دڵێکە کە خاڵی بێت لە تەواوی کاروبارەکانی تر جگە لە کاروبارەکانی پەروەردگاری مەزن و پێغەمبەری ئازیز و حەق و ڕاستی. مەبەستی ئەو لەو چرایەی کە لەو دڵەدا جێگیرە و بوونی هەیە، چرای ئیمانە و تەنیایی و سەڵت بوونی ئەو بە واتای سەلامەتی و تەندروستییەتی لە دوو دڵی و هەوا و ئارەزووە ناڕەوا و گومڕاکەر و بوونی چرای ڕووناك و ڕۆشن تێیدا بە واتای ڕۆشن و ڕووناکی بوونی ئەو دڵەیە بەهۆی کارو کردەوە و ئیمانەوە.

مەبەستی ئەو لە دڵی شاراوە، دڵی بێ باوەڕەکانە، چونکە لە ناخ و دەروونییدا، کالآن و بەرگ و سیپاڵێ شارراوەتەوە و تیشکی زانست و ئیمانی پێ ناگات. بە هەمان شێوە کە پەروەردگار لەبارەی یەهودەوە دەفەرموویێت: ﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا غُلْفٌ...﴾ سوورەتی بەقەرە ٨٨.

واتە: ((هەروەها جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتیان: دڵەکانمان داخراوە (لە گوفتاری تۆ تێ ناگەین!))).

**پەروەردگاری گەورە و بە دەسەلآت دەفەرموویێت: ﴿وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَنْ يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي الْقُرْآنِ وَحْدَهُ وَلَّوْا عَلَى أَدْبَارِهِمْ نُفُورًا﴾ سوورەتی ئەسرا ٤٥ – ٤٦.**

واتە: ((کاتێك کە قورئان دەخوێنیت ئێمە بەربەستێکی نادیارو شاراوە، دەخەینە نێوان تۆو ئەوانەی باوەڕ بەڕۆژی دوایی ناهێنن، (چونکە سوودی لێ وەرناگرن)، چونکە مەبەستیان نییە تێ بگەن، ئێمەش پەردە دەهێنین بەسەر دڵیاندا تا هەر تێی نەگەن، گوێشیان سەنگین دەکەین تا نەیبیستن، جا کاتێك لە قورئاندا تەنها ناوی پەروەردگارت دەبەیت (باسی بت و بەرنامەیان ناکەیت)، ئەوە پشت هەڵدەکەن و ڕوو وەردەگێڕن و بێزاری دەردەبڕن و دەڕۆن)).

هەرکاتێ بۆ خاوەنانی ئەو دڵانە، باسی یەکخواپەرستی پاك و پەرستش و پەیڕەوی کردن و شوێنکەوتنی ڕاستگۆیانە بکرێت و قسەی لێ بکرێ، بە شێوەیەکی هەراسانی و تووڕەییەوە پشتی تێ دەکەن و ڕووی هەڵدەجەرخێنن. بە هەمان شێوە کە وتمان: مەبەستی ئەو لە دڵی لە کالآن و قەولگ بوون و هەڵگەڕاوە و ژێرەوە و ژوور دڵی

ئینسانی دوو ڕووە وەك چۆن پەروەردگاری مەزن و بەدەسەلاّت دەفەرمووێت: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُمْ بِمَا كَسَبُوا أَتُرِيدُونَ أَنْ تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا﴾ سوورەتی نیسا ٨٨.

واتە: جا ئەوە چیتانە (ئەی ئیمانداران) دەربارەی دوو ڕووەکان بوون بە دوو دەستەوە؟ لە کاتێکدا خوا (سەرشۆڕی کردوون)و وەری گێڕاونەتەوە بۆ بێ باوەڕی و بەهۆی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە، ئایا دەتانەوێت (دڵی) کەسێك هیدایەت و ڕێنموونی بکەن کە خوا گومڕای کردووە؟! (بە هۆی باوەڕی دانەمەزراو و دڵ و دەروونی نەخۆشییەوە)، بێگومان ئەوەی خوا گومڕای بکات (بەهۆی کارو کردەوەی ناپەسەندییەوە) ئەوە هەرگیز ڕێگەیەکت دەست ناکەوێت بۆ ڕێنموونی کردنی.

واتە ئەوانی لە حەق دوور خستووەتەوە و دەیان گەڕێنێتەوە بۆ ئەو ناڕەوا و هیچ و پوچییەی کە زیاتر تێیدا بوون و پێوەی خەریك بوون، ئەمەش بەهۆی نافەرمانی و تاوان و سەرپێچییەکانیانەوەیە.

ئەمە خراپترین و پیسترین دڵەکانە، چونکە ئەم جۆرە دڵە حەق بە ناحەق و ناحەق بە حەق لە قەڵەم دەدات و دەبێتە هاوکار و هاوڕێی ئەهلی ناحەق و ناڕەوا و لەگەڵ ئەهلی حەق و ڕەوادا دەکەوێتە بەر بەرەکانێ و دوژمنایەتییەوە.

مەبەستی ئەو لەو دڵەی کە کەوتۆتە نێوان دوو هێزەوە و لەو نێوەندەدا جێگیر بووە و لە هەر یەکێکیان بەشێکی هەیە، دڵێکە کە، پایە و بنەماکانی ئینسانی تێدا پایەدار نەبوون و چراکەی — چرای ئیمان — تێدا دانەگیرساوە و ڕۆشن نەبووە. چونکە هێشتاکو خۆی پاك و خاوێن نەکردووە و خۆی ئامادە نەکردووە بۆ قبووڵ کردن و پەسەندکردنی حەقیقەت و ڕاستییەتی پەیامەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم). تیشکێکی لاواز لە ئیمانی تێدا ڕۆشنە و تاریکی و تارمایی بێ باوەڕی و نەزانیش تێیدا جێگە و شوێنی بۆ خۆی فەراهەم کردووە. هەندێك جار نزیك دەبێتەوە لە کوفر و بێ باوەڕی و هەندێ جاریش زیاتر ڕوو دەکاتە ئیمان، وە فەرمان و بڕیار بۆ ئەوەیانە کە زیاتر زاڵ دەبێ بەسەریدا و دەست دەگرێ بەسەریدا.

## تەوەری دووەم: نیشانە و ئاسەوارەكانی تاوان بە سەر دڵەوە:

گوناح و تاوان شوێنەما گەلێكی زۆر خراپی بەدواوەیە بۆ جەستە و دڵی مرۆڤ هەم لە دونیا و هەمیش لە دوا ڕۆژدا (قیامەت)و تەنیا پەروەردگارە بە درووستی ئاگایان لێیانە، كە دەتوانرێ ئاماژە بكرێ بەم بابەتانەی لای خوارەوە:

### _هەست نەكردن بە گەورەیی و شكۆمەندی پەروەردگار:

یەكێ لە شوێنەما و نیشانەكانی تاوان و سەرپێچی كردن ئەوەیە كە، هەست كردن بە گەورەیی و شكۆمەندی پەروەردگار لە دڵی تاوانباردا لاواز دەبێت و بیەوێ و نەیەوێ، سالاری و ترس و گەورەیی و شكۆمەندی پەروەردگار لەدڵیدا هەموو ڕۆژێ لاواز و لاوازتر دەبێت. چونكە ئەگەر لە دڵی دا توانایی و گەورەیی و شكۆمەندی پەروەردگار جێگیر بووایە، بە هیچ جۆرێ ئازایەتی ئەوەی نەدەكرد و ئەوەندە ئازا و چاونەترس نەدەبوو تا وەكو تووشی گوناح و تاوان بێت و سەرپێچی و نافەرمانی لە پەروەردگار بكات.

لەوانەیە هەندێ جار مرۆڤێكی نەزان و هەڵخەڵەتێنراو بەگومانی خۆی بڵێت: ئەمە هیوا و ئومێدی منە بە لێبوردن و بەزەیی پەروەردگار كە تووشی تاوان و نافەرمانی دەبم، نەك ئەوەی كەوا پلە و پایە و گەورەیی و مەزنایەتی پەروەردگار لە دڵمدا كەم و لاواز بووبێتەوە. (زۆر جار ئێمەی مرۆڤ كە تاوان دەكەین یەكسەر دەڵێین كورە خوا بەڕەحم و میهرەبانە، لێمان خۆش ئەبێت، بەڵام نابێت بەو بیانووەوە كە پەروەردگار بەڕەحم و میهرەبانە دەست بكەین بە نافەرمانی و تاوان كردن، چونكە زۆر جار بە هۆی تاوانی بچووكەوە و بەردەوامیمان لەسەری، تووشی تاوان و گوناحی گەورەتر دەبین و بەخۆمان نازانین و دواتر یا هەر هەست بە گەورەیی و شكۆمەندی پەروەردگار ناكەین لە دڵماندا، یاخود گەر بیشی كەین ئەوەندە كەمە كە نابێتە لەمپەر و ڕێگر لە بەردەم ئەوەی كەوا دەست لەو تاوانانە هەڵ بگرین، بۆیە دەبێ زۆر وریا و بە ئاگا بین و ئەوەش بزانین كە پەروەردگار لە هەموو كەسێكی تر تووڕە و تۆڵەسێنەر و سزادەرترە، وەرگێڕی كورد).

ئەم گومان و خۆ هەڵکێشانە جۆرێکە لە خۆ هەڵخەڵەتاندن، چونکە لە ڕاستی دا دەبێ بوونی گەورەیی و شکۆمەندی و ترسی پەروەردگار لەدڵی مرۆڤدا ببێتە هۆی ئەوەی کەوا سنووری شەریعەتی خوداوەند ڕەچاو بکرێت و بپارێزرێت و لەمپەر و ڕێگر دروست بکات لە نێوان ئەو و — خودی مرۆڤەکەدا — تاوان و سەرپێچی کردندا.

بەڵام ئەوانەی کەوا لە نافەرمانی و سەرپێچی کردنی پەروەردگار ناترسێن و سڵ ناکەنەوە، بە ڕاستی پلە و پایە و گەورەیی پەروەدگارییان نەناسیوە، چونکە لە کەسێکدا کە بە ئاسانی ئەمر و نەهییەکانی پەروەردگار ڕەچاو ناکات، دەتوانین قبووڵی بکەین کە بە ڕاستی گەورەیی و پلە و پایەی خوداوەندی ڕەچاو کردووە و دان بە گەورەیی وشکۆمەندی ئەودا دەنێ؟!

ئەمە لە نەگونجاوترینی گونجاوەکان و هیچ و پووچ ترینی هیچ و پووچەکانە و هەر ئەم سزادانانە بۆ مرۆڤی تاوانبار بەسە، کە شکۆمەندی و پایەبەرزی پەروەردگار لە دڵیدا نەمێنێ و بسڕێتەوە و سالاری و مەزنی و گرنگی و بەهابوونی سنووری شەریعەتی مافی پەروەردگار بە کەم سەیر بکات و بە سووك لە قەڵەمی بدات.

یەکێ لە تۆڵە و سزاکانی ئەو جۆرە کەسانە ئەمەیە کە، پەروەردگار پلە و پایە و سامی ئەو لە دڵی خەڵکانی تردا لا دەبات و بە هەمان شێوە کە ئەو نافەرمانی و سەرپێچی کردنی پەروەردگاری بە کەم زانی، خەڵکیش ئەو بە سووك و بچووك لە قەڵەم دەدەن. خەڵکی بە هەمان ئەندازە خۆشیان دەوێ کە ئەو پەروەردگاری خۆش دەوێ و بە هەمان ڕێژە و ئەندازەش ڕێز و گەورەیی ئەویان لە دڵدایە کە، ئەو ترس و شکۆمەندی پەروەردگاری لەدڵدایە. (واتە ئەو کەسە تا چ ئەندازەیەك ڕێز و گەورەیی و ترسی پەروەردگاری لە دڵدایە و تا چ ئەندازەیەك لێی دەترسێ و ڕێزی دەگرێ، خەڵکیش بە هەمان ئەندازە وەك کەسێکی گەورە و شکۆمەند سەیری دەکەن و ڕێزی لێ دەگرن. گەر بۆ ئەمە بگونجێ، وەك چۆن کورد واتەنی دەڵێ: ((چی بچێنی ئەوەش دەدووریتەوە)). وەرگێڕی کورد).

کەسێ کە سنووری ڕێز و قەدری (حورمەت) پەروەردگاری بشکێنێ، دەبێت چۆن چاوەڕێی ئەوە بێت کەوا خەڵکی ڕێز و قەدری ئەو بگرن و بیپارێزن؟! چۆن ئەو مافە

بـه خـۆی دەدات لـه کاتێکدا کـه ئـەو حـەق و مـافی پـەروەردگاری پێشێل کـردووه و خستوویەتییه ژێر پێ، خەڵکی حەق و مافی ئـەو ڕەچاو بکـەن و چۆن نـا فـەرمانی و سەرپێـچی کردنـی پـەروەردگار بـه سـووك و بـه هـیچ دەزانـێ و لـه هـەمان کاتیـشدا چاوەڕووانی ئەوە دەکات کەوا خەڵکی بە چاوێکی سووك سەیری ئەو نەکەن و بەسووك تەماشـــای نەکەن. (وەك فارس دەڵێت:((تاکنی به دیگران، یا بەخودت یا به سران)). واتە:((ئەوەی کە دەیکەی بەرامبەر بە خەڵکی، دواتر یا بەخۆتی دەکەنـەوه یـاخود بـه نەوەکانت)). جا بۆ کەسێ کە حورمـەت و ڕێـزی پـەروەردگار نـەگرێ، پـەروەردگاریش ڕێز و حورمەتی ئەو ناگری و ڕیسوا و زەلیلی دەکات، وەرگێڕی کورد).

پەروەردگار له قورئانی پـیرۆزدا باسـی لـه سزادانەکانی ئـەهلی تـاوان و سەرپێـچی کردووەو ئەم بابەتەی خستووەتە ڕوو کە بـه هـۆ و کاریگـەری تاوانـەکانی خۆیانـەوه گومڕا بوون‌و لەسەر دڵیان پەردەیەك جێگیر بووه و وەك چـۆن پـەروەردگاریان لـه یـاد کردووه و فەرامۆشیان کردووه، خوداوەندیش ئەوانی لـه بیـــر کـردووه و پـشت گـوێی خـستوون، وەك چـۆن سـووکایەتیان بـه ئایینەکـەی کـردووه پـەروەردگاریش ئـەوانی بچووك و سووك کردووه، وه ئەوانی بـه هـەمان شـێوه کـه بڕیارەکـەی پـەروەردگاریان پشت گوێ خست، خوداوەندیش ئەوانی ڕیسوا کـرد و پـشت گـوێی خـستن: ﴿...وَمَنْ يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ...﴾ سوورەتی ١٨ حەج .

واتە: جا ئەو کەسەی کە خوا قەدر و ڕێزی بـشکێنێت و ڕیـسوای بکـات ئـەوه هـیچ ڕێز لێنەرێکی نییە.

ئەوانە کە کڕنووش بردن و مل دانەواندن وملکەچی لـه بەرامبـەر پـەروەردگاریان بـه سووك و بەتاڵ له قەڵەم دا و لەئاست گەورەیی وشـکۆمەندی خوداوەنـدا کڕنووشـیان نەبرد، هیچ کاتێ هیچ کەس ڕێـز و ئیحتـــرامی ئـەو کەسانه ناگرێـت و جێگـەی ڕێـز و ئیحتـــرام نـیین! چـۆن کەسـێ کـه پـەروەردگار زەلیـل و بـچووکی بکاتـەوه خـەڵکی دەتوانێ ڕێزی لێ بگرن و کەسێکیش کە پەروەردگار ڕێزی لێ بنێ خەڵکی دەتوانێ بـێ ڕێزی بەرامبەر بنوێنێ و بە بچووکی بزانن؟!

## _ پەیدا بوون و بەدیاركەوتنی سام و ترس لە دڵدا:

یەكێكی تر لە نیشانەكانی تاوان و سەرپێچی كردن، سام و ترسێكە كە پەروەردگار لە دڵی تاوانباردا پەیدای دەكات وە دەیخاتە دڵییەوە. لە ڕاستی دا دەتوانین هەمیشە ئەو كەسە لە بارووдۆخێكی ترسناك و نیگەراناویدا ببینین.

چونكە پەیڕەوی كردن لە پەروەردگار قەڵا و پارێزگەیەكە كە هەر كەسێ بچێتە ناوییەوە پارێزراو دەبێت لە سزا و گرفتەكانی دونیاو هەركەسێ لێی بێتە دەرەوە و دوور بكەوێتەوە، سام و ترس لە هەموو لایەكەوە دەورەی دەدات. بەڵام هەركەسێ ڕێگەی پەیڕەوی كردن و شوێنكەوتنی پەروەردگار بگرێتە بەر و لێی دوور نەكەوێتەوە، تەواوی ترس و تۆقانەكانی دەبنە ئارامش و ئاسوودەیی و هەر كەسێكیش نافەرمانیو سەرپێچی لێ بكات، هێمنی و ئاسایش و ئاسوودەیی دەگۆڕدرێ بە سام و ترس.

هیچ مرۆڤێكی تاوانبار و خەسارۆمەند نییە، كەوا دڵی وەك ئەوەی كە لە نێوان دوو باڵی پەلەوەرێكدا جێگیر بووبێ، بەردەوام لە دۆخی ترس و لەرزدا نەبێ، هەركاتێ هەوا پەنجەرەیەك یاخود دەرگایەك ڕابوەشێنێ و تەكانی بدات، دەلەرزێ و گومان دەكات كە كاری تەواوە و بەدوای ئەودا هاتوون و هەر دەنگێ دەبیستێ دڵی دەكەوێ و دەلەرزێ و وا دەزانێ دەیانەوێ سزای بدەن، بەڵام هەر ئادەمیزادێ كەوا ترس و سامی پەروەردگاری لەدڵدا بێت، خوداوەند لە هەر شەڕ و خراپە و نالەبارییەك دەیپارێزێ، بەڵام هەركەسێ ترسی خودای لە دڵدا نەبێت، پەروەردگار كارێكی وای بەسەر دێنێ و وای لێ دەكات كەوا لە هەموو شتێ بترسێ. (دووری بۆ مەڕۆ كە ئەو كەسە لە سێبەری خۆشی بترسێ، وەرگێڕی كورد).

پەروەردگار لەو كاتەوەی كە بوونەوەرەكانی بەدیهێناوە و خولقاندوونی، ئەم بنەماو بناغەیەی لە نێوانیاندا جێگیر كردووە و داناوە، كە تاوان و سزا پێویست و پێداویستی یەكترن.

یەكێ تر لە سزاكانی دڵی سەركێش و تاوانبار، ئەمەیە كەوا تووشی سام و ترسێكی وای دەكات كە وەسف ناكرێت، ئەو هەمیشە هەست دەكات كەوا لە بارووдۆخی ترس و

نیگەرانیدایـە. چـونکە وەك چـۆن جـودایی و تـرس کەوتووەتـە نێـوان خـۆی و دروستکەرەکەی کە پـەروەردگارە، لەگـەڵ خـۆی و دروستکراوەکانیـشدا هەست بـە نامۆیی و غەریبی دەکات و بەتێپەڕ بوونی زەمەن ترسەکەی زیاتر و زیاتر دەبێت، بـە ڕاستی ئەهلی ترس لە خـراپترین جۆری ژیانـدان و لـە بەرامبـەردا ئـەهلی هـاوڕازی و هاودەمی لە گەڵ پێغەمبەردا (صـلی الله علیـه وسـلم) لـە چاکترین و باشـترین و بـەتام ترین ژیاندا بەسەر دەبەن.

ئەگەر مرۆڤی ژیر و عاقڵ ورد بێتەوە و تەماشا بکـات و لـە نێـوان تـام و چـێژی زوو لەدەست چـووی تـاوان و گوناحـدا و سـزا و سـام و ترسـێ کـە لـەوێوە – لـە تـاوان و گوناحـەوە – سەرچـاوە دەگـرێ هەڵسەنگاندن و بـەراوردێ بکـات، زیـاتر هەسـت بـە شڵەژاوی و ناسازگاری و ناڕەحەتی بـارووددۆخ و زیـان و زەرەرەکـانی دەکـات. چـونکە ئەو ئەو ئارامی و هێمنییەی کە لە پەیڕەوی کردن و شیرینی ئـارامی و ئاسـوودەییەوە سەرچـاوە دەگـرێ گۆڕاویەتیـەوە بـەو نائـارامی و ترسـەی کـە لـە تـاوان و گوناحـەوە سەرچاوەی گرتووە.

**إذا كنت قد اوحشتك الذنوب فدعها اذا شئـت واستأنس**

واتە: وەك چۆن تاوان تۆی خستۆتە نێو سام و ترسەوە،. ئەگـەر ئـارەزوو و مـەیلت هەیە وازیان لێ بهێنە و لێیان دوور بکەوەرەوە، تا بە ئاسوودەیی و ئارامی بگەیت.

ڕاز و نهێنی بابەتەکە لەمەدایە کە پەرستش و پەیڕەوی کردن، مرۆڤ نزیك دەکەنەوە لە پەروەردگار و بە هەر ئەندازەی کە نزیکیەکە زیاتر بێت، هاودەمی و پێکەوە بوون و نزیکی زیاتر دەبێت.

بـەڵام تـاوان و سەرکێشی دەبێتـە هـۆی دوورکەوتنـەوە و بـە هـەر ئەنـدازەی ئـەو دوورییە زیاد بکات، ڕێژە و ئەندازەی ترسیش زیـاد دەکـات و ڕێژەکـەی هەڵدەکشێ و بەرز دەبێتەوە... بۆیە مرۆڤ بەهۆی ئەو جیاوازییەی کـە لـە نێـوان ئـەو و دوژمنەکەیـدا پەیدا بووە و درووست بووە، هەمیشە ترسـی ئـەوی لـە دڵدایـە، هەرچـەندیش لەپاڵیـدا بێت. بەڵام لـە بەرامبـەردا ئەگـەر لـە گـەڵ خۆشەویـست و یارەکەیـدا چـەند دوور بێـت هەسـت بـە هـاودەمی و پێکـەوە بـوون دەکـات. (لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیـە کـە مـرۆڤ

هەرچەندە نزیكی دوژمنەكەی بێت كە یەكێ لەوانە شەیتانە، هەر هەست بە ترس دەكات، چونكە متمانەی پێ نییە و قەد متمانە بە دوژمن ناكرێ جا لێوەی نزیك بی یاخود نا، بەڵام لە بەرامبەردا هەرچەندە لە یار و خۆشەویستەكەیەوە دوور بێت. ئەوسا زیاتر هەست بە ئارامی و ئاسایش دەكات، وەرگێڕی كورد).

سام و ترس، شوێنەما و ئاكامی ڕووپۆش و لەمپەر بە هەر ئەندازە و ڕێژەیەك كە سەرپۆش و ڕووپۆش ئەستوور تر و گەورەتر بێ، سام و ترسیش زیاتر دەبێت. (لێرەدا مەبەست ئەوەیە كەوا هەتاكو زیاتر ملكەچی فەرمانەكانی پەروەردگار بین و پەیڕەوی لە بڕیارەكانی خوداوەند و شەریعەتەكەی بكەین، ئەوا شەیتانی نەفرین لێكراو زیاتر و زیاتر دەبێتە لەمپەر و ڕێگر لە بەردەممانـدا و هەوڵ دەدات بەرەو سارد بوونەوە و پاشگەز بوونەوەمان ببات، پەروەردگار خۆیشی باشتر شارەزایە، وەرگێڕی كورد).

نا ئاگایی و بێ خەبەری ترس بەدی دەهێنێ و خراپتر لەوە ترس لە تاوان و گوناح و خراپتر لەوەش ترس لە هاوەڵ بڕیار دان و بێ باوەڕییەوە سەرچاوە دەگرێ. هیچ كەسێ نابینێ و پەیدا نابێت كە لەگەڵ یەكێ لەم كاروبارانەدا هاوڕێ و سازگار بێت، مەگەر ئەوەی كەوا ترس بە سەختی بەسەریدا زاڵ دەبێت و سام و ترس ڕوو و دڵی ئەو دادەگرێ و داگیری دەكات و دەبێتە كەسێكی ترسناك و خۆ ڕانەگر.

## _لەدەست دانی سەلامەتی و تەندروستی دڵ:

یەكێكی تر لە شوێنەما و نیشانەكانی تاوان ئەمەیە كە، ساغی و سەلامەتی دڵ لەناو دەبات و تووشی نەخۆشی و لادانی دەكات و نەخۆشی و كوڵەواری ئەو درێژەی دەبێت و لەو خواردنە مەعنەوییانەی كە ژیان و خێر و بەرژەوەندی ئەو وابەستەن پێیەوە بەهرەمەند نابێ.

چونكە كاریگەری و نیشانەی تاوان بەسەر دڵەوە وەك كاریگەری و شوێنەمای نەخۆشییەكانە بەسەر جەستەوە، لە ڕاستیدا تاوان و سەرپێچییەكان، نەخۆشییەكانی دڵن و تەنیا ڕێگە چارەی ئەوانە دووركەوتنەوە و وازهێنانە لە گوناح و تاوان و تۆبەكردن و پەشیمان بوونەوە.

تەواوی ڕێبوارانی ڕێگەی پەروەردگار لەم بارەیەوە كۆك و یەك دەنگن كەوا دڵ تەنیا كاتێ بە ئارەزووی خۆی دەگات كە بە گەورە و پەرستراوی ڕاستەقینەی خۆی بگات و تەنیا كاتێك بە گەورە و پەرستراو و خۆشەویستی خۆی دەگات كە لە ساغی و تەندروستی بەهرەمەند بێت و تەنیا كاتێكیش لە سەلامەتی و تەندروستی بەهرەمەند دەبێ، كە دەرد و ئازاری ئەو چارەسەر و دەرمان بكرێت و شتێكی وەك ئەمەش ڕوو نادات و نایەتە پێشەوە مەگەر ئەوەی كەوا ڕووبەڕووی ڕاكێشان و هەوا و ئارەزووەكانی بێتەوە و بەربەرەكانیشی لەگەڵدا بكات. ئەو هەوا و ئارەزووانەی كە وەك ئازار و نەخۆشییەكانییەتی و چارەسەركردنی لە دژایەتی كردن لەگەڵیاندا شاراوەو نادیارە.

بەڵام ئەگەر نەخۆشییەكە ڕەگ و ڕیشەی تێدا دابكوتێ و تووشی مردنی مەعنەوی دەبێتەوە یاخود تەواو لێی نزیك دەبێتەوە. بە هەمان شێوە كە ئەگەر كەسێ نەفسی خۆی لە هەوا و ئارەزووە نەفسییەكان دوور بخاتەوە بەهەشت جێگە و مەنزڵگەی ئەوە، لە پێش بەهەشتی دواڕۆژ دا ئەو لەم دونیایەدا لە بەهەشتێكی كاتی بەهرەمەند دەبێ كە بەخشش و تام و چێژەكانی ئەو لەگەڵ خۆشی و تام و چێژەكانی ژیانی هیچ كەسێكی تردا شایەنی بەراورد كردن و هەڵسەنگاندن نییە، تەنانەت جیاوازی نێوان ئەو دوو ژیان و بەخششانەی وەك جیاوازی نێوان بەخششە دونیاییەكان و بەخششە دواڕۆژەكانە.

ئەمە حەقیقەت و ڕاستییەكە كە تەنیا ئەو كەسانە بڕوای پێ دەكەن و بەڕاستی دەزانن كە دڵی ئەوان ئەمەی یاخود هاوشێوەی ئەمەی هەست پێكردبێ. نابێ دوو دڵ بین كە ئەم فەرموودەیەی پەروەردگار: ﴿إِنَّ الأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ (١٣) وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ﴾ سوورەتی ئینفتار ١٣ — ١٤.

واتە: (سەرئەنجام) بە ڕاستی چاكان، خواناسان لەناو ناز و نیعمەتدا ژیانی پڕ لە شادی و خۆشی دەبەنە سەر، بێگومان تاوانبار و تاوانكارەكانیش لەناو دۆزەخدا ژیانی پڕ لە ئێش و ئازار دەبەنە سەر.

بە بەخششەكانی ژیانی پاش مردن سنووردار دەبێت و كۆتایی دێت، تەنانەت پەیوەست و تایبەت نییە بە یەكێ لە ماڵ و سەراكانی دونیا، بەرزەخ یاخود دواڕۆژ، ئەوانە لە بەخشش و ئەمان لە سزا و تۆڵەدا جێگیرن، مەگەر بەخشش و تام و چێژ و خۆشی، هەمان تام و چێژ و خۆشی و بەخششی دڵ و سزاش هەمان سزای دڵ نییە؟

چ سزایەك ئازاراوی ترو ناخۆشترە لە سزای ترس و خەم و پەژارە، دڵ مردوویی و پاشگەز بوونەوەی دڵ لە پەروەردگار و ژیانی پاش مردن و وابەستە بوون بە غەیرە خودا و دوور كەوتنەوە و جودابوونەوە لە پەروەردگار، لە هەر كات و شوێنێكدا پەیوەندی بە هەر شتێكەوە هەبێ و ئەوانی بە پێچەوانەی ڕەزامەندی پەروەردگار خۆش بووێت، ئەم جۆرە باروودۆخە مرۆڤ تووشی خراپترین سزا دەكات.

هەركەسێ جگە لە پەروەردگار بە هەر كەس و شتێكی تر پشت ببەستێ و ڕووی تێ بكات و پەیوەندی و خۆشەویستی لەگەڵی دا هەبێ، (مەبەست لە پەیوەندی و خۆشەویستی، واتە جگە لە پەروەردگار كەسێكی تری خۆش بووێت و پەیوەندی بێ لەگەڵی دا، ئەڵبەتە ئەم پەیوەندی و خۆشەویستییە كە لێرەدا ئامـاژەی پێكراوە و ڕەوانییە بۆ غەیری خوا بۆ كەسی تر هەبێ، پەیوەستە بە پەرستش و بەندایەتی كردنەوە، خوداش باشتر دەزانێ، وەرگێڕی كورد).لەم دونیایەدا تووشی سێ جۆر سزاو گرفت دەبێتەوە:

– پێش ئەوەی بەدەستی بهێنێ و پێی بگات، لە ڕەنج و سزادا دەبێت.

– هەركاتێ پێگەیشت و بەدەستی هێنا، لە ترسی ئەوەی كە مەبادا لەدەستی بدات لە ڕەنج و سزادا دەبێت.

– هەركاتێ لە دەستی بدات، تووشی خراپترین سزا دەبێت.

ئەم سێ سزا و ئازار و بەڵایانە تەنیا لەم جیهانەدا بۆی پەیدا دەبێت. بەڵام لە بەرزەخدا، بە ڕەنج و سزای دووری و دابڕان وجودابوونەوە، كە هیچ هیوا و ئومێدێ نییە بۆ گەڕانەوەی و ڕەنج و ئازاری لەدەست دانی بەخشش گەلێ كە بە هۆی وابەستە بوون بەوخۆشەویستە ناڕاستەقینە و درۆینە لەدەست چووە و ئازار و سزای

سەرپۆش لە نێوان ئەوان و پەروەردگاردا و ڕەنج و ئازاری داخ و پەرۆشیێ کە جگەری ئەو پارچە پارچە دەکات. تووش دەبێت.

ئەم بەخشش و تام و چێژە درۆینە و ناڕاستەقینانە لە کوێ و بەخشش گەلێ کە دڵی مرۆڤ بەهۆی هاودەمی و نزیکی پەروەردگارەوە و یاد و پەرستش و ویست و خۆشەویستی لە ئاسوودەیی هەمە لایەنە و خۆشی و شادومانی وەسف نەکراو جێگیرە، لەکوێ! ؟.

تەنانەت هەندێ لەو کەسانەی کە لەو جۆرە بارودۆخەدا جێگیر بوون و ئامادەن، لەکاتی مردندا بەهۆی لەدەست دانی ئەو خۆشی و تام و چێژانە پەشیمانی نیشان دەدەن و خەم و خەفەت دەخۆن و کەسێ وتوویەتی: ((ئەگەر ئەهلی بەهەشتیش لەم جۆرە خۆشی و بەخششانەدا بەشدارن و بەهرەمەندن، بە ڕاستی لە ژیانێکی شادی بەخشدا بەسەر دەبەن)).

یەکێکی تر لەو بەهەشتییانەی سەر زەوی وتوویەتی: ((بێچارە و داماوی و کەساسی بۆ دونیا پەرستان، کە بە بێ کەڵك وەرگرتن و سوودمەند بوون لە چاکترین و بەتام و چێژترین بەخششی دونیا، کە بەخشش و نعمەتی خۆشی زیکر و یادکردن و پەرستش و پەیڕەوی کردنی پەروەردگارە. ئەم دونیایە بەجێ دەهێڵن)).

یەکێکی تریان وتوویەتی: ((ئەگەر پاشا و فەرمانڕەواکان دەیانزانی کە ئێمە لە چ بەخشش و ئاسوودەییەکدا داین، بۆ وەرگرتنی ئەو بەخشش و ئاسوودەییەی لێمان شمشێریان لە کێلاندا بەڕووماندا دەردەکردو بەرز دەکردەوە)).

هەروەها یەکێکی تر لەوانە کە تام و خۆشی بەهەشتی دونیاییان لە یاد و زیکر و پەرستش و پەیڕەوی کردنی پەروەردگاردا دۆزیوەتەوە و پەیدۆزی بوون، دەڵێت: ((لەم دونیایەدا بەهەشتێك هەیە کە ئەگەر کەسێ نەچێتە نێوییەوە، ئەوا بێ بەش دەبێ لە بەهەشتی دواڕۆژ و ناچێتە نێوییەوە)).

ئەی ئەو کەسەی کە پشك و بەشی بەنرخ و بە بەهای خۆتت بە بەهایەکی کەم فرۆشتووە و لەم کڕین و فرۆشتنەشدا بە خراپترین شێوە هەڵخەڵەتاوی و زیانت

بینیوه و خۆیشت لێی به ئاگاییت! ئەگەر خۆت لە نرخ و بەهای کاڵای بەنرخی و ئەرزشمەندی خۆت بە ئاگا نیت، پرسیار لە شارەزایان و پسپۆڕان و بە ئاگایان بکە!

حەپەسان و سەرسوڕمان بۆ ئەو کاڵا و شمەکەی کە پەروەردگار کڕیار و کڕێنەری ئەوە و نرخ و بەهاکەشی بەهەشتە و ئەو نوێنەرەی پەروەردگار کە کڕین و فرۆشتنەکە لە ڕێگەی ئەوەوە گرێدراوە و بەستراوە، نرخ و بەهای ئەو — کە بەهەشتە — بۆ موشتەری و کڕیارەکەی لە ئەستۆ گرتووە، پێغەمبەری گەورە و مەزنی ئیسلامە (صلی الله علیه وسلم).

## _لەدەستدانی بینین و بینایی[41] دڵ:

یەکێکی تر لە نیشانە و شوێنەماکانی تاوان و نا فەرمانی و سەرپێچی کردنی پەروەردگار (جل جلالە) ئەمەیە کە، بینایی و بینینی دڵ لەناو دەبات، تیشك و ڕووناکییەکەی لە ناو دەبات و دەیکوژێنێتەوە، ڕێگەی زانستی لێ دەبەستێ و لە نێوان دڵ و ڕێنموونیدا لەمپەر و ڕێگرییەکی گەورە درووست دەکات.

ئیمامی مالیك لە دیدار و چاوپێکەوتنێکیدا لە گەڵ ئیمامی شافیعی دا، دوای سەرنجدان و وردبوونەوە لە توانا زانستی و ئیمانییەکانی ئەو وتی: ((من هەست ئەکەم کە پەروەردگار تیشك و ڕووناکییەکی لە دڵی تۆدا پڕ شەوق و ڕووناك کردووەتەوە، ئەو نوور و ڕووناکییە بە تاریکی و زوڵمەتی تاوان و سەرپێچی کردن لەناو مەبە و خامۆشی مەکە)).

بە هەر ڕێژە و ئەندازەی کەوا تاریکی و زوڵمەتی تاوان و گوناح زیاتر بێت ڕووناکیو شەوقی دڵ کەم و کەمتر دەبێ، تا ئەو شوێنەی کە دڵ وەك شەوێکی تاریکی بێ شەوق و ڕووناکی و ڕۆشنایی لێ دێت، بە هۆی بێ بەش بوونی لە شەوق و ڕووناکی،

---

[41] لێرەدا مەبەست لەو بینین و بیناییە ئەوەیە کە، چاوی دڵ دەیبینێ و ئەو چاوەش چاوی ناخە، ئەگەر بینایی ئەو چاوە ڕووناك و ڕۆشن و جوان بێت ئەوا تەواوی جەستە ئاسوودە و ئارام دەبێت و سوودی لێ دەبینێ، وەرگێڕی کورد.

وەکو ئادەمیزادێکی کوێر و نابینا کە لە شەوێکی تاریك و لە شوێنێکی پڕ لە لێژگە و خزگەدا دەکەوێتە نێو هەر چاڵ و قۆرتێکەوە.

لەم ڕێگەیەدا یا دەبێت بە گوێڕایەڵی کردن و پەرستش کردن داوای سەلامەتی و تەندروستی بکەین، یاخود بە هۆی سەرپێچی و نافەرمانی کردن و تاوان کردنەوە دەکەوینە نێو گۆم و گێژاوی سەر لێشێواوی و گومڕایی.

تاریکی دڵ بە هۆی کاریگەری تاوانەکانەوە دەگوازرێتەوە بۆ پەل و ئەندامەکان و بە هۆی هێز و لاوازییەوە کارەکانی ئەوان - پەل و ئەندامەکان - تووشی شڵەژاوی و تێکچوون دەکات.

هەرکاتێ مردنی هاتە پێشەوە و لەمردن نزیك بوویەوە و بەرەو دونیای بەرزەخ هەنگاو هەڵبگرێ، تاریکی گۆڕ ئەو دادەگرێ، وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی: ((**إن هذه القبور ممتلئة على اهلها ظلمة وان الله ينورها بصلاتي عليهم**))[٤٢].

واتە: ((ئەم گۆڕانە بۆ خاوەنەکانیان هەمووی تاریکییە، پەروەردگار بە هۆی دروودو سەلاوات ناردنی ئەوان بۆ من - موحەممەد - بۆیان دەکات بە شەوق و ڕووناکی)).

کاتێکیش کە ڕۆژی بڕیاردراو و وادە دراو (ڕۆژی دوایی) دێتە پێشەوە و تەواوی بەندەکان کۆ دەکاتەوە، تاریکی دڵی مرۆڤەکانی ئەهلی بێ باوەڕی و هاوەڵ بڕیار دەران (شریك)، تاوان و گوناح بەسەر نێو چاوانیاندا بەدەردەکەوێت و وەك تاریکی و دووکەڵ هەموویان ئەوە دەبینن.

چ سزادانێ لەمە خراپتر، سزادانێ کە تەواوی تام و چێژ و خۆشییەکان و بەخششەکانی دونیا لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە گەڵیدا شایەنی بەراورد کردن و هەڵسەنگاندن نییە! وێڕای بارودۆخی مرۆڤە نوقم بووەکان لە تاوان و سەرپێچی کردنو پشت تێکردن و ڕوو هەڵچەرخاندن لە حەق و ڕاستی و ڕووناکی و ڕۆشنایی.

## تەوەرەی سێیەم: پەردەی نێوان دڵو خوای گەورە:

خوای گەورە دەفەرمووێت ( كلا بل ران على قلوبهم ما كانوا يكسبون) سوورەتی ئەلموتەففین،ئایەتی ١٤، ئیبنو عەباس و چەند موفەسیرێکی دیکەش بۆچوونیان وایە مەبەست لە وشەی (ران) لەم ئایەتە ئەو تاوانە یەك لەدوای یەکەیە، کە دەبێتە پەردەیەكو دڵ دادەپۆشێت،ئەو پەردانەش کە دڵ دادەپۆشن دە جۆرن:-

١- پەردەی لە کارخستن،و نکۆڵی کردن لە ناوو سیفاتی خوای گەورە، ئەم جۆرەیان لە داپۆشینەکانی تر ئەستوورترن، چونکە خاوەنەکەی هەرگیز ناتوانێت خوا بناسێتو نایگاتێ هەروەکو بەرد ناتوانێت خۆی بەرەو سەرەوە بڕوات.

٢- پەردەی شیركو هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوای گەورە، مەبەستیش لێی دڵی خۆی بۆ غەیری خوا تەرخانو ملکەچ بکات.

٣- پەردەی بیدعەی گوفتاری، وەکە داپۆشینی ئارەزووبازانو وتەو قسەی نابەجێو خراپ بە هەموو جۆرەکانییەوە.

٤- پەردەی بیدعەی کرداری، وەکو داپۆشینی پەرستشو ویردو زیکرە داهێنراوەکان.

٥- پەردەی ئەنجامدەری تاوانە گەورەکان بە پەنهانی، وەکو پەردی ملهوڕ و لووت بەرزو ڕیابازەکانو حەسوودیو شانازیو خۆ بەزلزانەکان.

٦- پەردەی ئەنجامدەری تاوانەگەورەکان بە ئاشکرا،پەردەکانیشیان لە پەردەی ئەنجامدەری تاوانە گەورەکان بە پەنهانی تەنکترە،هەرچەندە ئەنجامدەرانی تاوانە گەورەکان بە پەنهانی زیاتر پەرستش وکۆشش دەکەن، بەڵام ئەنجامدەری تاوانە گەورەکان بە ئاشکرا نزیکترن لە تەوبەو گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، ودڵەکانیشیان سەلامەت ترە لە دڵی ئەنجامدەرانی تاوانە گەروەکان بە پەنهانیو دڵەکانیشیان باشترە.

٧- پەردەی ئەنجامدەری تاوانە بچووکەکان.

٨- پەردەی زیادەڕوییکەران‌و دەستبڵاوکەران لە شتە حەڵاڵکراوەکان.

٩- پەردەی بیٚ ئاگایان لەوەی بۆی خولقێنراون‌و ئەوەی لێیان داواکراوە، بیٚ ئاگایان لە ماف پەروەردگار لەسەریان، لە پەرستش‌و یادکردنەوەی‌و سوپاسگوزاریی‌و بەندایەتیی.

١٠- پەردەی کۆششکاری گورج‌و خێرا لە پەرستش کە لەمەبەست لایداوە.

ئەمانەی باسمانکردن دە پەردەن کە دەکەونە نێوان دڵ‌و خوای پەروەردگارەوە، ئەم پەردانەش لە چوار توخم درووست دەبن،ئەوانەش دەروون‌و شەیتان‌و دنیاو ئارەزووە، ئەم پەردانەش هەرگیز هەڵناماڵرێن بە بیٚ ڕیشەکێشکردنی ڕەگەکانیان لە دڵدا.

ئەو چوار توخمەی باسمانکردن، گوفتارو کردارو مەبەست‌و ڕێگا تێکدەدەن،بە پێی زاڵ بوون‌و دەسەڵاتیان، ڕێگای گوفتارو کردارو مەبەست دەگرن بۆ ئەوەی نەگەنە دڵ، ئەوەشی بگاتە دڵ ڕێگای ئەوەی لیٚ دەگرن کە نەگاتە پەروەردگار.

نێوانی گوفتاروکردار و نێوانی دڵ ڕێگایەك هەیە، بەندە لەم ڕێگایەوە کۆچ بۆلای دڵی خۆی دەکات، بۆ ئەوەی شتە سەیرەکانی نێو دڵی خۆی ببینێت، ئەو ڕێگرانەی باسمانکردن لە سەر ئەم ڕێگایەن،ئەگەر لە دژیان بجەنگێت‌و بە دڵسۆزی بەرەو لای دڵی کۆچ بکات ئەوە دەیگاتیٚ‌و بە نێویشیدا دەسووڕێتەوە، ولەوێشەوە ئۆقرە ناگرێت تا ئەو کاتەی دەگاتە پەروەردگاری، ( وان الى ربك المنتهى) النجم ئایەتی ٤٢، خوای گەورەش بە گەیشتنی ئەو پاداشتی زێدە ئیمان‌و یەقین‌و زانست‌و ژیریی پێدەبەخشێت، بۆ ئەوەی ڕووخسارو ناوەوەی پیٚ جوان بکات، بەمەش ڕێنمایی دەکات بۆ جوانترین ئاکارو باشترین کردەوە،و هەموو کردەوەو ڕەوشتێکی خراپیشی لیٚ دوور دەخاتەوە، خوای گەورە بە بەو زانستەی کە پێی بەخشیوە سەربازانێکی بۆ فەراهەم دێنیٚ کە دژی ڕێگرەکان بجەنگیٚ، بۆ ئەوەی بگاتە پەروەردگاری.

به دنیانەویستیو دەرهێنانی خۆشەویستی دنیا لە دڵیدا دژی دنیا دەجەنگێ، بە شێوەیەك ئەگەر دنیا هاتە سەر دەستی یان بۆ نێو ماڵەکەی زیانی پێناگەیەنێتو لە بڕوای بە تینی بە ئاخیرەت، کەم ناکاتەوە.

لە دژی شەیتان دەجەنگێت بەوەی گوێڕایەڵی هەواو ئارەزوو نابێت چونکە شەیتان لە ئارەزووبازی جودا نابێتەوە.

بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پەروەردگار دژی هەوەسبازی دەجەنگێت، بە شێوەیەك جگە لە فەرمانو حوکمی خوا، هیچ دەسەڵاتێك بۆ هەواو هەوەس نامێنێتەوە.

بە هێزی دڵسۆزی بۆ پەروەردگار دژی نەفس دەجەنگێت.

ئەوانەی باسمانکردن، کاتێك دێنە دی ئەگەر کردەوەکان ڕێیەکیان دۆزییەوە لە دڵەوە بۆ لای پەروەردگار، ئەگەر بێتو کردەوەکان ڕێیەك نەدۆزنەوەو نەفس زاڵ بوو بە سەریدا، ئەوە دەکرێت بە بەندایەتی و خواپەرستیو دونیا نەویست بیبینیت، بەڵام لە ڕاستیدا دوورە لە خوا، بەڵکو ئەنجامدەرانی تاوانە گەورەکان نزیکترن لە خوا تا ئەمانە،دڵسۆزترو نزیکتریشن لە ڕزگاربوون.

سەیری سەجادی خواناسو دونیا نەویست بکە، کە شوێنەواری کڕنووش بە نێوچەوانیدا دیاربوو، چۆن زیادەڕۆیی کردەوەکانی وای لێکرد بەرانبەر بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم قسەی کرد، ڕق وکینەشی خستە نێو دڵی هاوەڵەکانی تاکو وایان لێ هات خوێنی موسڵمانانیان بە حەڵاڵ زانی.

سەیری ئەو مەیخۆرە سەرخۆشەش بکە، کە زۆر جاران دەیانهێنایە لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم،و لەسەر مەیخواردنەوە حەددی لێ دەدا،بەڵام بڕوای بەتینی و خۆشەویستی بۆ خواو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، بۆیە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کرد نەفرەتی لێ بکرێت.

بەمە بۆمان دەرکەوت زاڵ بوونی تاوان زیانی کەمترە لە زاڵبوونی گوێڕایەڵی.

# تەوەری یەکەم: ژیانی دڵ، بناغە و بنەمای تەواوی خێر و بەرژەوەندییەکان

## _ ژیان و ڕووناکی دڵ، سەرچاوەی خۆشبەختی:

بناغەو بنچینەی تەواوی خێر و بەرژەوەندییەکان و خۆشبەختی تێکڕای موسڵمانانو تەنانەت هەموو مرۆڤەکانیش، گەیشتنە بە کەماڵی و تەواوی ژیان و بەدەست هێنانی ڕووناکی و ڕۆشنایی ژیان، چونکە ((ژیان و ڕووناکی)) سەرچاوەی تەواوی خێر و بەرژەوەندیەکانە. پەروەردگاری گەورە و بەدەسەڵات فەرموویەتی:
﴿أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُوراً يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا﴾ سوورەتی ئەنعام ١٢٢.

واتە: ئایا ئەو کەسەی کە مردوو بوو (بەهۆی بێ باوەڕییەوە) ئینجا (بە هۆی ئیمانەوە) زیندوومان کردەوە و نوور و ڕووناکییەکمان بۆ ساز کرد لە ژیانیدا (کە قورئانە) لەناو خەڵکیدا پێی دەڕوات و هەڵس و کەوتی پێ دەکات (هاندەرێتی بۆ هەموو چاکەیەك و دەیگێڕێتەوە لە هەموو خراپەیەك، ئایا ئەو کەسە) وەکو ئەوە وایە کە لەناو تاریکییەکاندا گیری خواردووەو لێی دەرناچێت؟.

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەڵات لەم ئایەتە پیرۆزەدا هەردوو بناغە و بنەمای (ژیان و ڕووناکی) لە پاڵ یەکتردا باس کردووە. چونکە هێز و توانایی، بیستن، شەرمو خاوێنی، دلێریو چاو نەترسی، پشوودرێژی و ئەرزش و بەها ئەخلاقی و ڕەوشتەکانی ترو حەز لێکردنو خۆشویستنی چاکەکانو نەفرەت کردن لە خراپەکان، بە هۆی ژیان و ڕۆحەوە گونجاو و مومکینە. بە هەر ئەندازە و ڕێژەی کە ژیان و ڕۆحی ئادەمی گەشە بکات و بەهێز بێت ئەو تایبەتمەندییانەش – ژیان و ڕووناکی – تێیدا گەشە دەکەن و بە هەر ئەندازەیەکیش کە ژیان و ڕۆحی ئەو لاواز بێت، ئەو تایبەتمەندیانەش لە مرۆڤدا لاواز دەبن. شەرم و حەیا لە دەست پێکردنی ناشیرینی و

ناپەسەندی بە ڕێژەی ژیان و سەقامگیری و پایەداری ڕۆحی مرۆڤەوە وابەستەیە. هەركاتێ خراپە و ناپەسەندی ڕوو بكەنە دڵێكی سالم و تەندروست و خاوەن ژیانەوە، سروشتی ئەو دڵە بەجۆرێكە كە نەفرەتیان لێ دەكات و دوورە پەرێزیان لێ دەكات و دوور دەكەوێتەوە لێیان. بەڵام دڵی مردوو دڵێ كە تووشی مردنی مەعنەوی بووە، (واتە لە ناوەوە خودی دڵەكە مردووە و گەر تاوان بكات هەست بە پەشیمانی و دڵتەنگی ناكات، وەرگێڕی كورد). چاكە و خراپە، حەق و ناحەق، دیار و نادیار، بەلایەوە فەرق و جیاوازی نییە. وەك چۆن عبداللەی كوڕی مەسعوود دەڵێت: ((كەسێك كە خاوەنی دڵێكی تامەزرۆ بە دیار و (معروف)و هەراسان و ڕاكردوو لە نادیار و خراپە (منكر) بەهرەمەند بێ، دەمرێ و لەناو دەچێ)).

دڵی نەخۆش، دڵێ كە تووشی نەخۆشی بەدواكەوتن و بەدواچوونی ڕاكێشانە ناڕەواو ڕێگە پێنەدراوەكان بووە، سروشت و مەیلی بە جۆر و شێوازێكە كە، وێڕای نەخۆشی و لاوازی و بێ هێزی خۆی، خۆی دەداتە دەست پیسی و ناپەسەندییەكانەوە.

هەروەها هەركاتێ ڕووناكی و ڕۆشنایی دڵ زیاتر بێت، ڕواڵەتی زانیارییەكان و چییەتی و جەوهەری شتەكانی بەو جۆرەی كە هەیە بەلایەوە ڕوون و بەدیار دەكەوێتو ئاشكرا دەبێت، زەریفی و جوانییەكان و چاكەكانی بەلاوە ئاشكرا و بەدیار دەكەون و لە ڕێگەی ژیان و سەقامگیری و پایەداری خۆیەوە ئەو هەڵدەبژێرێ و خراپە و ناپەسەندییەكانیش بەلایەوە ئاشكرا و بەدیار دەكەون و لێیان دوور دەكەوێتەوە.

پەروەردگاری مەزن و بەتوانا لە چەند بابەتێكی جیاوازدا ئەم دوو بناغە و بنەمایەی – ژیان و ڕووناكی – لە قورئانی پیرۆزدا باس كردووە و لە وانە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا مَا كُنْتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِنْ جَعَلْنَاهُ نُورًا نَهْدِي بِهِ مَنْ نَشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا﴾ سوورەتی شوورا ٥٢.

واتە: ئەی موحەممەد (صلی الله علیە وسلم) ئا بەو شێوەیەی كە وتمان ئێمە قورئانمان بۆ ڕەوانە كردیت لەلایەن خۆمانەوە (كە ژیان بەخشە بە ڕۆح و گیان و

عەقلّ)، تۆ نەتدەزانی ئیمان چییە و قورئان چییە، بەڵام ئێمە ئەم قورئانەمان كردە ڕووناكی و نوورێك كە هیدایەت و ڕێنموونی هەركەس كە بمانەوێت لە بەندەكانمانی پێ دەكەین، (ئەوانەی دڵی بۆ دەكەنەوە و بەچاكی گوێی بۆ دەگرن).

لەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕۆح كە (ژیان) لە ڕێگەی ئەوەوە دەستەبەر دەبێت و (نوور) كە ڕووناكی و بریسكە لەوەوە بەرهەم دێت، لەپاڵ یەكتردا هێناوییەتی و ئەم بابەتەی وە بیر خستووینەتەوە كە ئەو پەرتووكەی كەوا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەردوو بنەما و بنچینەكەی – ژیان و ڕووناكی – لە خۆ گرتووە، چونكە قورئانی پیرۆز (ڕۆحێكە) كە دڵەكان بە هۆی ئەوەوە ژیانی ڕاستەقینە دەدۆزنەوە و (ڕووناكییەكە) كە ڕۆشنایی و ئاورنگ و بریسكە دەبەخشێ.

بە هەمان شێوە كە پەروەردگاری گەورە و بەدەسەڵات (جل جلالە) دەفەرموێت:
﴿أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ سوورەتی ئەنعام ١٢٢.

واتە: ئایا ئەو كەسەی كە مردوو بوو (بەهۆی بێ باوەڕییەوە)، ئینجا (بەهۆی ئیمانەوە) زیندوومان كردەوە و نوور و ڕووناكییەكمان بۆ ساز كرد لە ژیانیدا (كە قورئانە) لە ناو خەڵكیدا پێی دەڕوات و هەڵس و كەوتی پێ دەكات (هاندەرێتی بۆ هەموو چاكەیەك و دەیگێڕێتەوە لە هەموو خراپەیەك، ئایا ئەو كەسە) وەكو ئەوە وایە كە لە ناو تاریكییەكاندا گیــــری خواردووەو لێی دەرناچێت، هەروەها ئا بەو شێوەیە كە دەبینرێت ئەو كارو كردەوەی كە دەیكەن بۆیان ڕازێنراوەتەوە.

واتە كەسێ كە بێ باوەڕ بووە و دڵی تووشی مردنی مەعنەوی بووە و – واتە لەناخەوە ئەو دڵە مردووەو هەست بە تاوان و گوناح ناكات – بە تاریكی و نەزانی و نەفامیدا نقوم بوو بوو بەڵام ئێمە ڕێنموونیمان كرد بۆ سەر ڕێگەی گەشەكردن و ئیمانو دڵمان زیندوو كردەوە و ڕووناكی و ئاورنگمان پێ بەخشییەوە.

بێ باوەڕ بەهۆی پشت تێکردن و ڕوو هەڵچەرخاندن لە گوێڕایەڵێ و نەزانی و نەفامی بەرامبەر بە ناسین و یەکخواپەرستی و ئایین و شەریعەت و بێ ئاگایی و گرنگی نەدان بە بەدەست هێنانی پشك و بەشی خۆی لە ڕەزامەندی پەروەردگار و هەوڵ و کۆشش و هەنگاو نانی بۆ دەرباز بوون و بەختەوەری و خۆشبەختی خۆی، وەك مردوویەك تەماشا دەکات، کە هیچ کاتێك سوود و قازانجێکی بۆ خۆی فەراهەم نەکردووە و زەرەرو زیانێکی لە خۆی دوور نەخستووەتەوە و لای نەبردووە، بەلاّم پەروەردگار ئەویی ڕێنموونی کردووە بۆ ئیسلام و بەهۆیەوە ڕۆحێکی تر تێیدا سەری هەڵداوە، کە لە ڕێگەی ئەو ڕۆحەوە بە درووستی بەرژەوەندییەکانی دەدۆزێتەوە و دیاری دەکات و بۆ دەرباز بوون و ڕزگار بوونی لە تووڕەیی پەروەردگار و سزادانەکانی، هەوڵ دەدات و تێدەکۆشێ.

ئەو دوای بەدەست هێنانی ژیانێکی تازە و دووبارە، حەق و ڕاستییەك کە چاوی بینینیانی نەبوو هەست پێ دەکات و دەیانبینێ و بە نەزانی و نەفامی خۆی هەستیان پێ دەکات و دوای ئەوەی کە پشتی کردبووە حەق و ڕاستی و ڕووی لێ هەڵچەرخاندبوون ڕێگەی حەق و ڕاستی گرتەبەر و ڕووناکی و ڕۆشنایی بۆ پەیدا بوو کە بە کەڵك وەرگرتن لێی لە نێو خەڵکیدا دەژێت و ژیان دەباتە سەر، وە بە پێچەوانەی بێ باوەڕەکانەوە کە لە تاریکی و تاواندا جێگیرن و قەراریان گرتووە. ئەو لە ڕۆشنایی‌و ڕووناکی و ڕێنموونی دا هەنگاو هەڵدەگرێ و هەنگاو دەهاوێ.

| | |
|---|---|
| ليلي بوجهك مشرق | وظلامه فى الناس ساري |
| الناس فى سدف الظلام | ونحن فى ضوء النهار |

واتە: شەوی من، بە ڕۆشنایی و ڕووناکی ڕوو و ڕووخساری تۆوە ڕۆشنە، بەلاّم تاریکی شەو خەڵکی داپۆشیوە، خەڵکی لە تاریکی زوڵم و بێزاریدا جێگیرن، بەلاّم ئێمە لە ڕووناکی و ڕۆشنایی ڕۆژدا هەنگاو هەڵدەگرین و هەنگاو دەهاوین.

## _ نموونەیەك لە ئاو و ئاگر:

پەروەردگار لە پەیوەندی لە گەڵ (پەیامی ئاسمانی و بەندەكانیدا) نموونە و وێنە لە ئاو و ئاگر دەهێنێتەوە:

سەبارەت بە نموونەی یەكەم دەفەرمووێت: ﴿أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَابِيًا وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِثْلُهُ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً وَأَمَّا مَا يَنْفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الْأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ﴾ سوورەتی ڕەعد ١٧.

واتە: هەر ئەو لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، بە ئەندازەی ئەو دۆڵ و شیوە بەهۆی ئەو بارانە پڕ دەبن (ئینجا لاوفاوێك دروست ئەبێت) ئەو لافاوە كەف و كوڵی بەرز هەڵگرتووە، (ئەمە نموونەی یەكەمی حەق و ناحەقە، بۆ نموونەی دووەم دەفەرمووێت) هەروەها لەسەر ڕووی ئەو كانزایانەی كە ئاگری تێ بەر دەدەن و دەیتوێننەوە بە ئاگر بۆ دروست كردنی خشڵ وەكو (ئاڵتوون و زیو) یاخود بۆ پێویستی تر (وەكو ئاسن و مس و قورقوشم) كەف و كوڵ دروست ئەبێت وەكو كەف و كوڵی سەر ئاوەكە، ئا بەو شێوەیە خوا نموونە دەهێنێتەوە بۆ حەق و ناحەق، بۆ ڕاست و ناڕاست، جا ئەوەی كەف و كوڵ و بێ سوود و بێ كەڵكە دەڕوات و دەپووكێتەوە، بەڵام ئەوەی كە سوود بەخش و بە كەڵكە بۆ خەڵكی، لە سەر زەوی دا هەر ئەوە دەمێنێتەوە، ئا بەو شێوەیە خوا نموونە جۆرا و جۆرەكان دەهێنێتەوە، (دیارە كە بەتاڵ و ناحەقی كەف و كوڵن و تەمەن كورتان، حەق و ڕاستیش ئاوە پاكەكەیە و كانزا بە سوودەكانن دەمێننەوە هەمیشە لە زەوییدان.

پەروەردگار (پەیام و وەحی) خۆی چواندووە بە ئاو كە ژیان و ژیان بەسەر بردنی لێ پەیدا دەبێت، هەروەها چواندوویەتی بە ئاگریش كە ڕووناكی و ڕۆشنایی لێ فەراهەم دەكرێت و بەدەست دێت.

پەروەردگار ئاماژەی بەم بابەتە کردووە کە هەر دەشت و شیو و دۆڵێ بە ئەندازەی خۆی ئاو و لافاو لە خۆی تێدەپەڕێنێ و پێیدا دەڕوات، شیو و دۆڵی گەورەتر ئاوی زیاتر و دۆڵ و شیوی بچووکتر ئاوی کەمتر، دڵەکانیش هاوشێوەی ئەو شیو و دۆڵانەن، دڵە گەورە و مەزنەکان جێگە و شوێنی زانست و ناسینی زیاتریان هەیە و دڵە بچووکەکانیش بە ئەندازەی خۆیان لێیان بەهرەمەند دەبن. هەروەها گومان و هەوا و ئارەزوو گەلێ کە هەندێ لە دڵەکان لە خۆیاندا کۆیان دەکەنەوە و بەهۆی بوونی ڕووناکی و ڕۆشنایی پەیام و وەحی لەو دڵانەدا، ئەوانی لە یەکتر جیا کردووەتەوە و چواندوویەتی بە تەواوی ئەو شتانەی کە لافاوەکان لە گەڵ خۆیاندا دەگوازێتەوە.

هەروەها لەناوچوونی ئەو گومان و ئارەزوو و هەوایانەی بەهۆی کاریگەری بوونی زانستی بە کەڵك و بەسوود و ناسین و ئاشنایەتی ویستراو و ئارەزوو کراو چواندوویەتی بە لەناو بردنی کەفی سەر ئاو و مانەوەی ئەو شتەی کە بۆ خەڵکی بەسوود و بە کەڵکە.

بەلاّم سەبارەت بە نموونەی دووەم، واتە چوواندنی پەیام و وەحی بە ئاگر کە ناپاکی و پیسییەکان لە ماددە کانزاییەکان جودا دەکاتەوە و پاکی و خاوێنیان پێ دەبەخشێ، دەفەرمووێت: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ لَا يُبْصِرُونَ (۱۷) صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لا يَرْجِعُونَ﴾ سوورەتی بەقەرە ۱۷ — ۱۸.

واتە: نموونە و وێنەی ئەوانە وەك کەسێك وایە: ئاگرێك دابگرسێنێت (بۆ سوودی خۆی و هاوڕێکانی) کەچی کاتێك هەڵگیرساو دەورووبەری خۆی ڕوناك کردەوە، خوا ڕووناکییەکەیان لێ بکوژێنێتەوە و لە چەندەها تاریکی دا جێیان بهێڵێت و هیچ تروسکاییەك نابینن و ڕێ دەرناکەن، ئەوانە کەڕ و لاڵ و کوێرن (لە ئاستی حەق و ڕاستی دا)و ناشگەڕێنەوە (بۆ سەر هیدایەت).

پاشان پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّمَاءِ فِيهِ ظُلُمَاتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ مِنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ وَاللَّهُ مُحِيطٌ بِالْكَافِرِينَ﴾ سوورەتی بەقەرە ١٩.

واتە: یاخود وێنەیان وەك كەسانێك وایە بەدەست بارانێكی لێزمەوە گیریان خواردبێت، كە پەڵە هەوری تاریك و هەورە تریشقە و برووسكەی هەبێت، لە تاو دەنگی برووسكەكە پەنجەیان دەئاخنن بە گوێچكەیاندا لە ترسی مردن، خوایش گەمارۆی كافرانی داوە (بارانەكە قورئانە و برووسكەكان، ترساندنی دووڕووەكانە كە حەز بە بیستنی ناكەن).!

ئێمە لە پەرتووكەكانی (المعالم) و (الوابل الصیب)دا بەدوور و درێژی لە بارەی فەلسەفە جێگیرەكان لەم دوو نموونە و نهێنیانە قسەمان كردووە.[٤٣]

## _ درووستكردن و چاكسازی كردنی دڵ مەرجدارە بە دوو بنەماكە؟

مەبەست ئەمەیە كە بەرژەوەندی و بەختەوەری و خۆشبەختی دڵ، لە پاڵ هێنانەدیی و دەستەبەركردنی ئەو دوو بنەماو بنچینانەدایە.

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُبِينٌ (٦٩) لِيُنْذِرَ مَنْ كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ الْقَوْلُ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ سوورەتی یس ٦٩ – ٧٠.

واتە: ئەوەی كە فێرمان كردووە تەنها یاد خەرەوە و قورئانێكی ئاشكرا و ڕوونە، ئەم قورئانە بۆ ئەوەیە ئەو كەسانە بێدار بكاتەوە كە زیندوون (دڵ و عەقڵیان زیندوو و هۆشیارە) تا بڕیاری خوا لەسەر كافران جێ بەجێ بكرێت (بڕیاری سەرگەردانی دونیا و سزای قیامەت، ئەگەر باوەڕی پێ نەكەن.

ئاماژەی بەم ڕاستییە كردووە كە بە ئاگابوون و كەڵك وەرگرتن لە قورئانی پیرۆز، تەنیا بۆ ئەو كەسانە فەراهەم دەبێت كە خاوەنی دڵێكی زیندوو و هۆشیار بن. وەك

---

٤٣ ئەمە قسەی ئامادەكارە.

چۆن له جێگەیەکی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ سوورەتی ق ٣٧.

واتە: بە ڕاستی ئا لەو بەسەرهاتانەدا یادەوەری هەیە بۆ کەسێك دڵێکی زیندووی هەبێت، یا خود گوێ بۆ قورئان ڕادێرێت، لە کاتێکدا ئامادە بێت بۆ فەرمانبەرداری و کردنی هەموو کارێکی درووست.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ سوورەتی ئەنفال ٢٤.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، بەدەم بانگەوازی خوا و پێغەمبەرەوە بچن کاتێك بانگتان دەکات بۆ بەرنامە و ڕێبازێك کە دەتانژێنێتەوە و ژیان بەخشە، چاك بزانن بە ڕاستی خوا (زۆر بە ئاسانی) دەتوانێت دەسەڵاتی بکەوێتە نێوان ئادەمیزاد و (ئاواتەکانی) دڵییەوە (بەگۆڕینیان)، بیرتان نەچێت بە ڕاستی هەر بۆ لای ئەویش کۆ دەکرێنەوە.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگاری مەزن و بەدەسەڵات (جلّ جلالە) پێمان دەفەرمووێت: ژیانی ڕاستەقینەی ئێمە تەنیا لە ڕێگەی هەوڵ و کۆشش بۆ بەدەست هێنانی (زانست و ئیمان) دەستەبەر دەبێ و دێتە دیی. کە واتە بەدیار دەکەوێت کە بێ بەش بوون لە ناسین و ئیمان، دەبێتە هۆی مردن و لەناو بردنی دڵ.

پەروەردگار بەو کەسانەی کە وەڵامێکی ئیجابی نادەنەوە بە بانگهێشت و بانگ کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، چوواندوونی بە مردووە بە خاك سپێردراوەکان، ئەم چوواندنە، چوواندنێکی زۆر جوان و ڕەوایە، چونکە جەستە و لاشەی ئەو کەسانەی کە دڵیان تووشی مردنی مەعنەوی بووە، – ئەو جەستە و لاشەیە – بووەتە گۆڕستانی دڵەکانیان، دڵەکانیان مردوون و لە گۆڕستانی جەستەیاندا نێژراون و بەخاك سپێردراون!

پەروەردگاری زانا و بەدەسەڵات دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاءُ وَلَا الْأَمْوَاتُ إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَنْ يَشَاءُ وَمَا أَنْتَ بِمُسْمِعٍ مَنْ فِي الْقُبُورِ﴾ سوورەتی فاتر ٢٢.

واتە: زیندووان و مردووانیش هاوتای یەك نین بێگومان خوا ڕاستی دەدات بەگوێی هەر کەسێکدا بیەوێت، بەڵام تۆ ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) ناتوانیت پەیامەکەت بگەیەنیت بەو کەسانەی کە لەناو گۆڕدان (مەبەست کافرانە کە وەك مردوو نابیستن و ئەگەر بشبیستن سوودی لێ وەرناگرن).!

شاعیرێك هۆنراوەیەکی سەرنج ڕاکێشی هۆنیوەتەوە و دەڵێ:

**وفي الجهل، قبل الموت، موت لأهله واجسامهم قبل القبور، قبور**

**وارواحهم في وحشة من جسومهم وليس لهم حتى النشور نشور**

واتە: ((نەزانی و نەفامی پێش مردن، مردنی نەزانان و نەفامانە، وە جەستەکانیان پێش گۆڕ، گۆڕی ئەوانە. ڕووحەکانیان لە گەڵ جەستەکانیاندا لە مەترسی و سام و ترسدان، بەڵام ئەوانە تا کاتی دیاری کراویان بەخەبەر نایەن)).

لەبەر ئەمەیە کە پەروەردگار لە وەحی و پەیامێ کە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت) بە (ڕۆح) ناوی دەبات. بە هەمان شێوە کە دەفەرمووێت: ﴿رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ لِيُنْذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ﴾ سوورەتی غافر ١٥.

واتە: ئەوپەروەردگارە پلە و پایەی زۆر بڵندە، خاوەنی تەختی فەرمان ڕەوایی تایبەتی خۆیەتی، ئەو زاتە وەحی و نیگا بە فەرمانی خۆی دەنێرێت بۆ هەر کام لە بەندەکانی کە خۆی بیەوێت، (قورئان ڕۆحە، چونکە ژیان بەخشە بە عەقڵ و دڵ و دەروون)، بۆ ئەوەی خەڵکی بترسێنێت لە ڕۆژی بە یەك گەیشتنەوە (گەیشتنەوەی ڕۆح بە جەستە، گەیشتنەوەی ئادەمیزاد بە کردەوەکانی).

وە فەرموویەتی: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا.....﴾ سوورەتی شوورا ٥٢.

واتە: ئەی موحەممەد (صلی الله علیە وسلم) ئا بەو شێوەیەی کە وتمان ئێمە قورئانمان بۆ ڕەوانە کردیت لە لایەن خۆمانەوە (کە ژیان بەخشە بە ڕۆح و گیان و عەقل).

چـونکه ژیـانی حـەقیقی و ڕاسـتەقینەی ڕۆح و دڵـەکان پەیوەسـتە بـە ناسـین و ئاشنایەتی و پەیڕەوی کـردن لـە وەحـی و پـەیامی ئاسمـانی. ئەمـە هـەمان ئـەو ژیانـە خۆش و جێ ڕەزامەندییەیە کە پەروەردگار کەسانێ کە لـە وەحـی و پـەیامی ئاسمـانی ئاگادار و شارەزا بن و پەیڕەوی لێ بکەن، بەهرەمەند دەکات.

پەروەردگار دەفەرموویـت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ سوورەتی نەحل ٩٧.

واتـە: ئـەوەی کـاروکردەوەی چـاکەی کردبێـت، پیـاو بێـت یـان ئـافرەت بێـت، لـە کاتێکـدا بـڕوادار بێـت، سـوێند بـەخوا بـە ژیـانێکی کامـەران و ئاسـوودە لـە دونیـادا دەیژێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بەجوانتر دەدەینەوە لەوەی کە ئەوان دەیان کرد.

پەروەردگاری زانا، دانا و کاربەجێ تەنیا ئەوانی لە بەهرەمەند بوونیان لـە ژیـانێکی خۆش و پاك لە دونیا و دوارۆژدا تایبەت کردووە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَأَنِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُمْ مَتَاعًا حَسَنًا إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ....﴾ سوورەتی هود ٣.

واتە: هەروەها خەڵکینە.! داوای لێ خۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، لـەوە و دوا بگەڕێنەوە بۆلای، ئەو کاتە بە چاکی دەتان ژێنێت، بە ژیانێکی چاك، تا کاتێکی دیاری کراو هەروەها پاداشتی هەموو خـاوەن چـاکەیەك بـە زیـادەوە دەداتـەوە، خـۆ ئەگـەر ئێوە پشت هەڵکەن و گوێڕایەڵی فەرمانی خوا نەبن، ئەوە بە ڕاستی من — مەبەست لـە پێغەمبەری خۆشەویستە — دەترسم کە سزای ڕۆژێکی گەورە و سەخت یەخـەتان پـێ بگرێت (کە ڕۆژی قیامەتە، یان ئەو ڕۆژەی خوای گەورە لە ناوتان دەبات).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿.....لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ﴾ سوورەتی نەحل ٣٠.

واتە: بۆ ئەو کەسانەی کە لەم جیهانەدا چاکەیان کـردووە، چـاکە دێتـەوە ڕێیـان، بێگومان جێگە و ڕێگەی ئەو جیهانە خۆشتر و چاکتر و سازگارتر و پڕ لە ناز و نیعمـەت

تره (بەراورد ناكرێت لە گەڵ دونیادا) ئای كە چەندە جێگە و ڕێگە و كۆشك و تەلاری خواناس و پارێزكاران سازگار و خۆش و جوان و ڕازاوەیە.

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەلاّت ئاماژەی بەم بابەتە كردووە كە، كەسە پاك و چاكەكان و پارێزكارانی بەهۆی پاكی و پارێزكاری كردنیان – لە تاوان و سەرپێچی – لە دونیا و دواڕۆژدا سەربەرز و بەختەوەریان دەكات و كەسە پیس و خراپكارەكان و لە خوا نەترسەكانیش بە هۆی ناپاكییەكان و خۆ نەپارێزییەكانیان لە دونیا و دواڕۆژدا بچووك و بەدبەخت و چارەڕەشیان دەكات.

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەلاّت دەفەرموویێت: ﴿فَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يَهدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ وَمَنْ يُرِدْ أَنْ يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ كَذَلِكَ يَجْعَلُ اللَّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ سوورەتی ئەنعام ١٢٥.

واتە: جا ئەو كەسەی (خێری تێدا بێت)و خوا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە سینەی ساف و پاك و ئامادە دەكات بۆ ئایینی ئیسلام، ئەو كەسەیش خوا بیەوێت گومڕای بكات، ئەوە دڵی دەگوشێت و سنگی توند دەكات و هەناسەی سوار دەبێت، هەر وەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرز بێتەوە (چۆن تووشی تەنگەنەفەسی و دڵە تەپێ و خوێن بەر بوون دەبێت)، ئا بەو شێوەیە خوا گومڕایی و پیسی هاوەڵگەری لەسەر دڵی ئەوانە دادەنێت كە باوەڕ ناهێنن.

ئەهلی ڕێنموونی و ئیمان لە كرانەوە و فەرحانەی سنگ و بەرینی و بەرفراوانی دڵ بەهرەمەندن، بەلاّم ئەهلی تاوان و بێ باوەڕان، لە دڵتەنگی و نا فراوانی سنگ و دڵڕەقی، ڕەنج و ئازار دەكێشن.

پەروەردگاری گەورە و بەدەسەلاّت دەفەرموویێت: ﴿أَفَمَنْ شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَى نُورٍ مِنْ رَبِّهِ.....﴾ سوورەتی زومەر ٢٢.

واتە: جا ئایا ئەو کەسەی کە خوای میهرەبان سنگی گوشاد کردووە بۆ ئیسلام و لە سەر ڕێبازی نوور و ڕووناکی پەروەردگارییەتی، وەك ئەو کەسە وایە کە پێچەوانەیە..؟!

ئەهلی ئیمان لە ڕووناکی و ڕۆشنایی و بەرفراوانیدان، بەڵام ئەهلی بێ باوەڕی و گومڕایی لە تاریکی و دڵڕەقی و لاوازی دڵدا بەسەر دەبەن.

لە بەشی تایبەت بە پاکی و خاوێنکردنەوەی دڵدا لەم بارەیەوە زیاتر قسە دەکەینو دەدوێین: مەبەست ئەوەیە کە ژیان و ڕووناکی و پرشنگداری و ئاورنگی دڵ، سەرچاوەی تەواوی چاکە و بەختەوەری و خۆشبەختییەکانە و مردن و تاریکی دڵ هۆکاری تەواوی خراپە و بەدبەختی و چەرمەسەرییەکانە.

## تەوەری دووەم: ژیانی دڵ لە پاڵ تێگەیشتن و فێربوونی حەق دا

### _ دوو هێزی زانست و ویست( العلم و الارادة ):

لەوێوە کە دڵ لە دوو جۆرە هێز بەهرەمەند و بەرخوردارە:

- هێزی زانست و جیاکردنەوە.
- هێزی ویست و حەز لێ کردن.

ژیری و (کمال)ی، خێر و چاکەی ئەو لەپاڵ بەکارهێنان و کەڵك وەرگرتن لەم دوو هێزە بە ئاراستەی هێنانەدی خێر و بەرژەوەندییەکان و هێنانەدی چاکە و بەختەوەریو کامەرانی ئەوە.

ژیری و ماقوڵی (کمال)، گەشەکردنی کەماڵ و ژیری لە بەکارهێنانی هێزی زانست لە درك کردن و تێگەیشتن و ناسینی حەق و ڕاستی و بەچاکتر زانین و بەرز نرخاندنی ئەوە بەسەر ناحەق و باتڵدا.

- هەرکەسێ حەق و ڕاستی نەناسێ، لە گومڕایی دا هەنگاو هەڵدەگرێ و سەر لێشێواو و پەرێشان دەبێت.

– هەركەسێ حەق و ڕاستی ناسی و هیچ و پووچی (باتل) بە باشتر زانی، دەكەوێتە بەر تووڕەیی پەروەردگار.

بەڵام هەركەسێ حەق و ڕاستی بناسێ و پەیڕەوی لێ بكات، ئەهلی بەخشش و كامەرانی و خۆشبەختییە.

پەروەردگاری مەزن داوای لێ كردووین كە لە نوێژەكانماندا داوای لێ بكەین ڕێنموونیمان بكات بۆ سەر ڕێگەی ئەوانەی كە لە بەخششەكانی پەروەردگار بەهرەمەندن، نەك ڕێگەی ئەو كەسانەی كە كەوتوونەتە بەر قین و تووڕەیی خوداوەندو یاخود لە ڕێگەی گومڕایی دا هەنگاویان هەڵگرتووە.

بۆیە بەهۆی فرە خودایی لە نەزانی و نەفامی و جاهلییەتدان، نزیكترن لە گومڕایی و تاریكییەوە، بەڵام یەهود كە گەلێكە ئەهلی ڕقەبەری و قبووڵ نەكردنی حەق و ڕاستی، نزیكترن لەو گەلەی كە كەوتوونەتە بەر ڕق و تووڕەیی خودا.

بەڵام ئەهلی ڕێنموونی، ئیمان، یەكخواپەرستی و دادگەرییە كە ئەهلی بەخشش و "منعم علیهم"ن.

لەم بارەیەوە سفیانی كوڕی عویەینە (خوای لێ ڕازی بێت) وتوویەتی: ((هەر یەكێ لەموسڵمانان كە تووشی تاوان و سەرپێچی بێت، وەك نەصرانیەكان لێ دێت و هەریەكێ لە زانایان كە تووشی خراپەو تاوان بن، وەك یەهودییەكانیان لێ دێت و هاوشێوەی ئەوانن، چونكە خاچ پەرستەكان بەبێ زانست و لە ڕووی نەزانییەوە پەرستش ئەنجام ئەدەن، بەڵام جوولەكەكان (یەهودییەكان) حەق و ڕاستی دەناسن و دەیزانن بەڵام پەیڕەوی لێ ناكەن و بەپێچەوانەی ئەو حەق و ڕاستییە كار دەكەن و ڕێگەی بێ باوەڕی و ڕكابەرییان گرتووەتە بەر)).

له مسندی ئیمام ئەحمەد و سننی ترمزیدا له (عدی کوڕی حاتم)ـەوه (خوایان لێ ڕازی بێت) هاتووه که پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((**الیهود مغضوب علیهم، والنصاری ضالّون**))[٤٤].

واته: ((جوولەکەکان (یەهودییەکان) ئوممەت و گەلێکن کە کەوتوونەتە بەر ڕق و تووڕەیی پەروەردگارەوە (جلّ جلاله)و گاور و خاچ پەرستەکانیش خەڵکانێك و کەسانێکن کەوا ڕێگەیان ون کردووە)).

## _ ناسین و پەیڕەوی کردن له حەق و ڕاستی:

پەروەردگار (جلّ جلاله) له زۆرێك له ئایەتە جوانەکانی قورئاندا ئەم دوو بنەما و بنچینەیەی – ناسینی حەق و ڕاستی پەیڕەوی کردن لێی – لەپاڵ یەکتردا باسکردووە و باسیانی فەرمووە: ﴿**وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ**﴾ سوورەتی بەقەره ١٨٦.

واته: ((ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێ بکەن دەربارەی من، ئەوە من نزیکم لێیانەوە، بە هاناو هاواری دوعاکەیانەوە دەچم هەر کاتێك لێم بپاڕێنەوە و نزا بکەن، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگەوازی منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بەمن بهێنن بۆ ئەوەی ڕێگای هۆشیاری و ئاگایی بگرنە بەر (بۆ بەدەست هێنانی سەر بەرزی و سەرفرازی هەردوو جیهان)).

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار وەڵام دانەوە و قبووڵ کردنی حەق و ئیمانی بەخودی خۆیەوە پێکەوە هێناوە.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿**....فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ**﴾ سوورەتی ئەعراف ١٥٧.

---

[٤٤] اخرجه الترمذی (٢٩٥٤).

واتـه: ((جـا ئەوانـەی باوەڕیـان بـه پێغەمبـەر هێنـاوه و پـشتیوانیان لێ کـردووه و پشتگیریان کردووه و شوێنی ئەو نـووره کـەوتوون (کـه قورئانـه)و هـاوڕێ لەگـەڵی دا ڕەوانه کراوه، هەر ئەوانه سەر فراز و ڕزگارن)).

وه هەروەها دەفەرموویت: ﴿الم (١) ذَلِكَ الْكِتَابُ لا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ (٢) الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ (٣) وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ (٤) أُولَئِكَ عَلَى هُدًى مِنْ رَبِّهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ سوورەتی بەقەره ١ — ٥.

واته: ((به (ئەلیف، لام، میم) دەخوێنرێنەوه، هەر خوا خـۆی زانایـه بـه نهێنـی ئـەو پیتانـه، ئـەو قورئانـه کتێبێکـه هـیچ گومـانێکی تێـدا نییـه، (کـه لەلایـەن خـوای پەروەردگارەوه ڕەوانه کراوه به جیرەئیلدا بـۆ پێغەمبـەر (صلی الله علیـه وسـلم) کـه مایـەی ڕێنمـوونی و سەرچـاوەی هیدایەتـه بـۆ خواناسـان و پارێزکـاران (کـه ئەوانـەن فەرزەکان جێ بەجێ دەکەن و له حەرام خۆیان دەپارێزن، له ڕووی بیروباوەڕ و کردارو گوفتارەوه). ئەوانەی باوەڕ به نەبینراوەکان دەهێنن (وەك خـوا و فریـشته و ئەوانـەی خـوا باسـی کـردوون و ئێمـه نایـان بیـنین)، هـەروەها نوێـژەکانیش بـه چـاکی ئـەنجام ئەدەن‌و لەو ڕزق و ڕۆزییه (حەلاڵە)ی پێمان بەخشیون، دەبەخشن. (له هەمان کاتـدا) ئەوانه باوەڕ دەهێنن بەو (پەیامەی) کـه بـۆ تـۆ (ئـەی موحەممـەد) دابـەزێنراوه و بـەو پەیامانەش که بۆ (پێغەمبەران)ی پێش تۆ دابەزێنراوه، دڵنیاش دەبن کـه ڕۆژی دوایـی پـێش دێت و قیامـەت هـەر بـەرپا دەبێت. ئـا ئەوانـه لـه سـەر شـا ڕێگـەی هیدایـەتی پەروەردگارییانن و هەر ئەوانیش سەرفراز و سەرکەوتوو (ئەمانه بنـەما سـەرەکییەکانی ئیمان و ئیسلامن)).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿...وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ...﴾ سوورەتی بەقەره ١٧٧.

واتە: ((کرداری چاك و کاری باش بریتیە لەوەی کە ئادەمیزاد باوەڕی هێنابێت بەخوا و بەڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بەکتێبەکان و بەپێغەمبەران، هەروەها ماڵ و سامانی بەخشی بێت – لەگەڵ خۆشەویستی دا بۆی – بەخزمان و هەتیوان و هەژاران‌و ڕێبواران و داواکاران و لەپێناوی ئازاد کردنی بەندەکاندا، هەروەها نوێژی بە چاکی ئەنجام دابێت و زەکاتیشی لەماڵ و سامانی دەرکردبێت)).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَالْعَصْرِ (١) إِنَّ الإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ (٢) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ سوورەتی عەصر ١ – ٣.

واتە: ((سوێند بە زەمانە، سوێند بە کاتی عەصر، بە ڕاستی ئادەمیزاد لە زەرەرمەندی و خەسارەتمەندیدایە، بێجگە لەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کار و کردەوەی چاکیان ئەنجام داوە و ئامۆژگاری یەکتریشیان کردووە کە هەمیشە پابەندی حەق بن (پابەندی حەقیش پێویستی بە خۆگری هەیە))، لەبەر ئەوە بەردەوام ئامۆژگاری یەکتریان کردووە تا هەمیشە و بەردەوام، خۆگر و ئارامگریش بن)).

پەروەردگار (جلّ جلاله) بە زەمان و کات کە هەل و دەرفەتە بۆ هەنگاو هەڵگرتن و هەنگاو نان بۆ کارو کردەوەی چاکە و کامەران بەخش و یاخود خراپە و زیان بارو بەدبەختی و چارەڕەش، سوێندی خواردووە کە تەواوی مرۆڤەکان جگە ئەوانەی کە توانای زانستی و ئیمانی و کاری چاکەی خۆیانیان لە ڕێگەی پەیڕەوی کردن لە پەروەردگار بەهێز کردووە، لەتیاچوون و زەرەر و زیاندان و تەواوی کەماڵی نەفسی ئەوان لەم ناسین و ئیمان و کارە چاکەدا شاراوەیە.

دوای ئەوە خەڵکانی تر بەرەو لای ئیمان و کار و کردەوەی چاکە بانگ بکات و ئەوان لە ڕێگەی گەشە کردن و گەورەبوون و کامڵی و تەواویدا جێگیر بکات و دایان بنێ، مەرجی ئەوەش خۆڕاگری و پشوو درێژییە لە بەرامبەر کێشە و گرفتەکان و بەرامبەر ڕێگر و لەمپەرەکاندا.

ئەهلی ئیمانیٚ کە بەهۆی زانست و ئیمان و کارو کردەوەی چاکە، نەفسی خۆیانیان لە ڕێگەی گەورەبوون و گەشەکردن و بەرەو پێشەوە چووندا جێگیر کردووە و بەهۆی فێرکردن و پەروەردەکردن و ئاراستەکردنی خەڵکانی تریشەوە ڕێگەی ڕێنموونیان پیٚ بەخشیبیٚ و پیشانیان دابیٚ و خۆڕاگری و پشوو درێژی بکەنە بنەما و بناغەی کاری خۆیان.

لەبەر ئەمەیە کە ئیمامی شافیعی فەرموویەتی: ((ئەگەر خەڵکی بیریان لەسوورەتی (عەصر) دەکردەوە و لێی تێڕا دەمان و کردەوەیان بە ناوەڕۆکەکەی بکردایە، بەسیان بوو)).

لە بابەت گەلێکی زۆر، قورئانی پیرۆز ئاماژەی بەم بابەتە کردووە و پەروەردگار تەواوی مرۆڤەکانی لەم حەقیقەت و ڕاستییە ئاگادار کردووەتەوە کە ئەهلی بەختەوەری و کامەرانی تەنیا ئەو کەسانەن کە ڕاستی و حەقیقەتیان ناسیوە و پەیڕەوییان لیٚ کردبیٚ و ئەهلی چارەڕەشی و بەدبەختیش ئەوانەن کە وێڕای ناسین و ئاشنا بوونیان بە حەقیقەت و ڕاستییەکان قبووڵی ناکەن‌و وەری ناگرن و دژایەتییان دەکەن — دژایەتی ئەو حەق و ڕاستییە — ڕێگەی پووچ و هیچ دەگرنە بەر.

دەبیٚ بزانین کە ئەو دوو هێزە — ناسین و پەیڕەوی کردن — هیچ کاتیٚ لە دڵدا لەناو ناچن، بەڵام ئەگەر توانایی و لێهاتوویی زانستی ئەو لە ڕێگەی ناسینی حەق و درک کردن و تێگەیشتنی ئەو بەکار نەیەت، بەدڵنیاییەوە لە ڕێگەی نەزانی و نەفامی و کاروباری هیچ و پووچدا هاوتەراز و وەك ئەو لەگەڵیدا بەکاردەهێنریٚ.

هەروەها ئەگەر هێزی ویست و ئارەزوو بە شێوەیەکی کردەیی لە ئاراستەی کارکردن بە حەق و ڕاستی بەکار نەهێنریٚ، بیٚ گومان لە ڕێگەی پووچ و نەزانی و نەفامیدا ئەو بەکار دێنن.

مرۆڤ بە شێوەیەکی سروشتی پاسەوانێکە خاوەنی ویست و مەردایەتی و پیاوەتی، بە هەمان شێوە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((**أصدق الأسماء: حارث همام**)).[٤٥]

واتە: ((گونجاوترین و شیاوترین ناو بۆ مرۆڤ (حارث) بەدەستهێنەر و سەودا گەر (همّام) خاوەنی ویست و ئیرادە)).

نەفسی مرۆڤ بە هۆی ویست و ئیرادەوە دەجووڵێ و جووڵەی سروشتی و خۆڕسکی بەشێکە لەپێویستییە خۆیی و دەروونییەکانی مرۆڤ.

پێویست بوونی ویست و ئارەزووش ئەمەیە کە خاوەنی ئامانج و نیازێکی شایەنی هێنانە پێش چاو و ئاشکراکردن و جیاوازییە. ئەگەر نەتوانێ حەق و ڕاستی ببینێ و هەستی پێ بکات و بەدوای بەدەست هێنانییەوە نەبێ، ئەوا ناحەق و ناڕەوا دەدۆزێتەوە و ئەوە بەدەست دەهێنێ، جگە لە دیاری کردن و هەڵبژاردنی یەکێ لەم دوو ڕێگایانە، زانست و ویست و ئارەزوو تەگبیر و چارەیەکی تری نییە.

لە بەشی دواتردا ئەم بابەتە زیاتر دەخرێتە ڕوو و باسی لێوە دەکرێت.

---

٤٥ اخرجه ابو داود.

## تەوەری یەکەم: دیاریکردنی دەرمانەکانی نەخۆشییەکانی دڵ

### نەخۆشییەکانی دڵ دوو جۆرن:

جۆری یەکەم: جۆرێکە لە نەخۆشی و ناساغی، کە مرۆڤ خێرا و بەزوویی هەست بەو نەخۆشییە ناکات، ئەم نەخۆشییانەش بریتین لە: ((نەزانی و نەفامی، دوو دڵی و گومان و هەوا و هەوەس)) کە زیاتر قسەمان لەسەر کردوون و باسمان کردوون.

ئەم جۆرە نەخۆشییە زەرەر و زیانەکانی و شوێنەما و نیشانەکانی لە جۆرەکانی تری بەگوێرەی پلە خراپتر و مەترسیدارترە،بەڵام نەخۆشەکە بەهۆی خراپی و پیسی دڵییەوە هەستیان پێ ناکات، چونکە سەرگەردانی و لەهۆش چوونی بەهۆی نەزانی و نەفامی و پەیڕەوی کردن لە هەوا و ئارەزووە نەفسییەکانی، دەبێتە لەمپەر و ڕێگر لە بەردەم ئەوەدا کە نەتوانێ ڕەنج و ئازار و کارییگەرییەکانی دەرك پێ بکات و لێیان تێ بگات، لە کاتێکدا کە ئاکام و کاریگەرییەکانی ئەو نەخۆشییانە بە تەواوی لەگەڵیدایە و هاوڕێیەتی، بەڵام بەهۆی سەرقاڵییەوە بەو کاروبارانەی کە بەدڵی خۆیەتی و بەلایەوە خۆشن، لەو کاریگەری و نیشانە و زەرەر و زیانانەی ئەو نەخۆشییانە بێ ئاگایە و ئاگای لێیان نییە.

بە هەمان شێوە کە وترا: ئەمە یەکێکە لە خراپترین و قورس ترین جۆرەکانی نەخۆشییە دەروونییەکان. تەنیا پێغەمبەران و شوێنکەوتەکانیان بە هۆی ئەوەی کە پسپۆڕی چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییانەن، دەتوانن چارەسەرییان بکەن و دەرمانیان بکەن.

جۆری دووەم: جۆرێکە لە نەخۆشی دڵ و دەروون، کە لە هەمان کاتدا مرۆڤ تووشی ئێش و ئازار و ڕەنج و دەردەسەری دەکات، وەك: خەم و خەفەت و پەژارە و قین و تووڕەیی و ڕق...

ئەم جۆرە نەخۆشییانە بە دەوا و دەرمـان گـەلێكی وەك دەسـتەبەركردنی هۆكـار و ئامرازەكان، یاخود فەراهەم كردنی كاروباریێ كە لە بەرامبەریاندا جـێگیرن و لـە كـاتی هێنانەدی و دەست خستنی هۆكارەكانیان ئەوا چارەسەریان دەكریێ و لەناو دەبرێن.

ئەمە وەك دڵ وایە كـە بـە هـۆی ئـێش و ئازارەكـانی جەسـتە و نـا پەسـەندی و نـا هەمووارییەكانییەوە تووشی ڕەنج و ئازار و خراپە دەبێتەوە و جەستەش بەم شێوەیە دەكەوێتە ژێر كاریگەری نەخۆشـییە جەسـتەییەكانەوە و لـە بـێ ئـۆقرەیی و نائـارامی ئەوانـە ئـەویش تووشـی نـا ئـارامی و بـێ ئـۆقرەیی دەبـێ و ئـارامی و ئاسـوودەیی لێ دەبڕێت.

نەخۆشییە دیار و ئاشكراكانی دڵ كە بە هـۆی ڕێگـە چـارە سروشـتی و باوەكانـەوە چارەسەر دەكرێن و دەرمان دەكرێن، بەشێكن لە نەخۆشییە جەستەییەكان و ئەمە بە تەنیا نابێتە هۆی نەگبەتی و بەدبەختی و سزای دوای مردن.

بـەڵام ئـەوە نەخۆشـییە دەروونییـەكانی دڵـن — كـە تـەنیا بـەهۆی دەوا و دەرمانـە ئیمانییە ڕێگە پێدراوەكانەوە لەلایەن خـاوەنی پەیامـەوە (پـەیامی ئاسمـانی) شـایەنی چارەسەرن — كە دەبنە هۆی بەدبەختی و چارەڕەشی و سزای سەخت و بـە ئـازار، لـە دونیـا و دواڕۆژدا، مەگـەر ئـەوەی كـەوا بـە هـۆی دەوا و دەرمـان گـەلێكی گونجاوەوە دەست بكریێ بەچارەسەركردنیان و هەنگاویان بۆ هەڵ بگیردریێ بە مەبەستی دەرمان و چارەسەركردنیان.

چونكە ئەگەر لـەو دەوا و دەرمـان و ڕێگـە چـارانە كـەڵك وەربگـیردریێ، بـێ گومـان نەخۆشییەكە چارەسەر دەكریێ و ڕزگـاری و چـاك بوونـەوە بەدەست دێت و فەراهـەم دەبێت.

پـەروەردگاری مـەزن و بەدەسـەڵات دەفـەرمووێت: ﴿قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنْصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ (١٤) وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ سوورەتی تەوبە ١٤ — ١٥.

واتە: ((ئەی ئیمانداران بجەنگن دژی بێ باوەڕان، ئەوە خوایە کە بەدەستی ئێوە سزایان دەدات و سەرشۆڕ و خەجاڵەتیان دەکات و ئێوە بەسەریاندا سەر دەخات سینەی گرۆی ئیماندارانیش گوشاد و ئاسوودە دەکات و دڵ و دەروونیان سارێژ دەکات (چونکە کاتی خۆی کافرەکانی مەککە زۆر ئازار و ئەشکەنجەی ئیماندارانیان دەدا و بێ بەزەییانە هەندێکیان لێ شەهید کردن))، هەر چی ئازار و کینەش هەیە لە دڵی ئیماندارانـدا لای ببات و نەیهێڵێت، خوای گەورە تەوبە و پەشیمانی لەو کەسە وەردەگرێت کە خۆی دەیەوێت و (شایستەیە)، خوای گەورە زانا و دانایە)).

پەروەردگار داوای لە ئەهلی ئیسلام کردووە کە ڕووبەڕووی دوژمنان ببنەوە و بیریان دێنێتەوە کە لەو ڕووبەڕوو بوونەوەدا – جەنگ و بەر بەرەکانێ – شەش کەڵکو قازانج بوونی هەیە، کە بریتین لە:

١. پەروەردگار ئەو دوژمنانە سزا دەدات.

٢. ئەو دوژمنانە بچووك و ڕیسوا و کەساس دەکات.

٣. ئەهلی ئیمان سەر دەخات بەسەریاندا – بە سەر دوژمنەکاندا –.

٤. ئەوان – ئەهلی ئیمان – شادومان و کەیف خۆش و خۆشحاڵ دەکات.

٥. تووڕەیی دڵیان لەناو دەبات و چارەسەری دەکات.

٦. تۆبە و گەڕانەوەی هەرکەسێ کە ویستی لەسەر بێ و بیەوێ، قبووڵ دەکات و وەری دەگرێ.

ڕق و کینە و تووڕەیی، دڵ تووشی ئێش و ئازار دەکات و چارەسەرەکەی لە دەستەبەرکردن و هێنانەدی هۆکارەکانی ئەو تووڕەییەدا جێگیرە، ئەگەر بە ڕاستی ئامرازەکانی دەستەبەر بکرێن و وە دەست بخرێن، دەرمان و چارەسەر فەراهەم دەبێت، بەڵام ئەگەر کەسێ بە ناحەق و ناڕەوا و ستەم بیەوێ ڕق و تووڕەیی خۆی

کەم بکاتەوە و دایبەزێنێ، وەك ئەو کەسە وایە کە بیەوێ ئێش و ئازاری نەخۆشی ئەوین و حەز لێکردنەکەی خۆی لە ڕێگەی داوێن پیسی و خراپکارییەوە لە گەڵ یار و خۆشەویستەکەیدا، کەم بکاتەوە، لە کاتێکدا ئەم جۆرە کارە نەخۆشییەکەی ئەو زیاد دەکات و ئەو بە نەخۆشی گەلێکی جەستەیی و دەروونی زۆر خراپتر و مەترسیدارتر لە نەخۆشییەکانی دڵداری و حەز لێکردن تووش دەکات. خەم و خەفەت و پەژارەش بەشێکن لە نەخۆشییەکانی دڵ و تەنیا بە فەراهەم کردنی کاروبارەکانی بەرامبەریان وەك کاروبارە خۆشی ئاوەر و شادکەرەکان دەتوانرێ چارەسەریان بکرێ و دەرمان بکرێن.

ئەگەر ئەم کارە بە درووستی ئەنجام بدرێ، دڵ ڕزگاری دەبێت و بەرەو چاك بوونەوە دەڕوات و نەخۆشییەکەی چارەسەر دەکرێت، بەڵام ئەگەر بۆ چارەسەرکردنیان لە ڕێگەی نادرووست و ناحەق کەڵك وەربگیرێ، دەشاردرێنەوە و گوم دەبن، بەڵام چارەسەر ناکرێن و لەناو ناچن و لە هەمان کاتیشدا نەخۆشی گەلێکی خراپتر و مەترسیدار تری بەدواوە دەبێت. نەفامی و نەزانیش بە هەمان شێوە نەخۆشییەکی مەترسیدارە کە بە سەختی دڵی مرۆڤ ئازار دەدات. بەڵام هەندێ لە مرۆڤەکان دەیانەوێ لە ڕێگەی زانستی بێ سوود و بێ کەڵکەوە چارەسەری بکەن و وا دەزانن کە بە هۆی ئەو زانستەوە دەتوانن زاڵ ببن بەسەر نەخۆشییە نەزانی و نەفامییەکەیانداو دەستی بەسەردا بگرن، بەڵام لە ڕاستی دا بەو کارەیان نەخۆشییەکە زیاد دەکەن و پەرەی پێ دەدەن.

بەڵام دڵ بە هۆی سەرقاڵ بوونی بەو زانستە بێ کەڵك و بێ سوودەوە و بێ ئاگایی و نە شارەزاییان لە زانستی بەسوود و بە کەڵك، هەست بە نەخۆشییەکی مەترسیدار

ناکەن لە دەروونی خۆیاندا، لە کاتێکدا تەنیا ڕێگە چارەی نەخۆشی نەزانی و نەفامی بەدەست هێنانی زانست و ناسینی بەسوود و بە کەڵکە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەبارەت بەو کەسانەی کە لە ڕووی نەزانیو بێ ئاگاییەوە فەتوا دەدەن و فەتواکەیان دەبێتە هۆی مردنی پرسیار کەرەکە، دەفەرمووێت: ((**قتلوه، قتلهم الله.! ألا سألوه اذا لم يعلموا..؟ فإنما شفاء العيّ السؤال**))[٤٦].

واتە: ((ئەویان کوشت.! خوا بیانکوژێ.! کاتێ کە نازانن، بۆ پرسیار ناکەن و ناپرسن؟ تەنیا ڕێگەی بووژانەوە و دەرباز بوون لە نەخۆشی نەفامی و نەزانی پرسیار کردنە)).

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەزانی و نەفامی بە نەخۆشی لە قەڵەم داوەو چارەسەرو دەرباز بوون لەو نەخۆشییەش بە پرسیار کردن لە ئەهلی زانست باس کردووە.

هەروەها کەسێ کە لە بارەی شتێکەوە گومان و دوودڵی هەیە، تا کاتێ کە لە بارەیەوە بە زانست و دڵنیایی و دڵقایمی نەگەیشتووە، دڵ و ڕۆحی لە ئەزییەت و ئازاردان و بەهۆی ئەوەی کە ئێش و ئازار و ناڕەحەتی و گەرما و داخییەکی هەیە، هەرکاتێ زانست و دڵنیایی پێ گەیشت، وەك ئەوە وایە کە ئاوێکی ساردیان پێداکردبێ.

دڵیش بە هۆی نەزانی و تاریکی و نەفامی سەبارەت بە ڕێگەی گەشەکردن و گەورە بوونی خۆیدا تووشی ڕەنج و ناڕەحەتی دەبێت و تەنیا بە زانست و ڕێنموونی لەو ڕەنج و ئێش و ئازار و ناڕەحەتییە دەربازی دەبێت و لێی ڕزگار دەبێت.

---

٤٦ اخرجه ابو داود و ابن ماجه و الدارمي.

پەروەردگاری مەزنو بە دەسەلآت دەفەرموویّت: ﴿فَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يَهدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ وَمَنْ يُرِدْ أَنْ يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ كَذَلِكَ يَجْعَلُ اللَّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ سوورەتی ئەنعام ١٢٥.

واتە: ((جا ئەو کەسەی (خێری تێدا بێت)و خوا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە سینەی ساف و پاك و ئامادە دەكات بۆ ئاینی ئیسلام، ئەو کەسەیش خوا بیەوێت گومڕای بکات، ئەوە دڵی دەگوشێت و سنگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەبێت، هەر وەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرز بێتەوە (چۆن تووشی تەنگەنەفەسی و دڵە تەپێ دەبێت)، ئا بەو شێوەیە خوا گومڕایی و پیسی هاوەڵگەری لەسەر دڵی ئەوانە دادەنێت کە باوەڕ ناهێنن)).

لە بەشەکانی دواتردا، سەبارەت بە ئامراز و هۆکارەکانی دڵتەنگی و بێ تاقەتی و خۆ نەگرتن و ڕێگە چارەکانیان بەئومێدی پەروەردگار قسە دەکەین.

مەبەست و ئامانج ئەمەیە کە:

– هەندێ لە نەخۆشییەکانی دڵ بەهۆی دەوا و دەرمان گەلێکی سروشتی گونجاوەوە چارەسەر دەکرێن و لەناو دەبرێن.

– هەندێکی تریان تەنیا بەهۆی دەوا و دەرمان گەلێکی شەرعی و ئیمانییەوە چارەسەر دەکرێن و لەناو دەبرێن.

– دڵ گەلێکی زیندوو و ساغ و سەلامەت و دڵ گەلێکی مردوو و یاخود نەخۆش و ناساغ بوونیان هەیە.

زانیاری و بە ئاگایی و شارەزایی لەبارەی کاروباری پەیوەندیدار بە نەخۆشییە دەروونییەکانەوە بەگوێرەی پلە و پایەی گرنگیان لە نەخۆشییە جەستەیی و نەخۆشییە ڕوواڵەتی و ئاشکراکانی دڵ، زیاتر و چارەنووس سازترە.

## تەوەری دووەم: قورئان هەڵگری دەرمان و چارەسەرگەلێکی دەروونییە

### _ قورئان و چارەسەرکردنی نەخۆشیە دوودڵی و گومانـاویەکان:

پەروەردگاری مەزن و بەتوانا دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ سوورەتی یونس ٥٧.

واتە: ((ئەی خەڵکینە، بەڕاستی ئێوە ئامۆژگارییەکی گەورە و گرنگتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە (قورئانە)، شیفا و چارەسەریشە بۆ نەخۆشی دڵ و دەروونەکان و ڕێ نیشاندەر و ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران)).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ...﴾ سوورەتی ئەسرا ٨٢.

واتە: ((ئێمە لە قورئان ئایەت و سوورەتانێك دادەبەزێنین، کە ببێتە هۆی شیفا و چارەسەر بۆ نەخۆشییە دەروونی و جەستەییەکان، هەروەها ڕەحمەت و میهرەبانیش بۆ ئیمانداران)).

زیاتر ئاماژەمان بۆ ئەم بابەتە کرد کە: گومان و دوو دڵییەکان سەرچاوەی تەواوی نەخۆشییەکانی دڵن.

بەڵام قورئانی پیرۆز هەڵگری ڕێگە چارە گەلێکی زانایانەیە بۆ چارەسەرکردنی ئەو دوو نەخۆشییە – گومان و دوو دڵی –.

لە ناویدا بەڵگە و ڕێ پیشاندەری دیار و دوور لە نکوڵی و بێ بەقایی بوونیان هەیە کە حەق لە ناحەق جودا دەکاتەوە و نەخۆشییەکانی گومان و دوودڵی کە زانستو زانایی و تێگەیشتن و دەرك دەخاتە بەر هێرش و پەلاماردانەوە لەناو دەبەن و کاروبارەکانیش وەك ئەوەی کە هەن دەبینێ.

لە ژێر ئاسماندا کتێبێکی تر وەك قورئانی پیرۆز بوونی نییە کە هەڵگر و خاوەنی بەڵگە و نیشانەگەلێ بێ سەبارەت بە ئەزرش و بەها گەلێکی گەورە و مەزنی وەك: یەکخواپەرستی، سەلماندنی خەسڵەت و نیشانەکان، سەلماندنی پەیامبەری و ڕۆژی قیامەت و لابردن و بەتاڵ کردنەوەی بیر و باوەڕە خراپ و چەوتەکان و بیر و بۆچوونە هیچ و پووچەکان بێ.

قورئانی پیرۆز بە شێوەیەکی زۆر نایاب و تەواو و بە میتۆدێکی زۆر نزیك بە عەقڵ و زانایی و بەجوانترین دەربڕین تەواوی ئەو بەڵگە و نیشانانەی لەخۆیدا جێگیر کردووە و بوونیان هەیە.

## _ قورئان چارەسەرکەری ڕاستەقینە:

بەڕاستی قورئانی پیرۆز چارەسەرکەر و ساڕێژکەری نەخۆشییەکانی گومان و دوو دڵییە، بەڵام ئەم چارەسەرکردنە مەرجە و بەستراوەتەوە بە تێگەیشتن و مەبەستەکەی. پەروەردگار هەرکەس بەهرەمەند بکات لەم ناسین و ئاشنایەتی و تێگەیشتن و زاناییە، بەبینینی دڵی خۆی حەق و ناحەق وەك بینینی شەو و ڕۆژ دەبینێ و تێ دەگات و دەزانێ کە پەرتووکەکان و بیر و بۆچوونەکان و ئەندێشە و بیروڕاکانی خەڵکانی تر:ـ

– یا زانست گەلێکن کە ناتوانین متمانەیان پێ بکەین، یا لەڕاستی دا بیر و بۆچوون گەلێکن کە لاسایی کەرەوەی خەڵکانی ترن.

– وە یا کاروبار و دۆز گەلێکی ڕێك و درووستن کە دڵ بە ناسین و ئاشنایەتی لەگەڵیاندا سوود و کەڵکێکی لێ وەرناگرێ و لێی سوودمەند نابێ.

– هەروەها زانست و فەرهەنگ گەلێکن کە بۆ بەدەست هێنانیان تووشی ڕەنج و ئازارێکی زۆر بووە و لەکاتی کەم بوونەوەی قازانجەکانیاندا، سەبارەت بە سەلماندنی درووستیان بەدرێژی قسەمان کردووە، ئەو جۆرە زانستە وەك: ((گۆشتی حوشترێکی

لەڕ و لاوازە کە لە سەر شاخێکی بەرز دایان نابێ، کە ناتوانین بە ئاسانی پێی بگەین)).[47]

## _ ڕوو لێنان و سەخت و دژوار کردنی کاروبارەکان، لە لایەن قسەکەر و زاناکانەوە:

چاکترین و دروستترین بیر و بۆچوونەکانی زانایان و غەیری ئەوانیش، هەمان ئەو کێشە و گرفتانەن کە بە شێوەیەکی زۆر ورد و جوان لەقورئانی پیرۆزدا باسکراون، تەنیا شتێ کە لە هەگبەی ئەهلی قسەکەران و بێژەراندا هەیە ڕوو لێنان و درێژ کردنەوە و ئاڵۆزی و دژواری و یا بە واتایەکی تر کاری بێ هوودە و دوور و درێژ کردنەوە و درێژە دان و قورس کردنی کێشە و گرفتە سووک و ئاسانەکانە.

بە هەمان شێوە کە وتراوە:

**لولا التنافس فی الدنیا لما وضعت — کتب التناظر لا (المغني) ولا (العمد)**

**یحللون بزعم منهم عقدا — وبالذی وضعوه زاءت العقد**

واتە: ((ئەگەر بەهۆی بەربەرەکانێ و ڕکەبەرایەتی لەسەر کاروباری دونیا نەدەبوو پەرتووک و کتێبهایەکی مونازەرە کردن (مغني) و (العمد) نەدەنووسران، وا دەزانن کەوا گرێکانیان کردووەتەوە، بەڵام بەو کارەی کە کردوویانە، گرێ کوێرەکان فراوانتر و سەختی و قورسییەکانیش سەخت تر و گەورەتر بوون)).

ئەهلی کەلام وا دەزانن کە بەهۆی ئەوەی کە وتوویانە، گومان و دوو دڵییەکانیان ڕەواندووەتەوە و چارەسەریان کردوون، بەڵام ئەهلی زانست و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بەدرووستی زانیویانە کە بەو قسە تەم و مژو قورسانەی ئەوان — ئەهلی کەلام — قورسی و تە م مژاوی گومان و دوو دڵەکان زیادی کردووە.

---

٤٧ متفق علیە، البخاری (٥١٨٩) و مسلم (٢٤٤٨).

ئەستەمە کەوا چارەسەر و ڕێنموونی و زانست و دڵنیایی لە پەرتووکی پەروەردگاردا و – قورئانی پیرۆز – قسەی پێغەمبەرەکانی دا پەیدا نەبێ و نەدۆزرێتەوە، بەڵام لە پەرتووك و کتێبەکانی ئەو مرۆڤە سەرگەردان، سەر لێشێوا و کەسانی دوو دڵ و گوماناوی زۆر پەیدا دەبن و دەبینرن. خەڵکانێ کە کەسێکی ئەهلی لێکۆڵینەوە و بەداداچوون کە بە ئاکام و ئەنجامی هەنگاو هەڵگرتن و دەست بەکاربوون و نیازی ئەوانی زانیوە،[48] لەبارەیانەوە وتوویەتی:

| | |
|---|---|
| نهـايـة اقـدام العقـول عقال | واكثـر سعي العـالـمـين ضلال |
| وارواحنا من وحشة من جسومنا | وحـاصـل دنيـانـا اذى و وبال |
| ولم نستفد من بحثنـا طول عمرنا | سوى ان جمعنا فيه قيل وقالوا |

واتە: ((ئەنجام و ئاکامی هەوڵی ئەندێشەکان و بیروڕاکان بەکۆتا گەیشت و زۆربەی هەوڵ و کۆششی کۆشش کەران، گومڕا کردن و سەر لێشێواندنە، ڕووحەکانمان لە نێو جەستەکانماندا تووشی دووری و ترس بوون و دەسهات و دەسکەوتەکانی ئێمە لەدونیادا هەمووی لە ڕەنج و ئێش و ئازاردا خۆی دەبینێتەوە، لەوانە و باسەکانی خۆمان بەدرێژایی تەمەن جگە لە کۆکردنەوەی هەرا و مەزات، کەڵك و قازانجێکمان دەست نەکەوتووە و بە قسمەتمان نەبووە.

من – ئیبن قەییمی جەوزی – لە قوتابخانە کەلامی و فەلسەفییەکاندا لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی زۆرم کردووە، بەڵام شتێکم تیایاندا دەست نەکەوتووە و نەدۆزیتەوە کە دەرد و ئازارێ دەرمان و چارەسەر بکات تینوییەك تێرئاو بکات بەسەر ئاگردا و گەیشتووینەتە ئەم ئاکام و دەرئەنجامە کە کورت ترین ڕێگە بۆ گەیشتن بە حەق و ڕاستی و سەربەرزی و بەختەوەری و کامەرانی، قورئانی پیرۆزە.

[48] الامام فخرالدين الرازي.

سەبارەت بە (سەلماندن) واتە (اسبات) بخوێننەوە!

﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ سوورەتی تەها ٥.

واتە: ((خوای میهرەبان بەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی خۆیەوە وەستاوە (عەرشی ئەو لە سەرو حەوت چین ئاسمانەوەیە و لەوێوە سەرپەرشتی هەموو بەدیهێنراوەکان دەکات)).

﴿..إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ...﴾ سوورەتی فاتر ١٠.

واتە: گوفتاری چلك و جوان و بەجێ بۆ لای ئەو– خودا – بەرز دەبێتەوە.

وە لەبارەی نەهێشتن و لابردنەوە، واتە (نفی) بخوێننەوە!

﴿...لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ...﴾ شوورا ١١.

واتە: هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو– خودا –، هیچ شتێك لەو ناچێت.

﴿...وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا﴾ سوورەتی تاها ١١٠.

واتە: ناتوانن ئاگاداری زانست و زانیاری بێ سنووری ئەو– خودا –بن.

هەرکەسێ ئەم ئەزموونەی من تاقی بکاتەوە و بیئازموونێ، بەو ئەنجام و ئاکامە دەگات کە من پێی گەیشتووم – مەبەست خودی دانەرە –.

ئەو هۆنراوانە ئیمام فەخری ڕازی لە کۆتایی پەرتووکەکانی خۆیدا دەینووسی، کەسایەتییەك کە لە زانستی کەلام و فەلسەفەدا مامۆستایەکی ڕەهای سەردەمی خۆی بووە.

هاوشێوەکانی ئەو لەم جۆرە قسانەیان زۆر باسکردووە، وە ئێمە ئەو وتە و قسانەمان لە کتێبی ((الصواعق المرسله))دا هێناوە.

بیروبۆچوونی هەندێ لە شارەزایان لە بیروبۆچوونەکانی ئەهلی کەلاممان هێناوە، لەوانەش:

((آخر أمر المتكلمين، وآخر أمر المتصوفين الشطح)).

واتە: ((کورتە و دەستهات و کاری ئەهلی کەلام زیادکردنی گومان و دوو دڵیە و کۆتا دەستکەوتی کاری ئەهلی سۆفیگەری هەڵیت و پەڵیت و قسەی بەلاشە)).

بەڵام قورئانی پیرۆز سەبارەت بە بیروڕا درووستەکان، ڕەوشتی بەرز و کاروکردەوەی چاکە کە گەورەترین ئامانجی مرۆڤەکانە، مرۆڤ دەگەیەنێتە حەق و ڕاستی و دڵنیایی، وە پەروەردگار قورئانی بۆ ئەم مەبەست و ئامانجە ناردووەتە خوارەوە و کردوویەتییە چارەسەری هەموو ئەو شتانەی کە لە دڵدان و کردوویەتییە هۆکاری ڕێنموونی و بە بەزەیی و میهرەبانی ئەهلی ئیمانیش.

## _ قورئان چارەسەری نەخۆشی هەواوئارەزووەکانە:

قورئانی پیرۆز لە ڕێگەی ڕێنموونی زانایانە و ئامۆژگاری و ئامۆژیاری ژیرانە و هاندەرانە و ترسێنەرانە و هاندان بۆلابردنی ئارەزووەدونیاییەکان و وابەستە بوون بەدواڕۆژ و نموونە و داستان گەلێ کە هەڵگری پەندو ئامۆژگارین، دەست دەکات بەچارەسەرکردن و دەرمان کردنی نەخۆشییە هەوا و هەوەسییەکانی دڵ و خاوەنانی دڵە ساغ و تەندروستەکان کە بینایی و خۆیانیان دۆزیوەتەوە هان دەدات و گەرمیان دەکات کە، بۆ بەدەست هێنانی تەواوی ئەو شتانەی کە بۆ پێویستییەکانی ژیان و ڕۆژی دواییان سوودمەند و بە کەڵکن هەوڵ بدەن و تێ بکۆشن بۆیان و ئەو شتانەی کە بۆ دونیا و دواڕۆژیان زەرەر و زیانی هەیە و بێ زەرەرمەند دەبن دوورە پەرێزی بکەن و خۆیانی لێ بە دوور بگرن، تا لە کۆتاییدا دڵەکانیان ببنە لایەنگر و دۆستی گەشەکردن و بەرەو پێشەوە چوون و دوور بکەونەوە لە تاوان و گومڕایی.

قورئانی پیرۆز چارەسەرکەری نەخۆشی گەلێکە کە دەبنە هۆی نیاز پیسی و ویستی خراپ، قورئانی پیرۆز چاکسازی دڵ دەکات تاوەکو خواست و ویستی مرۆڤ درووست بکرێت و چاکسازی تێدا بکرێت و بگەڕێتەوە بۆ ئەو سروشت و فیترەتەی کە لە سەر ئەو بناغە و بنچینەیە پەیدا بووە و سەری هەڵداوە و بە هەمان شێوە کە جەستە دوای چاك بوونەوە و بووژانەوەی لە نەخۆشی، سەلامەتی و تەندروستی خۆی بەدەست دێنێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ دۆخی سروشتی و ئاسایی خۆی.

دڵ لە دۆخی تەندروستی و سەلامەتی دا جگە لـە حـەق و ڕاسـتی هـیچ شـتێکی تـر قبوڵ ناکات، هەر وەك چۆن منالێکی تازە لەدایك بوو کە لە تەمەنی مندالّی دا جگە لـە شیر هیچ شتێکی تر ناخوات.

**وعادا الفتى كالطفل، ليس بقابل سوى المحض شيئا واستراحت عواذله**

واتە: ((ئەو جوامێر و دلێرە، دووبارە وەك مندالێکی لێ دێت کە جگە لە شیری پاكو خاوێن قبووڵ کەری هیچ شتێکی تر نییـە و سـەرکۆنە کـەرانی ئـەو، ئاسـوودە و ئـارام بوون)).

دڵ ئەوەی کە دەبێتە هۆی خۆراك و گەشەکردن، پاك کردنەوە و خاوێن کردنـەوە و کەیف خۆشی و شادی و شادومانی و فەرمانڕەوایی دڵ دەچەسپێنێ، تەنیا دەتوانێ لە قورئانی پیرۆز کەڵك وەربگرێ، وەك چۆن ئەوەی کە دەبێتە هۆی گەشـەکردن و بـەهێز کردنی جەستە، لە خۆراك و خواردنەکانەوە وەری دەگرێ، دڵ و جەسـتە هـەردووکیان بۆ گەیشتن بە کەماڵی و تەواوی، چاکسازی و سەلامەتی، پێویستیان بـە گەشـەکردن و گەورەبوونە، بە هـەمان شـێوە کـە جەسـتە بـۆ گەشـەکردن و گـەورەبوون و بەدەسـت هێنانی هێز و خۆراکی گونجاو پێویستی بە پـشتگیری کـردن و ئاگـا لێبـوون هەیـە لـە بەرامبەر کارووبارە زەرەر و زیاندەرەکانەوە، جگە لە ڕێگـەی فەراهـەم کردنـی ئـەوەی کە بـۆی سـوودمەندە و دوورخـستنەوە و لابردنـی ئـەوەی کـە بـۆی خراپـە و زەرەری هەیە، گەشە ناکات و سەرناکەوێت و هیچ ڕێگەیەکیش بۆ هێنانەدی و دەستەبەرکردنی ئەم ئامانجە بوونی نییـە جگـە لـەوەی کـە دەبێـت بگەڕێنـەوە بـۆلای قورئـانی پـیرۆز. ئەگەر بێت و جگە لە قورئان شتێکی تر لەم ڕێگەیەدا بدۆزینەوە و پەیدا بکەین، جگـە لە کارووبارێکی زۆر کەم کە هیچ کاتێ ئەو ناگەیەننە تەواوی ئامانجەکەی خۆی، بـوونی نابێ و نییە.

داهات و دەغڵ ودانی کشت و کاڵیش بەم شێوەیە و بەهێنانە بەرهەم و هێنانەدی ئەو دوو بابەتەیە (بەدەست هێنانی قازانج و لابردن و دوورخستنەوەی زەرەر و زیان) کە: گەشە دەکات و تەواو دەبێت و دەکەوێتە سەرباری خۆی.

تەنیا لە ڕێگەی چاك کردن و پاك کردنەوەوەیە کە، دڵ بەژیان و بەخشش و کامەرانی و خۆش بەختی دەگات، ڕێگە چارەیەك جگە لە چوونە ناو باس و مەسەلەی ((خاوێن کردن وپاك کردنەوە))ی دڵ بوونی نییە.

## تەوەری یەکەم: پاکی دڵ و جەستە:

### _ ئایەتی: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەڵات فەرموویەتی:

﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ سوورەتی مودەسر ٤.

واتە: ((پۆشاکت (دڵ و دەروونت، ڕەفتارت، هەر هەمووی) خاوێن بکە (خوت و شوێنکەوتووانت)).

ئەگەر چی ئەم بەشە لەگەڵ بەشی پێشووتردا بێ پەیوەندی نییە و زیاتر وتمان کە: ((خاوێن کردنەوە)) واتە (تزیکە) بە بێ (پاکییەتی) واتە (الطهارة)و شیکردنەوە (تحلیل) بەبێ بەتاڵکردن و چۆڵکردن (تحلیل) گونجاو نییە، بەڵام بە شێوەیەکی سەربەخۆ ئەوە دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە و توێژینەوەوە تا وەکو زیاتر واتای پاکییەتی (الطهارة) ڕوون بکەینەوە و گرنگییەکەی بزانین، لەبەر ئەمە ئاڕاستەکردن و ڕێنموونییەکانی قورئان و سوننەت لەبارەی پاکیەتییەوە باس دەکەین و لێکی دەدەینەوە.

پەروەردگاری مەزن و بەتوانا دەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ (١) قُمْ فَأَنْذِرْ (٢) وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ سوورەتی مودەسر ١ — ٤.

واتە: ((ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە، ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، هەستە و خەڵکی بێدار بکەرەوە (ڕاستییەکان ڕوون بکەرەوە)، پەروەردگارت بە گەورە ناو ببە (الله أكبر، با درووشمت بێت، مەزنی ئەو ڕوون بکەرەوە)، واتە: پۆشاکت (دڵ و دەروونت، ڕەفتارت، هەر هەمووی) خاوێن بکە (خوت و شوێنکەوتووانت))).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ سوورەتی مائیدە ٤١.

واتە: ((ئا ئەوانە ئەو کەسانەن خوا نەیویستووە دڵیان پاك بکاتەوە (چونکە خۆیشیان مەبەستیان نەبووە) ئەوانە لە دونیادا سەرشۆڕیی و شەرمەزاریی بەشییانە، لە قیامەتیشدا سزای سەخت و گەورە چاوەڕێیانە)).

## _ مەبەست لە وشەی "ثیاب":

زۆربەی ڕاڤەکەرانی پێشین و هاوچەرخ لەم باوەڕەدان کە مەبەست لە وشەی (ثیاب) لە ئایەتی ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ دڵە و مەبەست لەپاکییەتی، چاککردنی ئەخلاق و ڕەوشت و کار و کردەوەیە.

واحدی دەڵێت: ((ڕاڤەکەرانی قورئان لەبارەی واتا و مەبەست لەو وشەیە لەم ئایەتەدا ڕاو بۆچوونی جیاوازییان هەیە))، عەتا لە ئیبن عەبباسەوە گێڕاویەتییەوە کە: واتە پاك کردنەوەی خود لە گوناح و تاوان و ئەوەی کە جاهلییەت ڕێگەی پێداوە!

ڕاوبۆچوونی قەتتادە و موجاهدیش بەم جۆرەیە، ئەوان وتوویانە: ((واتە پاك کردنەوەی نەفسی خود لەپیسی و خراپەی تاوان و گوناح)).

شعبی، ئیبراهیم، زوحاك و زوهدیش ئەم ڕاو بۆچوونەیان هەیە. لەسەر ئەم بناغە و بنەمایە مەبەست لە (ثِیاب) لێرەدا نەفسی ئادەمیزادە، وە خەڵکی عەرەب ئەم وشەیەیان بەکینایە بۆ نەفسی خۆیان بەکار دەهێنا،

عەنتەرەش دەڵێت:

**فشككت بالرمح الاصمّ ثيابه　　　ليس الكريم على القنى بمحرّم**

واتە: ((بە ڕمێکی بەرز جل و بەرگەکەیم دڕاند، بەڵام ئادەمیزادەکانی ئەهلی گەورەیی و مەزنی بێ بەهرە نین لە شەرم و حەیادا)).

حەسەنیش دەڵێت: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ واتە: ((ئەخلاق و ڕەوشتی خۆت چاك بکە.)) قورتوبیش هەر هەمان بۆچوونی هەیە.

کەواتە (ثِیَاب) بە واتای ئاکار و ڕەوشت دێت، چونکە ئاکار و ڕەوشتی مرۆڤیش بە هەمان شێوە کە جل و بەرگ جەستە و لاشەی دادەپۆشێ، باروودۆخی ئەو لە خۆ دەگرێ و داگیری دەکات.

عەوفیش لە ئیبن عەبباسەوە لەبارەی ئەم ئایەتەوە دەگێڕێتەوە کە: ((واتە ئەو جلو پۆشاکەی کە دەیپۆشی و لەبەری دەکەیت لە داهاتێکی ناپاك و حەرام ئامادە

نەکرابێت و بەدەست نەهاتبێ و هەوڵ بدە و تێبکۆشە کە لە ماڵ و سەروەتی دەست بەسەر داگیراو و ناڕەوا و نا شەرعی کەڵك وەر نەگریت و بەکاری نەهێنی!)).

لە سەعدی کوڕی جوبەیرەوە هاتووە کە: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ واتە: ((دڵ و نیاز و مەبەستی خود پاك کردنەوە)).

ابو العاص دەڵێت: (ثِیَاب) واتە: جل و بەرگ و بۆ دڵیش بەکار دێت، بۆ نموونە دەوترێت:

**((فسلی ثیابی من ثیابك تنسلی)).**

واتە: ((ئارامی و ئاسوودەیی پەیدا بکە، چونکە دڵی من لە دڵی تۆ ئاسوودەیی پەیدا دەکات)).

## _ واتای دیارو ئاشکرای ئایەتەکە:

هەندێ لە ڕاڤەکەران ئایەتەکەیان بەگوێرەی ڕووالەتەکەی، ئایەتەکەیان ڕاڤە کردووە و لێکیان داوەتەوە و وتوویانە: پەروەردگار فەرمانی کردووە بەپاك کردنەوەی جل و بەرگەکانمان لەو پیسی و ناپاکییەی کە بە بوونیان نوێژ کردن ڕەوا و ڕێگە پێدراو نییە، ئەمە وتەی ئیبن سیرین و ئیبن زەیدە.

ئەبوو إسحاق وتویەتی: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ واتە: ((جل و بەرگەکەت کورت بکەرەوە تا وەکو نەخشێ بەسەر زەوی دا و پیس نەبێت)). طاووسیش هەر وا دەڵێت.

## _ بۆچوونێکی تر:

هەندێکی تر لە ڕاڤەکەرانی قورئانی پیرۆز لەوانەش ابن عرفة دەڵێن: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ واتە: ((هاوسەرەکانی خۆتان پاك بکەنەوە چونکە ئەو وشەیە و جل و بەرگ وەك کینایە بۆ ژنان بەکاردێت)).

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەلات دەفەرموێت: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ﴾ سوورەتی بەقەرە ١٨٧.

واتە: ((لە شەوگاری ڕەمەزاندا تێکەڵ بوونتان لەگەڵ هاوسەرانتاندا حەلاڵ کراوە، ئەوان پۆشاکن بۆ ئێوە و ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان)).

## _ بۆچوونی ئێمە (ئیبن قەییمی جەوزی):

من لەو باوەڕەدام کە ئەو ئایەتە تەواوی ئەو بابەتانەی کە وتراوە ئەگەر چی بەڕوواڵەت وشەکە بەم جۆرە نەبێت، بەلاّم لە ڕێگەی سەرنج دان و پێویستییەوە لەخۆی دەگرێ. چونکە ئەوەی کە بە پاکییەتی فەرمان کراوە هەرچەندە دڵە، بەلاّم پاکییەتی و حەلاّڵی جل و بەرگ و داهات و دەستکەوتیش تەواوکەری پاکییەتی دڵن.

## _ ڕۆڵی پۆشاك و خواردن لە چییەتی و جەوهەری دڵدا:

جل و بەرگ و خواردن کە لە حەرام پەیدا بکرێ و یاخود پیس بن، باروودۆخێکی ناپەسەند بۆ دڵ بەدیی دەهێنێ.

لەبەر ئەمەیە کە پۆشین و لەبەر کردنی پێستی پڵنگ و دڕندەکانی تریش لەسەر زاری پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیە وسلم) لە چەند فەرموودەیەکی صەحیحدا بەبێ ئەوەی فەرموودەی تر هەبێ دژی ئەو فەرموودانەی، حەرام کراوە، چونکە بوار دەڕەخسێنێ و زەمینە ساز دەکات بۆ ئەوەی کە دڵی مرۆڤ خوو و سروشتی ئەو ئاژەلاّنە پەیدا بکات، چونکە پۆشین و جل وبەرگی ڕوواڵەتی بە تێپەڕ بوونی زەمەن کار دەکاتە سەر ناخ و دەروونی مرۆڤ.

هەروەها لەبەر ئەمەیە کە وا لەبەر کردن و پۆشینی جل و بەرگی ئاوریشمی و کەلك وەرگرتن و بەکارهێنانی زێڕ و زیو و ئاڵتوون بۆ پیاوان حەرام و ڕێگە پێنەدراوە، چونکە بەکارهێنانی ئەو لەلایەن پیاوانەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بە تێپەڕ بوونی زەمەن سروشتی ژنان و هەندێ جار مرۆڤ گەلی ئەهلی خراپەکار و داوێن پیس تیایاندا پەیدا ببێ و سەر هەڵبدات.

کورتەی قسەکە ئەمەیە کە: پاکی و حەلاّڵی جل و بەرگ و خواردن بەشێکە لە گەورەیی و تەواوی پاکییەتی دڵ.

ئەگەر ئەوەی کە فەرمانی پێکراوە، پاکی و حەڵاڵی جل و بەرگ بێت، لە ڕاستی دا هۆکارێکە و ئامانج شتێکی ترە، وە ئەوەی کە ئامانج و مەبەستە، ڕەچاو کردنی ڕێساو یاساکانییەتی لە ئەولەوییەتدا.

بەڵام ئەگەر ئەوەی کە فەرمانی پێکراوە پاکییەتی دڵ و خاوێنکردنەوەی نەفس بێت، بەبێ پاکی و حەڵاڵی پۆشاك و خواردن دەستەبەر نابێ و نایەتە دی، کە واتە دیار و ئاشکرایە کە قورئانی پیرۆز پێداگری لەسەر هەردووکیان دەکات.

## تەوەری دووەم: کاریگەری گوێگرتنی ناڕەوا بەسەر دڵەوە:

### _ گوێگرتن لە شتی ناڕەوا، دەبێتە هۆی لاوازکردنی حەق و ڕاستی:

پەروەردگاری مەزن دەفەرموویت: ﴿...أُولَئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ...﴾ سوورەتی مائیدە ٤١.

واتە: ((ئا ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا نەیویستووە دڵیان پاك و خاوێن بکاتەوە)).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿...سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّاعُونَ لِقَوْمٍ آخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِنْ بَعْدِ مَوَاضِعِهِ...﴾ سوورەتی مائیدە ٤١.

واتە: ((گوێ بۆ درۆ هەڵدەخەن و کاری پێ دەکەن، گوێ بۆ کەسانێکی تری جاسووس و خوانەناس دەگرن کە: هێشتا نەهاتوونەتە لای تۆ وەك جوولەکەکانی خەیبەر و فەدەك، لەباتی ئەوە کە گوێ بۆ تۆ بگرن، کەچی گوێیان بۆ خەڵکی تر دەگرت و بە بڕیاری ئەوان ڕەفتاریان دەکرد و قسەی تۆیشیان دەبردە لای ئەوان، وشە و بڕیارەکانی خوا لەجێگەی خۆیدا دەگۆڕن، ئەوە بوو بەردەبارانی زیناکارانیان بە قامچی لێدان گۆڕی!)).

ئەم بابەتە ڕوونکەرەوەی ئەم حەقیقەت و ڕاستییەیە کە، بە هەر ئەندازەیەك کە مرۆڤ گوێ لە قسەی بێ ماناو ناڕەوا بگرێت و خوویان پێوە بگرێت و یاخود قبووڵیان بکات، بە هەمان ئەندازە حەق لە جێگە و شوێنی خۆیدا لا دەدات و لەناوی دەبات.

چونکه کاتێك کە ناحەق قبوولّ بکات و پێی ڕازی بێت، هەرکاتێ حەقێ کە لەبەرامبەریدا جێگیرە و تەرح بکرێت، قبووڵی ناکات و لە ئاست ئەو ناحەقییەی کە قبووڵی کردووە لای دەدات و دەیگۆڕێ. (واتە مرۆڤ بە هەر ئەندازەیەك هەنگاو بەرەو شتی ناڕەوا و ناحەق هەڵ بنێ و بەرە و پیرییەوە بڕوات و ئەنجامی بدات، بە هەمان ئەندازە لە چاکە و کاری باشەی خۆی کەم دەکاتەوە و دەبێتە لەمپەر و ڕێگر لە بەردەم ئەوەیدا کە بە ئاسانی نەتوانێ کاروکردەوەی چاکە ئەنجام بدات و هەنگاوی بۆ هەڵبگرێ، (وەرگێڕی کورد).

درووست هەمان میتۆد کە "جهمیە" سەبارەت بە ئایەت و فەرموودەکانی پەیوەست بە سیفاتی پەروەردگارەوە کاریان کردووە. ئەوان ئەو ئایەت و فەرموودانەیان بەشێوەیەکی تەواو نا سازگار و نەگونجاو لەگەڵ ڕاستییەکانیاندا لێك داوەتەوە و ڕاڤەیان کردوون، چونکە فەرموودەی پەیوەندیدار بەسیفەتەکانی پەروەردگارەوە فەرموودە گەلێکی تاکن و لەبواری ناسینی پەروەردگار و ناو و سیفەتەکانی خودا، بە هۆکار گەلێکی پایەدار و شایەنی متمانە لە قەڵەم نادرێن.

ئەوانە و هاوڕێکانیشیان لەو کەسانەن کە پەروەردگار ویست و ئیرادەی لەسەر نەبووە کە دڵیان پاك و خاوێن بێتەوە، چونکە ئەگەر دڵیان پاك ببوایەتەوە، ناحەق و ناڕەوایان نەدەخستە جێگە و شوێنی وتەی پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی و لەبری ئەو دایان نەدەنا.

بە هەمان شێوەی ئەو گومڕاگەلانەی کە ڕێنمووني نەکراون، دوای ئەوەی کە دڵیان پاك و خاوێن نەبووەتەوە.گوێگرتن لە شەیتانیان بە باشتر زانیوە لە گوێگرتن لە قورئانی پیرۆز!.

عوسمانی کوڕی عەففان (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ((ئەگەر دڵەکانمان پاك بوونایە هیچ کاتێ لە ناسینی کەلامی پەروەردگار تێر نەدەبوون)).

دڵی پاك – بە هۆی چاكی ژیان و ڕووناكی و ڕۆشنایی ئەو و ڕزگار بوونی لە پیسیو ناپاكییەكان – لە بیستنی كەلامی پەروەردگار تێر نابێت و تەنیا بەهۆی حەقیقەت و ڕاستییەكانییەوە تێر دەخوات و بەدەوا و دەرمانی ئایەتەكانی چارەسەر دەكرێ.

بەڵام دڵێ كە پەروەردگار – بەهۆی هەڵس و كەوت و ڕەوشتی خاوەنەكەیەوە پاكی نەكردووەتەوە – لەخواردن گەلێكی هاوتەراز لە گەڵ ناپاكییەكەی خۆیدا خۆراك دەخوات، چونكە دڵی پیس و ناپاك وەكو جەستەی نەخۆش وایە و خواردنهایەكی هاوتەراز لەگەڵ جەستەی مرۆڤە سالم و تەندروستەكاندا، بۆ نەخۆشەكان وەك یەك نییە و هاو تەراز نییە.

ئەو ئایەتە ڕوونكەرەوەی ئەم ڕاستییەیە كە (پاك كردنەوە و خاوێن كردنەوە)ی دڵ بەستراوە و پەیوەستە، بە ویست و ئیرادەی پەروەردگار (نەریت و یاساكانی ئەوەوە)، لەوێدا كە نەیویستووە دڵی شوێنكەوتووانی ناحەق و ناڕەوا پاك بكاتەوە، ئەو پاكییەتەیان بۆ دەستەبەر نەكراوە و نەهاتووەتە دی.

لێرەدا لێكدانەوە و شیكردنەوەی ویست و ئیرادە بە ویستی هەمیشەیی، لێكدانەوەیەكی درووست نییە، چونكە پەروەردگار لەپاكی و خاوێنكردنەوەی لە ڕێگەی فەرمان كردن پێی و خۆش ویستنی – بۆ ئەوانی ئیرادە فەرمووە و ئەوانی ناچار نەكردووە بەوەی كەوا پشتی تێ بكەن و ڕووی لێ هەڵچەرخێنن، بەڵكو داوای لێ كردوون و بەوە فەرمانی پێ كردوون، بەڵام ئەوان خۆیان بە هۆی بیروباوەڕ و هەڵس و كەوت و ئامانج و مەبەستە خراپ و لارەكانی خۆیانەوە، بەربەست گەلێكیان لە نێوان خود و پاك كردنەوەی دڵ و نەفسی خۆیان درووست كرد و هێنایانە دی. وە ویست و ئیرادەی پەروەردگار لە ڕێگەی سوننەت و یاسا و نەریتە بڕیار دراو و نەگۆڕەكانی خۆیەوە بووە و ئێمە لە پەرتووكی "شفاء العلیل"دا بەدوور و درێژی باسمان لێ كردووە و لەسەر دواوین.

## _ ڕێگە نادەن خراپەكاران بچنە بەهەشتەوە!:

ئەو ئایەتـەی کـە پێشتر هێنـرا، ڕوونکـەرەوەی ئـەم ڕاسـتییەیە کـە هەرکەسـێ پـەروەردگار دڵـی پـاك نەكاتـەوە، هـیچ ڕێگـەی جگـە لەڕوویـەڕوو بوونـەوەی لـە گـەڵ هـەژاریو كەساسـی دونیـا و سـزا و جەزرەبـەی دواڕۆژ لـە بەردەمیـدا نییـە و ئەمـە شوێنەماو نیشانەی سروشتی پیس بوون و دڵڕەشی و ناپاکی دڵییەتی.

لەبەر ئەم هۆیەیە كە پەروەردگاری مەزن و بەدەسـەڵات ڕۆیشتن بـەرەو بەهەشتی بەسەر ئەو كەسانەی كـە خـاوەنی دڵێكـی پـیس و ڕەش هەڵگـەڕاوە حـەرام كـردووە و تـەنیا دوای پاڵفتـەكردن و خـاوێن كردنەوەوەیـەتی، كـە ڕێگـە دەدرێ بـچێتە نێـو بەهەشـتەوە. (واتـە تـا دڵـی خـۆی پاڵفتـە نـەكات و لـە گونـاح و خراپـەكاری پـاكی نەكاتـەوەو هـەوڵ نـەدات كـاری چـاكە و چـاكەكاری ئـەنجام بـدات و پـشت بـەڕەحم و بەزەیی خوا نەبەستێ ناچێتە نێـو بەهەشـتەوە. (وەرگێـڕی كـورد). چـونكە بەهەشـت جێگە و شوێنی چاكەكاران و پاكان و پارێزكارانە، بۆیـە بـە بەهەشـتییەكان دەوترێـت: ﴿...طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾ سوورەتی زومەر ٧٣.

واتـە: ((فـەرموون بـچنە نـاو بەهەشـتەوە، هـاوڕێ لـە گـەڵ ژیـانی هەمیـشەیی و نەبڕاوەدا)).

وە تـەنیا ئـەوانن — چـاكەكاران و پارێزكـاران — كـە لـە كـاتی مردنیانـدا مزگێنیـان دەدرێتێ. بە هەمان شێوە كـە پـەروەردگاری گـەورە و بـەتوانا دەفـەرمووێت: ﴿الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ سـوورەتی نەحل ٣٢.

واتە: ((ئەوانەی كە لە سەرە مەرگدا فریشتەكان دێـن بـۆ لایـان لـە كاتێكدا گیـانی پاكو پیرۆزیان دەكێشن (كە دوورە لـە بـێ بـاوەڕی)و پێیـان دەڵـێن: سـڵاوتان لێ بێـت (ئـیتر ڕزگارتـان بـوو ئـیتر ناخۆشـی نـەما) دە بـچنە بەهەشـتەوە، بـەهۆی ئـەو كاروكردەوانەوە كە كاتی خۆی دەتان كرد)).

خراپەکاران و ناپاکان و ئەوانەی کە پیسایەتی لە دڵیاندا هەیە ڕێگەیان پێ نادەن بچنە بەهەشتەوە، هەرکەسێ لەم دونیایەدا خۆی پاك بکاتەوە و بەدڵپاکی و پاکییەتی دڵ بچێتەوە خزمەتی خوا، هیچ جۆرە ڕێگر و لەمپەرێك بوونی نابێ لە سەر ڕێگەی ڕۆیشتنی بۆ بەهەشت.

ئەگەر کەسێ لەم دونیایەدا پاك نەبێتەوە و پیسی و ناپاکی ئەو قووڵ بێت، وەك بێ باوەڕەکان هیچ کاتێ ناچێتە نێو بەهەشتەوە.

بەڵام ئەگەر ئالوودەبوون و پیس بوونی دڵ ڕووکەشی بێت، دوای پاك بوونەوەی لەو ناپاکییە، دەچێتە بەهەشتەوە و دوای ئەوەش قەد لەو بەهەشتەدا دەرناکرێ و ناکرێتە دەرەوە و بۆ هەتا هەتایی دەمێنێتەوە. تەنانەت ئەهلی ئیمانیش دوای تێپەڕ بوونیان بەسەر ڕێگای (سرات)دا، لەخاڵێکدا لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا ڕادەگیرێن و دەوەستێنرێن و لەو پیسانەی کە لێیان ماوە و بووەتە ڕێگر لە بەردەم چوونە ژوورەوەی ڕاستەوخۆیان بۆ نێو بەهەشت و هۆکار نەبوون بۆ چوونیان بۆ ناو جەهەننەم پاك دەکرێنەوە و دوای پاك کردنەوە و خاوێن کردنەوەیان ڕێگەیان دەدرێتێ کەوا بچنە نێو بەهەشتەوە.

## _ دوو جۆر پاکی:

پەروەردگاری مەزن لەسەر بنچینەی لێزانین و حیکمەتی خۆی گەیشتن بەخزمەتی خۆی مەرجدار و پەیوەست کردووە بە پاکی و خاوێن کردنەوە، نوێژکەر تەنیا دوای پاکی و خاوێن بوونەوەی لە (ڕووداوی گەورە و بچووك)ـە کە لە دەرگا و دەروازەی خوداوەندا دەوەستێ و نوێژ بەجێ دەهێنێ، بەم شێوەیە ڕۆیشتن بۆ بەهەشت و دیدارو چاوپێکەوتن لەگەڵ پەروەردگاری بە بەزەیی و میهرەباندا پەیوەندیدارە بە ساغی و سەلامەتی دڵ و پاکی نەفسەوە، پەروەردگار تەنیا ڕێگە بە مرۆڤە پاکەکان دەدات کەوا بچنە نێو بەهەشتەوە.

کەواتە دوو جۆر پاکییەتی بوونیان هەیە:

١. پاک و خاوێنی جەستە و جل و بەرگ.

٢. پاکی و سەلامەتی دڵ و نەفس.

لەبەر ئەمەیە کەوا دەست نوێژ هەڵگر دوای دەست نوێژەکەی دەڵێت: ((**أشهد أن لا اله الا الله وأشهد ان محمداً عبده و رسوله، اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين**)).[٤٩]

واتە: ((شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێ نییە بە حەق جگە لە (الله)، وەشایەتیش دەدەم کە موحەممەد بەندە و نێردراوی خوایە. پەروەردگار داوات لێ ئەکەم بمگێڕی لە تەوبەکاران و بمگێڕی لە خۆ پاک کەرەوەکان)).

چونکە پاکییەتی دڵ، بەهۆی تەوبەکردنەوەوەیە.

وە پاکییەتی جەستە بەهۆی ئاوەوە، دەستەبەر دەبێ و ئەنجام دەدرێ.

هەرکاتێ ئەو دوو پاک بوونەوەیە بۆ کەسێ فەراهەم بوو دەسەڵاتی گەیشتن بە خزمەت و دیداری پەروەردگار و ڕاوەستان و ستایش کردن لە خزمەتیدا پەیدا دەکات.

## _ واتای نزای ((اللهم طهرني...))!

لەبارەی ئەم نزای پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی: ((**اللهم طهرني من خطيای بالماء والثلج والبرد**)).[٥٠]

واتە: ((پەروەردگارا! بەهۆی ئاو و بەفر و تەرزەوە، گوناح و تاوانەکانم پاک بکەرەوە)).

پرسیارم لە شێخی ئیسلام (ئیبن تەیمییە) کرد کە تاوانەکانی مرۆڤ چۆن بەم شتانە پاک دەبنەوە؟! تایبەت کردنی پاک کردنەوە بەو کاروبارانەوە چ سوودێکی هەیە؟ لە

---

٤٩ اخرجه مسلم وغيره.

٥٠ متفق عليه.

كاتێكدا ئاوی گەرم لە ئاوی سارد چاكتر دەتوانێ پیسی و ناپاكییەكان پاك بكاتەوە و لایان ببات؟!

فەرمووی: هەڵە و تاوانەكان دەبنە هۆی پەیدا كردنی گەرما، ناپاكی و لاوازی لە دڵدا، بۆیە سست و لاواز و سڕ و بێ هێز دەبێت، ئاگری هەوا و هەوەس و ئارەزووی تێدا بڵێسە دەسێنێ و ڕەش و پیسی دەكات، بەڵام هەڵە و تاوانەكانیش وەك چیلكە و داری ئەو ئاگرەن و گڕ و بڵێسەكەی زیاتر دەكەن.

لەبەر ئەمەیە كە بە ئەندازەی هەڵە و تاوانەكان زیاتر بن، وەك ئەوە وایە كەوا چیلكە و داری زیاتر بخرێتە سەر ئاگری هەوا و هەوەسەوە، بەڵام ئاو ئاگر خامۆش دەكات و ناپاكی و پیسییەكانیش پاك دەكاتەوە وەك چۆن كە ئاوەكە ساردتر بێ، باشتر و زووتر خامۆشی دەكات و دەیكوژێنێتەوە و جەستەش بەهێزتر دەكات و بەو ئەندازەیە ساردتر بێ، وەك: بەفر و تەرزە چاكتر و باشتر دڵی گڕگرتوو و بڵێسە سەندوو دەگێڕێتەوە بۆ بارودۆخی ئاسایی و سروشتی خۆی و جەستە بەهێزتر دەكات و نیشانە و شوێنەما و كاریگەرییەكانی هەڵەكانیش لەناو دەبات و لای دەبات.

ئەمە مەبەستی قسە و گوتەكانی ئیبن تەیمییە بوو كە پێویستیان بە ڕوونكردنەوە و خستنە ڕووی زیاتر هەیە.

دەبێ بزانرێ كە لێرەدا چوار بابەت بوونی هەیە:

– دوو بابەتیان ڕواڵەتی و دیار و هەستپێكراون.

– دوو بابەتەكەی تریش جەوهەری و(مەعنەوی) نادیارن.

پیسی و ئاو كە پاك كەرەوەیەتی هەردووكیان دیار و هەست پێكراون، هەڵە و تاوانەكان و نیشانە و شوێنەماكانیان كە بەهۆی تەوبە و پەشیمان بوونەوەوە پاك دەبنەوە، هەردووكیان جەوهەری و نادیار و هەست پێ نەكراون و چاكسازی و پاراستنی سەلامەتی و دابین كردنی بەختەوەری و خۆشبەختی دڵ پێویستی بە هەردووكیان هەیە و بە هەردووكیان نیازمەندە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) لە هەردوو جۆرەکەیان بەشێکی باس کردووە کە دەرخەر و نیشاندەری بەشەکەی ترە و ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) هەر چواریانی بە کورت ترین شێوە و جوانی دەربڕین و باسکردن لە خۆگرتووە.

بە هەمان شێوە کە لە نزا و پاڕانەوەی دوای دەست نوێژ گرتن دەفەرموێت: ((**اللهم اجعلنی من التوابین واجعلنی من المتطهرین**)) کە هەر چوار جۆرەکەی لە خۆ گرتووە.

ئەمە نموونە و وێنەیەکە لە، کەماڵی پاراوی و ڕەوانی و حەقیقەت و ڕاستییەتی ئەو کاروبارە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) هەواڵی پێداوین و ئاگایی کردووینەتەوە و فەرمانی فەرمووە و بابەتێکی جەوهەری لە ڕێگەی بە نموونە هێناوە بە بابەتێکی دیار و هەست پێکراو و ماددی، ڕوونی کردووەتەوە و خستوویەتییە ڕوو.

ئەم جۆرە بابەتانە لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا زۆرن، وەك چۆن بە ئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ((**سل الله الهدی والسداد، واذکر بالهدی هدایتك الطریق وبالسداد سداد السهم**)).[51]

واتە: ((ڕێنموونی و چاکسازی لە پەروەردگار داوا بکە و! بەهۆی هەنگاو هەڵگرتن لە ڕێگەی درووستدا،ڕێنموونی و هیدایەت وەك چۆن تیرێ دەهاوێژرێ بۆ ئامانج و نیشانەی و بە جوانی دەیپێکێ،وەبیری خۆتی بهێنەوە)).

ئەمە یەکێ لە گەورەترین و نایاب ترین فەرموودە فێرکاری و پەروەردەییەکانی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیە وسلم). چونکە بە ئیمامی عەلی فەرمووە کەوا هەرکاتێ لەلایەن پەروەردگارەوە ڕێنموونی کردن بۆ ڕێگەیەك کە بە بەهەشت و

---

۵۱ اخرجه مسلم ژمارە (۲۷۲۵).

ڕەزامەندی خوداوەند كۆتایی پێ دێت، داوای كرد، خۆی وەك ڕێبوارێك كە ڕێگەی لێ ون بووە و نازانێ بەرەو كوێ بڕوات و لە ناكاو كەسێكی لێهاتوو و شارەزا بە ڕێگە، پەیدا ببێ و ڕێگەی ڕاستی پێ نیشان بدات، ڕێگەی ڕێنموونی، بەختەوەری و بەهەشتیش بەم شێوەیەیە و دەتوانین ڕێگەی دیار و هەست پێكراوی بەنموونە بۆ بهێنینەوە.

نیەت و نیازی مرۆڤێ كە دەیەوێ ڕێگەی ڕۆیشتن بەرەو پەروەردگار بگرێتە بەر، بە ڕێنموونی و ڕێ نیشاندەری ئەو لە ڕووی پلە و پایەوە لە نییەت و نیازی ڕێبوارێ كە دەیەوێ سەفەر بۆ شار و ئاوەدانییەك بكات و لە سەفەردا ڕێگەكەی لێ ون بووە و لێی بزر بووە، بە ڕێنموونی كەر و ڕێ پیشاندەرێ كە ڕێگەی گەیشتن بەو شار و ئاوەدانییەی پێ نیشان بدات، لە ڕووی پلە و پایەوە گرنگتر و زیاترە.

((سداد)) یش كە بە واتای كاروكردەوە و قسەی درووست و چاكە، وەك ئەوە وایە كە كەسێ بیەوێ تیرێ بەرەو ئامانجێ بهاوێژێ، ئەگەر تیرەكە بدات لەو ئامانجەی كە ئەو گرتوویەتییە پێش چاو و لەلای ئەو مەبەستە، شێوازی درووستی ڕێگەی بۆ پێكانی نیشانەكە گرتووەتەبەر و تیرەكەی لە ئامانجەكەی داوە و ئامانجەكەی پێكاوە و كەسێكیش كە لە كاروكردەوە و قسەكانی خۆیدا حەق و چاكەی لەپێش چاو گرتووە، وەك ئەو كەسە وایە كە تیرەكەی بەر ئامانجەكە كەوتبێ و ئامانجەكەی پێكابێت.

لە قورئانی پیرۆزیشدا لە زۆرێك لە بوارەكاندا هەردووكیان لەپاڵ یەكتردا جێگیرن، بۆ نموونە پەروەردگاری مەزن و بەدەسەڵات دەفەرمووێت: ﴿...وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى...﴾ سوورەتی بەقەرە ١٩٧.

واتە: ((بەردەوام هەوڵ بدەن كە زەخیرە و توێشوو بخەن، بێگومان چاكترین زەخیرەش تەقوا و پارێزكارییە)).

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگاری مەزن (جلّ جلاله) فەرمانی بە حاجیان کردووە کە توێشوو و کوڵی خۆیان فەراهەم بکەن و بەبێ توێشوو بار و کوڵی سەفەر نەپێچنەوە و دوا بەدوای ئەوەش بیری ئەوانی خستووەتەوە و وەبیریانی هێناوەتەوە بەوەی کەوا، فەراهەم کردن و ئامادەکردنی توێشووی سەفەری دواڕۆژ کە (تەقوا)و لە خواترسان و پارێزگاریکردنە، شتێکی گرنگ و پێویستە.

بە هەمان شێوە کەوا لەم دونیایەش دا ڕێبوار و موسافیر بەبێ توێشوو بە ئامانج و مەرازی خۆی ناگات، ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ بەدونیای دوای مردن و گەیشتن بەدیداری پەروەردگار و بەدەست هێنانی بەختەوەری و کامەرانی هەتا هەتایی و هەمیشەیی بگەن، بەبێ توێشووی تەقوا و لەخواترسان بەم ئامانجەی خۆیان ناگەن، دەبینین کە پەروەردگار (جلّ جلاله) هەردووکیانی لەپاڵ یەکتردا جێگیر کردووە و دایناون.

هەروەها پەروەردگاری گەورە و مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ سوورەتی ئەعراف ٢٦.

واتە: ((ئەی نەوەی ئادەم، ئێمە بەڕاستی پۆشاکی لەبارمان بۆ فەراهەم هێناون، عەورەت و ئەوەی پێتان ناخۆشە دەربکەوێت دای ئەپۆشیت،هەروەها جل و بەرگی جوانیش کە خۆتانی پێ برازێننەوە (بەلأم بیرتان نەچێت) کە پۆشاکی تەقوا و خواناسی چاکترو خێردارتر و بەفەڕترە،ئەو پۆشاکە (ماددی و مەعنەویانە) لە نیشانەو بەڵگەکانی خوای گەورەن بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن و (یادی بەهەشت بکەن))).

پەروەردگاری مەزن هەردوو جوانی و خۆ ڕازاندنەوە، واتە ڕازاندنەوەی جەستە بە هۆی جل و بەرگ و جوانکردنی دڵ بە هۆی (تەقوا)، واتە جوانی ناوەوە و دەرەوەی پێکەوەی باس کردووە و خستوونیەتییە ڕوو.

هەروەها پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿...فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى﴾ سوورەتی تاها ١٢٣.

واتە: ((ئەوە شوێنی بەرنامەکەم بکەوێت، نە گومڕا دەبێت، نە ناخۆشی و ناڕەحەتی و ناسۆر دێتە ڕێی)).

پەروەردگار، گومڕایی کە دەبێتە هۆی سزای دڵ و ڕۆح، بەدبەختی و چارەڕەشیی کە دەبێتە هۆی سزا و جەزرەبەی ڕۆح و جەستە، لەوانەی کە پەیڕەوی لە ڕێنموونی ئەو دەکەن، ڕەدی کردووەتەوە، لە ڕاستی دا ئەوان لە بەخششەکانی دڵ، جەستە و ڕۆح، بەهۆی ڕێنموونی و ڕزگار و دەرباز بوونەوە، بەهرەمەند دەبن.

یەکێکی تر لەو بابەتانە قسە و گوتەی هاوسەری عەزیزی میسر لەبارەی حەزرەتی یوسف (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە وەڵامی لۆمە و توانج و سەرکۆنەی ژنانی تردا بەهۆی خۆشەویستی و ئەوینبازی ئەو – هاوسەری عەزیزی میسر – بۆ پێغەمبەر یوسفە.

﴿فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمۡتُنَّنِى فِيهِ﴾ سوورەتی یوسف

واتە: ((ئەی خانمەکان! ئەمە هەمان ئەو کەسەیە کە بەهۆیەوە منتان سەرزەنشت دەکرد و لۆمەتان دەکردم)).

پەروەردگار جوانی حەزرەتی یوسفی پێ نیشان دان و دواتر وتی: ﴿وَلَقَدۡ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ فَٱسۡتَعۡصَمَ﴾ سوورەتی یوسف

واتە: " (ژنی عەزیزی میسر) دوودڵی دەخستە دڵی خۆیەوە کە گوایا لە گەڵ یوسفدا پەیوەندی درووست بکات،بەڵام حەزرەتی یوسف ڕێگەیەکی پاك و خاوێنی گرتەبەر".

لەبەر ئەمە پاك داوێنی پێغەمبەر یوسفیش_ واتە پاکی و جوانی ناخ و دەروونی_ وە بیری ئەوان خراوەتەوە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەم نزا و پاڕانەوەیەی کە فـەرمووی: ((**اللهم طهرني من خطاياي بالماء والثلج والبرد**)).

ئەهلی ئیمانی ئاگادار کردووەتەوە و بیر خستوونەتەوە، بەپێویستی و نیازی توندی جەستە و دڵ بەوەی کـە ئـەو دووانـە – دڵ و جەسـتە – پـاك و بـەهێزی و ڕووناکی و ڕۆشـنی و بینـایی دەبەخـشێ، لـەم نزایـەی پێغەمبـەردا هـەم ئەمـە و هـەمیش ئـەو هاتووە.شتێ کە لـەم بابەتـەوە نزیکـە، ئەمەیـە کـە پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله عليـە وسلم) لەکاتی هاتنە دەرەوەی لە ئەدەبخانە دەیفەرموو: ((**غفرانك**)).[٥٢]

واتە: ((پەروەردگارا! سووکی و ئاسانی کار و لێبوردن، لە تۆ داوا دەکەم)).

لەم کەلام و فەرموودەی پێغەمبەرەدا ڕازێك شاراوەیە و ڕوواڵەتی ئەو ڕاز و نهێنییە ئەمەیە کە پاشماوە و پیسییەکان جەستە قورس دەکەن و ئازاری دەدەن.

تاوان و گوناحەکانیش لە سەر دڵ قورسـایی درووسـت دەکـەن و بـە کۆبوونـەوەیان ئـازاری دڵ دەدەن و ناڕەحـەتی ئەکـەن. کـە واتـە پاشماوەکـانی جەسـتە و تـاوان و گوناحەکان یەکێکیان بەسەر جەستەوە و ئەوی تریشیان بەسەر دڵـەوە کاریگەرییـەکی خراپی هەیە و بۆ ئەو زەرەرمەند و خراپن.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوای هاتنە دەرەوەی لە ئەدەبخانە (WC) و بـەهۆی ڕزگـار بـوونی لـەوەی کـە جەسـتە ئـازار دەدات و سـووك بـوون و ڕاحـەتی و ئاسوودە بوونی جەستەی، سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کـردووە، هـەروەها داوای لێ کردووە کە ڕزگاری بکات لەو ئازاردەرەی تر و دڵی ئاسوودە و سووك بکات.

نهێنی و ڕازەکانی فەرموودە و نزا و پاڕانەوەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسـلم) بەرزتر و گەورەترە لە تەواوی ئەو شتانەی کە بە بیری ئێمەدا دێن.

---

٥٢ أخرجه أبو داود.

## تەوەری سێیەم: ڕۆڵی خراپی گوناح و تاوان، بەسەر دڵەوە

### _ پیسی و ناپاكی هاوەڵ بڕیاردان، زیناو نێربازی:

پەروەردگار ((هاوەڵ بڕیاردان، زینا و نێربازی)) وەك كاروكردەوە و هەڵس و كەوتێكی خراپ و پیس و _ بە پێچەوانەی تاوان و گوناحی تر ئەگەر چی ئەم كاروبارانەش لە خۆ دەگرێ _ ناوزەد كردووەو ناوی هێناون.

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەلات لەبارەی هاوەڵ بڕیاردانانەوە((شرك)) دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ...﴾ سوورەتی تەوبە ٢٨.

واتە: ((ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە چاك بزانن كە موشریك و هاوەڵگەران ناپوخت و پیسن!)).

وە سەبارەت بە كاری نێربازیش((لواط)) لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: ﴿وَلُوطًا آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ تَعْمَلُ الْخَبَائِثَ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمَ سَوْءٍ فَاسِقِينَ﴾ سوورەتی ئەنبیا ٧٤.

واتە: ((بە (لوط) پێغەمبەریش حیكمەت و دانایی و زانیاریمان بەخشی و ڕزگارمان كرد لەو شارەی كردەوە پیسەكانیان تێدا ئەنجام دەدا، بێگومان ئەوانە قەومێكی نا لەبار و خراپ و بەدخوو تاوانكار بوون)).

مرۆڤەكانی ئەهلی نێربازی قەومی لووتیش دەیانوت: ﴿....أَخْرِجُوا آلَ لُوطٍ مِنْ قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ سوورەتی نەمل ٥٦.

واتە: ((قەومەكەی لوط وتیان (لوط) شوێنكەوتووانی لوط لەشارەكەتاندا دەربكەن، چونكە بە ڕاستی ئەوانە كەسانێكن خۆیان بە پاك ڕادەگرن!)).

ئەوانە وێڕای جێگیر بوونیان لە شرك و هاوەڵ بڕیار دان و بێ باوەڕیدا، بە نقوم بوونی خۆیان لەنێو زەلكاوی خراپە و پیسی و پاكی و پارێزگاری حەزرەتی (لوط)و دار و دەستەكانی ئەو دانیان دەنا بەو كارە خراپ و نزم و پیسەدا.

پــەروەردگاری مــەزن و بــەتوانا ســەبارەت بــەکاری زینــاکردنیش دەفــەرمووێت: ﴿الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ....﴾ سوورەتی نوور ٢٦.

واتە: ((ژنانی ناپاك بۆ پیاوانی ناپاك و پیاوانی نا پوخت بۆ ژنانی نا پوخت)).

## _ هاوەڵ بۆ خوا دانان دوو جۆرە خراپە و پیسی هەیە:

١. پلە و پایەی سەخت، یاخود شرکی گەورە.

٢. پلە و پایەی سووك، یاخود شرکی بچووك.

شرکی گـەورە خـراپترین هـاوەڵ دانانـە بـۆ پـەروەردگار کـە خوداوەنـد ئـەو ئەهلـە نابەخشێ، چونکە پەروەردگار هاوەڵ دانانی کەسێ یاخود شتێ لەو کار و سـیفەتانەی کە تایبەتن بەخۆیەوە، لە موشریك و هاوەڵ بڕیار دەر خۆش نابێت و لێی نابوورێت.

شرکی بـچووك و بـچووکتر، وەك: ڕووبـازی کـەم (ڕیـایی)، ڕوواڵـەت چـاك کـردن بـۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵکانی تر و سوێند خواردن و هیوا و ترسی خێـرا و مـاوە کـورت لە غەیری پەروەردگار. (واتە سوێند خـواردن و ئومێـد بـوون بـە کەسـێ و تـرس لێـی، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت،بە شرك دادەنرێ. وەرگێڕی کورد).

خراپی و پیسی هاوەڵ دانان بۆ خوا ئاشکرا و دیارە، لەبەر ئەمەیە کە پـەروەردگار شرکی بە پیس _بە سەرەی جیم_ هێناوە و وشـەی پـیس (نجس) _بـەژێرەی (جـیم) _بەکار نەهێناوە بۆی.

چـونکە ((نجـس)) _ بـە سـەرەی جـیم_ بـۆ شـتی دیـار و ئاشـکرا و چـییەتی و جەوهەری و ((نجس)) _ بە ژێرەی (جیم) _ بۆ ئەو شتە بەکاردێ کە بـەهۆی شـتێکی ترەوە پیس بووە.

بۆ نموونە جل و بەرگێ کە بەهۆی پاشمـاوە و مـەی و شـەرابەوە پـیس بێـت، پێـی دەڵێن (نجس) _ بە ژێرەی (جـیم) _، بـەڵام خـودی پاشمـاوە یـاخود مـەی و شـەراب (نجس)ن_ بە سەرەی جیم _. بـە هـەمان شێوە کـە خـراپترین گونـاح و تـاوان زۆر و ستەمە، خراپترین پیسیش هاوەڵ بۆ خودا دانان و شرکە.

لە ڕووی زمانەوانی و شەریعەتەوە پیسی، خراپی و پیسێکی بەو جۆرەیە کە دەبێ لێی دوور بکەوینەوە و خۆمانی لێ بپارێزین و لە هەست کردن و بۆن کردن و بینینی ئەو دوورە پەرێزی بکەین، بەڵام لە پیس بوونی جەستە و جل وبەرگ بەهۆیەوە بەشێوەی یەکەم دەبێت دوورەپەرێزی و دووریی بگرین.بە گشتی پیسی، شتێکە کە سروشت و فیترەتە پاکەکان نەفرەتی لێ دەکەن و بەو ئەندازەی کە سروشتی مرۆڤ سالم و تەندروست بێ و لە ژیانێکی پاکی ماددیی و مەعنەوی بەهرەمەند بێ، دوورەپەرێزی و نەفرەت کردن لە پیسی و خراپە زیاتر دەبێت.

بەو ئەندازەی کە ناخیان (زات) پیس بێت، دڵ یا جەستە یاخود هەردووکیان پیس دەکات. هەندێ جار بە هۆی بۆن کردنەوە و هەندێ جار لە ڕێگەی بەرکەوتنی ئەو ئەگەر خاوەنی بۆن و بەرامەیەکی پیس نەبێ، دەبێتە هۆی ئەزییەت و ئازار و پیسیان.

## _ کاریگەری پیسی و خراپە بە سەر دڵ و ڕۆحەوە:

مەبەست ئەمەیە کە پیسی و خراپە هەندێ جار، دیار و هەست پێکراو و هەندێ جاریش دەروونی و نادیار و هەست پێ نەکراوە و. خراپە و پیسی هەندێ جار بە شێوەیەکی وەها بەسەر دڵ و ڕۆحی مرۆڤدا زاڵ دەبێت کە، خاوەنانی دڵ و ڕۆحە هەستیار و پاکەکان بۆنی پیسو ئازاراویی لە دڵ و ڕۆحی مرۆڤ گەلێکی تووش بوو و موشریك و هاوەڵ بڕیاردەر بۆ خودا هەست پێ دەکەن و. بە هەمان شێوە کە بەهۆی بۆنی عارەق کردنی جەستەیان خەڵکانی تر بێزار دەبن و. بۆنێکی پیس و خراپ لە جەستەیانەوە دەگاتە لووتمان. بەڵام بۆنی پیسی دڵ و ڕۆحی مرۆڤەکانی ئەهلی شرکو بێ باوەڕی و دوو ڕوویی زیاتر لەوەی کە پەیوەندی بەڕووالەتییانەوە هەبێ، پەیوەندی بە دەروون و ناخییانەوە هەیە، ئەگەرچی عەرق کردنی جەستەش لە دەروونی جەستەیانەوە سەرچاوە دەگرێ.

بۆیە جەستە و لاشەی مرۆڤە پاك و لە خواترسەكان و پارێزكارەكان، خاوەنی بۆنێكی خۆشە و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زیاتر لە هەمووان، عارەقی (ئاوی جەستەی) جەستەی بۆن خۆشتر بووە.

لە كاتێكدا كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەپاڵ (ام سليم) لەسەر جێگەی نووستن خەوت بوو سەبارەت بە بۆنی جەستەی پرسیاری لێ كرد — لە ام سليم — ام سليم وتی: ((بۆنی هیچ شتێكی تر بۆن خۆشتر نییە لە عەتر و بۆنی جەستەی تۆ)).

مرۆڤ گەلێ كە خاوەنی نەفسێكی پیسن، پیسی و ناپاكییەكانیان بەسەر جەستەشییانەوە بە دەردەكەوێت، بەڵام كەسانێ كە خاوەنی نەفسێكی پاكن، تەنانەت لە جل و بەرگ و جەستەشیانەوە بۆنی خۆش دێت، كە لەسەر زەوی هیچ بۆنێكی خۆش وەك ئەوە پەیدا نابێت. بەڵام بۆنی جەستە و لاشەی مرۆڤە پیس و ناپاكەكان یەكێكە لە خراپترین و ئازاراوی ترین بۆنەكان، كە لەسەر زەوی دا بوونی هەیە.

## _ نیشانە و شوێنەماكانی هاوەڵ بڕیاردان (شرك):

مەبەست ئەوەیە كە بە هۆی ئەوەی كە هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا گەورەترین زوڵم و ستەمەو پیسترین ناپاكی و خراپترینی خراپییەكانە، لەلای پەروەردگاریش غەزەب لێ گیراوترین و ناپەسەندترین كارە و پێش هەموو شتێ خوداوەند پێی تووڕە دەبێ و ئەو سزا و جەزرەبانەی كە لە دونیا و دواڕۆژدا بۆ ئەهلی شركی داناوە بۆ هیچ تاوانێكی تری دانەناوە.

پەروەردگاری گەورە و بەدەسەلات ئەم بابەتانەی وە بیر هێناوینەتەوە كە:

– لە ئەهلی هاوەڵ بڕیار دان خۆش نابێت.

– موشریكەكان پیس و ناپاكن.

– ئەوانی بێ بەش كردووە لەوەی كەوا نزیكی سنووری مەككە ببنەوە.

– کەڵك وەرگرتن و بەکارهێنانی گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی کە ئەوان – موشریکەکان – سەری دەبڕن حەرامی کردووە و نابێ لەلایەن موسڵمانەوە بەکاربێت.

– ژن و ژن خوازی لەگەڵیاندا حەرام کردووە.

– ڕێز و خۆشەویستی و پەیمان بەستن لە نێوان ئەوان و ئەهلی ئیماندا قەدەغە کردووە.

– موشریکەکانی بە دوژمن و ناحەزی پەروەردگار، فریشتەکان، پێغەمبەران و ئەهلی ئیمان ناو بردووە و باسیانی کردووە.

– خستنە ژێر دەسەڵاتی ماڵ و سامانیان و بەکارهێنانی ژن و منداڵەکانیان بە مەبەستی کارکردن بۆ ئەهلی ئیمان ڕەوا کردووە و ڕێگەی پێداوە.[٥٣]

ئەمە هەمووی بەهۆی ئەوەیە کە هاوەڵ بڕیاردان بۆ پەروەردگار، لەبەر چاو نەگرتنی ماف و حەقی پەروەردگارییەتی پەروەردگار و((الوهیت))، کەم کردنەوەی پلەوپایە و گەورەیی خوداوەندی خودا و((ربوبیت))، خراپ بیرکردنەوەیە بەرامبەر بە درووستکەر و خولقێنەری جیهانیان.

بە هەمان شێوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾ سوورەتی فەتح ٦.

واتە: لەولاشەوە ئازار و ئەشکەنجەی دووڕوو و موشریکەکان، چ پیاوانیان، چ ئافرەتانیان بدات، ئەوانەی کە تێکڕا گومانی خراپیان دەربارەی خوا هەیە، ئەو گومانە خراپەیان هەر بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە، ئەوانە خوا نەفرینی لێ کردوون و دۆزەخی بۆ ئامادە کردوون، ئای کە سەرەنجامێکی یەکجار سەخت و سامناکە.

---

٥٣ ئەم حوکم و بڕیارانە ئەو موشریکانە دەگرێتەوە کە لەگەڵ موسڵماناندا لەدۆخی شەڕدان و لەگەڵ موسڵماناندا دەجەنگێن. وەرگێڕی فارس.

ئـەو هەڕەشـە و گوڕەشـە و سـزا و جەزرەبانـەی کـە لەلایـەن پـەروەردگارەوە دژی موشریکەکان تەرح کراوە و لەبەر چاو گیراوە، لـەدژی غـەیرە موشـریکەکان تـەرح و لەبەر چاو نەگیراوە، چونکە ئەوان — موشریکەکان — بەرامبەر بە پەروەردگار دوو دڵو لە ناسینی ئەودا بەگومانن، بۆیە کەسێ یا شتێکیان کردووەتە هاوەڵ و شەریکی خـوا، بەڵام لە ڕاستی دا ئەگەر بەرامبەر بەخودا گومـانی بـاش و ناسینی باشیان هەبووایە، ڕاسـتییەتی و حەقیقـەتی یەکخواپەرسـتی و یەکخواناسـی (توحیـد) پـەروەردگاریان بەدرووستی قبووڵ دەکردو خۆیـان بەملکـەچ و گوێڕایـەڵی ئـەو لـە قەڵـەم ئـەدا. لەبـەر ئەوەیە کە پەروەردگار سەبارەت بە موشریکەکان لە قورئانـدا دەفـەرمووێت[٥٤]: ((کـە ئەوان بە شێوەیەکی گونجاو و شایستە پلە و پایە و ڕێـزی پـەروەردگاریان لەبـەر چـاو نەگرتووە و ڕەچاوییان نەکردووە!)).

خـەڵکانێ کـە کەسـێ یـاخود شـتێ دەکەنـە هـاودەم و هـاوەڵی پـەروەردگار و وەك خوداوەند خۆشیان دەوێ و وابەستە بـوون پێـوەی، لێـی دەترسـن، ئومێـد و هیوایـان پێی هەیە، لە بەرامبەریاندا سەری ڕێـز و نـەوازش دادەنـوێنن، بـۆ دەربـاز بوونیـان لـە خەشـم و تووڕەییـان و بەدەسـت هێنـانی ڕەزامەنـدییان، بەسـەر هـەر شـتێکی تـردا لەپێشتری دەزانن و بەباشتری دەزانن، چۆن گونجاو و شیاوە ئەو جۆرە کەسانە پلـە و پایە و ڕێزی پەروەردگار لەبەر چاو بگرن و ڕەچاوی بکەن؟!(لێرەدا مەبەسـت ئەوەیـە کەوا کەسێ کە شەریك و هاوەڵی بۆ خودا دانـابێ، ئیـدی چـۆن دەتـوانێ پلـە و پایـە و گەورەیی خودا لە بەر چاو بگرێ!چونکە گەر بیزانیبا و بیتوانیبا هەست بە گەورەیی و مەزنی و شکۆمەندی پەروەردگار بکات، ئـەوا قـەد هـاوەڵ و شـەریکی بـۆ پـەروەردگار دانەدەنا.وەرگێڕی کورد).

---

٥٤ سورەتی الانعام:٩١.الحج:٧٤.الزمر:٦٧.)

پەروەردگاری گەورە و بەدەسەڵات دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ...﴾ سوورەتی بەقەرە ١٦٥.

واتە: ((لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا، هەندێك کەس هەیە لە جیاتی ئەوەی خواپەرست بێت، شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و شوێن ڕێنموونییەکانی خوا ناکەوێت، وە خۆشەویستی و سۆز دەدات بەو بت و بەرنامۆلکە و توولە ڕێگەیانە و خۆشی دەوێن، وەك چۆن ئیمانداران خوایان خۆش دەوێت)).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾ سوورەتی ئەنعام ١.

واتە: ((سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، تاریکی و ڕووناکی فەراهەم هێناوە (کەچی لە گەڵ ئەو هەموو بەڵگە بەهێز و سەرسام ئاوەرانەدا) پاشان ئەوانەی بێ باوەڕبوون بە پەروەردگاریان یەکێك لە دروستکراوەکانی خوا دەکەنە هاوتای خودا)).

واتە ئەوان لە پەرستشدا ڕێزی گەورەیی و مەزنی کەسێ یا شتێ دەدەنە پاڵ پەروەردگار و دەیکەنە هاوەڵ و هاوبەشی پەروەردگار، ئەمانە موشریکەکانن کە کەسێ یا شتێکیان کردووەتە پەرستراو و خوای خۆیان، هاوشان و هاوڕێزی خوداوەندیان لێ کردووە و لە نێو ئاگری جەهەننەمدان کە هەست بەوە دەکەن و دەزانن کەوا بیروباوەڕیەکانیان هیچ و پووچ و ناحەق بووە و ئەو ڕێگایانەی کە پێیاندا ڕۆیشتوون و هەڵیان بژاردوون کوێرە ڕێگەو لاڕێ بوون و بە پەرستراو و خوداکانیان کە ئەوانیش لەدۆزەخدان دەڵێن: ﴿تَاللَّهِ إِنْ كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ (٩٧) إِذْ نُسَوِّيكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ شوعەرا ٩٧ – ٩٨.

واتە: ((سوێند بەخوا بە ڕاستی ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا دەژیاین، کاتێك کە ئێوەمان دەبردە ڕیزی پەروەردگاری جیهانیانەوە و یەکسانمان دەکردن لەگەڵیدا)).

ئەم بابەتە ڕوون و ئاشکرایە کەوا، موشریکەکان ئەو شتانەی کەوا کردوویانەتە هاوەڵ و شەریکی پەروەردگار، ئەوانەیان لە زات و لە هەندێ لە سیفەت و کارەکاندا لە گەڵ خوداوەندا کردووەتە شەریك و هاوەڵ و هیچ کاتێ نەیان وتووە کەوا خوا و پەرستراوەکانی ئێمە ئاسمانەکان و زەوی درووست کردووە و بەدیهێناون و مردن و ژیان بەدەست ئەوانەوەیە، بەڵکو ئەوانەیان — واتە ئەو شتانەی کەوا موشریکەکان کردوویانن بە شەریك و هاوەڵی خوا.وەرگێڕی کورد. — لەخۆش ویستن، ڕێزگرتن، گەورەیی و مەزنی بووندا، پەرستش و داوای یارمەتی لێ کردن لێیان، کردوویان بە هاوشان و هاوەڵی پەروەردگار، بە هەمان شێوە کەوا لە نێو ئەهلی شرك سەر بەم ئیسلامەدا ئەوە دەبینین و هەستی پێ دەکەین!؟. (واتە:ئەو جۆرە کارە خودا پەنامان بدات لە نێو کۆمەڵگەی کوردەواری خۆشماندا هەر هەیە، بە تایبەتی لای باپیرە و داپیرەکانمان و لە بری ئەوەی هاوار و سکاڵا بۆ لای پەروەردگار بەرن بۆ لای شێخێك یاخود پیاو چاکێکی دەبەن؟؟!؟ کە ئەمەش لە شەریعەتی ئیسلامدا ڕێگە پێنەدراوە و نابێ هیچ کەس و هیچ شتێ بکەین بە وەسیلەی نێوان خۆمان و پەروەردگار بەڵکو دەبێ ڕاستەوخۆ لەخوداوەند بپاڕێینەوە و تەنیا داوا لە ئەو بکەین. تەنانەت نابێ لە خۆشەویسترین کەسی خوداش کە پێغەمبەرە(صلی الله علیە وسلم) بپاڕێینەوە و داوا بکەین! چونکە پەروەردگار خۆی فەرموویەتی(( وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ...)) واتە: ((ئەی بەندەکانم تەنیا داوا لە من بکەن و لە من بپاڕێنەوە و من زۆر لێتانەوە نزیکم و داوای هەر شتێکم لێ بکەن بۆتانی جێ بەجێ دەکەم...)). وەرگێڕی کورد).

بابەتێ کە بە ڕاستی جێی سەرسوڕمانە ئەمەیە کەوا، موشریکەکان ئەهلی یەکخواپەرستی (توحید) بە کەمتەرخەم و لاوازکردنی پلە و پایەی پێغەمبەران و پیاوچاکان و شێخ و مەشایخ تاوانبار دەکەن.! لە کاتێکدا کەوا تەنیا تاوانی یەکخوا پەرستەکان و موەحیدەکان ئەمەیە کە دەڵێن: تەواوی ئەوانە بەندەی پەروەردگارن و

نە بۆ خۆیـان و نـە بـۆ خـەڵكانی تـریش خـاوەنی سـوود و قـازانج گەیانـدن و لابردنـی زەرەرو زیان نین، واتە ناتوانن نە سوودێ بە خەڵكی بگەیەنن و نە زەرەر و زیانێكیش لە خەڵكی دوور بخەنەوە، مردن و ژیان و زینـدوو كردنـەوەی دووبـارە بەدەسـت ئـەوان نییە و بەهیچ جۆرێ داوای لێبوردن و بەخشش و شەفاعەت ناكەن لە لای پـەروەردگار بۆ ئەو كەسانەی كـەوا ئـەوانینان كـردووە بـە پەرسـتراو و هـاوەڵی خـوا و بـۆ ئـەهلی یەكخواپەرسـتانیش دوای ڕووخـسەت و ڕێگـە پێـدانی پـەروەردگارە كـە دەتـوانن شەفاعەت بكەن. (واتـە: ئـەهلی یەكخواپەرستیش كـە چاكە كـاران و شـەهیدان و...، ناتوانن شـەفاعەت بـۆ كەسـێ بكـەن تـاوەكو پـەروەردگار ڕووخـسەت و ڕێگـەیان پـێ نەدات، هەر ئیجـازەی دان ئەوسـا شـەفاعەت دەكـەن بـۆ خـەڵك، وەك لـە فـەرموودەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)دا هاتووە كەوا مرۆڤی شەهید دەتوانی شەفاعەت بۆ حەفتا و ئەوەندە كەس بكات، لێرەدا تا خـودا ئیجـازە نـەدات ئـەو نـاتوانێ شـەفاعەت بكات، وەرگێڕی كورد).

هێنانــەدی و دروســت كــردن و فەرمان،بەدەســت پــەروەردگاری بەدیهێنــەر و دروستكەرە نەك ئەوان،(واتـە ئـەو پیـاو چـاكانەی كـەوا خـەڵكی دەیانكەنـە هـاوەڵ و شەریكی خودا، ئیتر لەپاڕانەوەدا بێ یاخود لە داواكردن و سكاڵا كردندا بـێ. وەرگێـڕی كــورد). تــەواوی شــەفاعەت و پێــشڕەوییەكان بــۆ خودایــە و هــیچ یــەكێ لــە دروستكراوەكانی گەورە و شەفاعەت دەر نین جگە لە خۆی – پەروەردگار –.

شرك و سەردانەواندن و ملكەچ بوون بۆ غەیری پەروەردگار لە سەر بناغە و بنـەمای ناحـاڵی بـوون و بـەدگومانی بەرامبـەر بـەخودا جـێگیرە و دروست دەبـێ، حـەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێت) بە دوژمنەكانی خۆی دەفەرموو: ﴿أَئِفْكًا آلِهَةً دُونَ اللَّهِ تُرِيدُونَ (٨٦) فَمَا ظَنُّكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ سوورەتی صافات ٨٦ – ٨٧.

واتە: ((ئایا شتی دەست هەڵبەست دەكەنە خوا و لەجیاتی پەروەردگار دەتانەوێت بیپەرستن..؟ باشە ئاخۆ ئێوە چ گومانێكتان هەیە لە پەروەردگاری جیهانیان..؟!)).

ئەگەر چی واتای ئەم ئایەتە ئەوەیە کەوا، سەبارەت بە هەڵس و کەوتی پەروەردگار لەگەڵ ئێوەدا و ئەو سزا و جەزرەبانەی کە بەهۆی ئەوەی کە غەیری پەروەردگارتان دەپەرست و کەسێ یا شتێکتان لە ریزی ئەودا دادەنا لەچاوەڕووانیدان، چۆن بیر دەکەنەوە؟! بەلاَم لەدوو توێیی ئەم هەڕەشە و گوڕەشانەدا، ئەم مانایەش شاراوە و نادیارە کە چ گومانێکی خراپتان بەرامبەر بە پەروەردگار هەبوو کەوا کەسێ یا شتێکتان کردبوو بە هاوڕێ و شەریك و هاودەمی پەروەردگار.؟!

کەسی موشریك وا گومان دەکات کەوا پەروەردگار بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی جیهان پێویستی بە جێگر و یاریدەدەر هەیە،! کە ئەمە خراپترین جۆری کەم کردنەوەیە لە پلە و پایە و گەورەیی پەروەردگاری دەوڵەمەند و بێ نیاز کە هەموو شتێ و هەموو کەسێ پێویستی بەوە و نیازمەندی ئەوە.؟ یاخود وا گومان دەبات کە تەنیا دوای کەڵك وەرگرتن لە هێز و توانای ئەو شەریك و هاوەڵ بڕیار دەرەیە کەوا توانای پەروەردگار تەواو کامڵ دەبێ.! یاخود گومان دەبات کەوا پەروەردگار شت گەلێ نازانێ یاخود نابیستێ و دەبێ لە ڕێگەی ناوجیکەرەوە ئاگاداری بکەینەوە.؟!

یا لەوانەیە گومان ببات کە پەروەردگار تەنیا دوای دڵسۆزی و میهرەبانی و دەست تێوەردان و هێنانە ناوەوەی ئەو ناوجیکەرانەوەیە کە ئەوان دەخاتە بەر لێبوردەیی و ڕەحمەت و میهرەبانی خۆیەوە.؟! یاخود پەروەردگار بەندەکانی تێر ناکات و ئەوەی کە بەندەکانی دەیانەوێ تەنیا دوای هێنانە ناوەوەی ناوجیکەرەکانە کە جێ بەجێی دەکات و ئەنجامی دەدات و وەك شەفاعەت و هێنانە ناوەوەی مرۆڤەکان بەرامبەر بە یەکتر، کە هەندێ جار لایەنی سەرلێدراو (مراجعە) (ئەو کەسەی کە چووین بۆ لای بە مەبەستی ئەنجام دانی کارێ بۆمان. وەرگێڕی کورد)، بەهۆی ئەو نیاز و پێویستییەی کە بە شەفاعەت کەر هەیەتی و لە هاوڕێیەتی و ڕەفیقایەتی لەگەڵیدا قازانج و سوودێکی دەست دەکەوێت و کەم و کوڕییەکانی قەرەبوو دەکاتەوەو سەرشۆڕییەکانی

دەکات بە گەورەیی و سەربەرزی. شەفاعەت هاتنە ناوەوە و ناوجیکەری ئەو قبووڵ دەکات.

یاخود گومان دەکات کە پەروەردگار وەڵامی نزا و داواکاری مرۆڤەکان ناداتەوە، مەگەر ئەوەی کەوا ناوجیکەرەکان ئەو نیاز و پێویستیانە لای ئەوە — وەك تەرح کردنیان لە خزمەت خاوەن دەسەڵات و پلە و پایەکانی دونیا — تەرح بکەن و بیان خەنە ڕوو.؟! ڕەگ و ڕیشەی تەواوی شرك و هاوەڵ بڕیاردانەکانی مرۆڤەکان لێرەدایە.

یاخود ئەمەی کەوا گومان دەبەن کە پەروەردگار بەهۆی دووری و نزیك نەبوونییەوە، نزا و پاڕانەوە و داواکارییەکانی ئەوان نابیستێ و ئەوە ناوجیکەرەکانن کەوا ئەو نزا و داواکارییانەی ئەوان دەگەیەننە لای پەروەردگار.!؟

یاخود وەها بیر دەکەنەوە کە هەندێ لە درووستکراوەکان لەلای خوداوەند خاوەنی حەق و مافی تایبەتی خۆیانن و ئەوانە سوێند بە پەروەردگار دەخۆن بە حەقی ئەو کەسانە و لە ڕێگەی درووستکراوەوە بە پەروەردگار دەگەن و لێی نزیك دەبنەوە، درووست وەك ئەوەی کەوا هەندێ لە خەڵکی لە ڕێگەی مرۆڤ گەلێکی نزیك لە خاوەنانی پلە و پایە و دەسەڵات، نزیك دەبنەوە و دەچنە لایان، کە قبووڵ نەکردنی شەفاعەتی ئەوان بۆیان سەخت یاخود نەگونجاوە. (واتە قبووڵ نەکردنی شەفاعەتی ئەو کەسە نزیکانە بەو کەسەی کە لەدونیادا خاوەنی پلە و پایە و دەسەڵاتە نەگونجاوە و ئیللا قبووڵی دەکات بۆ هەر کەسێ بێت. وەرگێڕی کورد).

تەواوی ئەو شتانەی کە باسکران، دەبێتە هۆی تێشکان و لەناو بردنی مەنزڵگەی پەروەردگارییەتی پەروەردگار و خوداوەندی خودا ((الوهیت و ربوبیت))، وە لەبەر چاو نەگرتنی حەق و مافی خوداوەند بەلای ئەهلی شرکەوە.

ئەگەر لەناویاندا هیچ نەنگیی جگە لە کەم و کوڕی خۆشەویستی و ترس و پاڕانەوە و تکا کردن لە پەروەردگار و پشت بەستن و ڕووتێکردنی موشریك جگە لە خوداوەند بوونی نەدەبوو بۆ پیسی و ناپاکییەکانی بەس بوو چونکە بەهۆی دابەش

بوونی دڵی موشریك لە نێوان پەروەردگار و ئەو شتەی کە کردوویەتییە هاوەڵ و شەریکی خوداوەند لە هەستکردن بە گەورەیی و خۆشەویستی و ترس و پاڕانەوەی و تکا کردنی پەروەردگار لە دڵیدا بەتوندی کەم دەبێتەوە، یاخود بە تەواوی لەناو دەچێت.

## _ تازەگەری[55] هاوشانی هاوەڵ بڕیاردانە بۆ خودا (البدعة قرينة الشرك):

کەم و کورتی و ناتەواوی گەورەیی و مەزنایەتی پەروەردگار لە دڵ و ژیانی ئەهلی شرکدا نیشانە و شوێنەمای سروشتی ئەهلی شرکە، مرۆڤی موشریك بیەوێت یاخود نەیەوێ، ئەم شتە بۆ ئەو ڕوو دەدات و دێتە پێشەوە.

بۆیە پێویستی سوپاس و ستایش و تەواوی و کەماڵی خوداوەندی خودا(ربوبيت) ئەمەیە کەوا، لە ئەهلی شرك خۆش نەبێت و بۆ هەمیشەیی و هەتا هەتایی لە نێو ئاگری دۆزەخدا سزا و جەزرەبەیان بدات، وە بیانکاتە خراپترینی درووستکراوەکان.

هیچ کەسێکی موشریك نییە کە لە کاروکردەوە و گوفتار و بیروباوەڕیدا کەموکوڕیو نا تەواوی پەروەردگارییەتی پەروەردگار و خوداوەندی خوداوەند بوونی نەبێ. ئەگەر چی گومانیش بکات کە بەو شێوازەی خۆی، بڕوای بە گەورەیی و مەزنایەتی پەروەردگار هەیە.

بەم جۆرە هەر مرۆڤێکی ئەهلی داهێنان و تازەگەری کەوا شتێ زیاد دەکات بە بنەما و بنچینەکانی بیروباوەڕ و پەرستش، یاخود کەم دەکاتەوە، لە کاروکردەوەدا، پەیام و شەریعەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە ناتەواو و کەم و کوڕی لە

---

55 لێرەدا مەبەست لە تازەگەری، ئەو تازەگەری و داهێنانانەن کە لە ئایینی ئیسلامدا لە لایەن هەندێ کەسی دڵ نەخۆش و نا تێگەیشتوو و نەزان، لە شەریعەتی ئیسلامدا دادەهێنرێن، کە بە داهێنانی هەر تازەگەرییەك لە ئاییندا سوننەتێك دەمرێنن. خوا پەنامان بدات و لەو کارە قێزەون و خراپە دورمان بخاتەوە و بمان پرێزێ و نەکەوینە نێو بازنەی داهێنەران و بیدعە چییەکانەوە.امین.
وەرگێڕی کورد.

قەڵەم دەدات، چونکە کەسی داهێنەر، ئەو کارەی خۆی لە شەریعەت بەچاکتر و درووست تر دەزانێ.!؟ بەڵام ئەگەر نەزان و لاسایی کەرەوە و شوێنکەوتوو بێت ئەوە بە شەریعەت دەزانێ و ئەگەر لە ڕووی شارەزایی و ئاگاییەوە دەست بداتە تازەگەریو داهێنان، لە ڕاستی دا دژایەتی لە گەڵ پەروەردگار و پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دەکات.

ئەوانەی کە بە بیروباوەڕ و پەرچەکردارەکانیان (ئەلوهییەت و ڕەبووبیەت) پەروەردگار بە ناتەواو و نا پێویست دەزانن، ئەهلی شرك و داهێنان و تازەگەرین، کە خودی ئەوان لە لای پەروەردگار و پێغەمبەر و ئەهلی یەکخواپەرستی و ئیمان، مرۆۋ گەلێکی پێ نەگەیشتوو و ناتەواو و گومڕان.

بەتایبەتی ئەوانەی کە دەڵێن: کەلامی پەروەردگار و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەڵگە و نیشانە گەلێکی زارەکی و دڵنیا نەکەرن کە بە هیچ جۆرێ مرۆۋ لە زانست و دڵنیایی بێ نیاز ناکات.؟!

تو خودا چ شتێ دیارخەر و ئاشکراترە لەم داوا و هەڵکێشانەی ئەمان سەبارەت بە ناتەواوی و کەم و کوڕی کەلامی پەروەردگار و شەریعەتی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم).؟! هەروەها کەسێ کە سیفاتی تەواوی و کەماڵی بەهۆی ترس و دوو دڵیو گومانەوە لە تووش بوون بە (چوواندن و هەڵسەنگاندن) لە پەروەردگاری دوور دەخاتەوە و دانی پێدا نانێ و لە ڕاستی دا لە ئاراستەیەکی پێچەوانەی ئەوەی کە خوداوەند خۆی پێ وەسف کردووە بڕوای بە ناتەواوی و کەم و کوڕی مەنزڵەتی پەروەردگار هەیە.

مەبەست ئەوەیە کەوا ئەو دوو تاقمە – ئەهلی تازەگەری و ئەهلی شرك – لە ڕاستیدا هەردووکیان بڕوایان بە کەم و کوڕی و نا تەواوی و لاوازی پلە و پایە و مەنزڵەتی پەروەردگار هەیە و تەنانەت لە خراپترین ئەو کەسانەن کە بڕوایان پێی هەیە و پێی ڕازین، لە کاتێکدا کە شەیتان ئەوانی هەڵخەڵەتاندوە و تووشی فڕو فێڵ و

هەڵ خەڵتاندنی کردوون و وەك هەمان بیروباوەڕی ناتـەواوی و بـە کـەم و کـوڕ زانینـی سیفاتی پەروەردگار بە هەمان شێوەش لـە کـەماڵی و تـەواوی خوداوەنـد دوو دڵ و بـە گومانن.

لەبەر ئەمەیە کـەوا لـە قورئـانی پـیرۆزدا تازەگـەری و داهێنـان هاوشـان و هـاوڕیزی هاوەڵ بڕیاردانە بۆ خودا: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لا تَعْلَمُونَ﴾ سوورەتی ئەعراف ٣٣،

واتـە: ((پێیـان بڵـێ بـە ڕاسـتی پـەروەردگارم هەرچـی گونـاح و خراپەیـە حـەرامی کردووە چ ئەوانەی ئاشکران، چ ئەوانەی پەنهانن، هەروەها هەموو گونـاح و داخـوازی و دەست درێژییەکی بەناحەقی حەرام کردووە، شتێك بکەن بە شەریك و هـاوەڵ بـۆ خـوا کە هیچ دەسەڵاتی پێ نەداوە، هەورەها حەرامی کردووە لەخۆتانـەوە بـەناوی خـواوە، دوور لە هەموو زانیاری و زانستێك شت بڵێن)).

دەبینین گوناح و تاوان و یاخیگەری و سەرکێشی هاوشان و داهێنان و تازەگەری و شرکیش لە پاڵ یەکتردا جێگیرن.

## _ جیاوازی لە نێوان پیسی و ناپاکی گوناح و پیسی و ناپاکی شرکدا:

بەڵام پیسی و شوێنەمای تاوان و گوناحەکان بەجۆرێکی ترە و تووش بوونی گونـاح هەمیشە بە مانای ڕازی بوون بە ناتەواوی ڕەبووبیەت و خراپ تێگەیشتن نییە بەرامبـەر بە پەروەرودگار، لەبەر ئەمەیە کەوا خوداوەند ئـەو سـزا و جەزرەبانـەی کـە بـۆ ئـەهلی شرك و هاوەڵ بڕیاردانانی داناوە بۆ ئەوانی بڕیار نەداوە.

یەکێك لە بابەت و بوارە باوەڕپێکراوەکان لە شەریعەتدا ئەمەیە کە پیسی و ناپاکی کەم وەك: مانەوەی ئەو پیس و ناپاکییەی کە لە دوای خۆ پاك کردنەوە بە بەرد یاخود بە خۆڵ و... دوای بە دەست گەیاندنی ئاو (واتە خۆ بەتاڵ کردنەوە لە پاشماوەکان)و

پیس و ناپاكییەكی كەم كە لە ژێر ((خوف))[٥٦] و پێڵاودا بوونیان هەبێ و پیسی و پاشماوەی منداڵی شیرە خۆرە دەكەونە بەر چاوپۆشی و لێبوردنەوە- ئەو لێبودرن و بەخششەی كە لە بارەی پیس و ناپاكییەكانی ترەوە تەرح نییە و بەكار نایە.

بەم پێیە تاوانە بچووەكان – نەك تاوانە گەورەكان – بۆ ئەو كەسانەی كە ئەهلی یەكخواپەرستییەكی پاكن و بەهیچ جۆرێ تووشی شرك نەبوون، دەكەونە بەر لێبوردن‌و لێخۆش بوونەوە. بەلأم بۆ ئەو كەسانەی كە ئەهلی یەكخواپەرستی و تەوحید نین، ئەم لێبوردن و بەخششە لە ئارادا نییە و نابێ.

((ئەگەر ئینسانێكی یەكخواپەرست كە قەت كەسێ یاخود شتێكی نەكردووەتە هاوەڵ و شەریكی پەروەردگار، ئەگەر بەكۆڵێك تاوانەوە بە ئەندازەی گۆی زەوی بڕواتە بارەگا و خزمەتی خوداوەند، خوای گەورە بە لێبوردن و چاوپۆشییێك بە ئەندازەی گۆی زەوی لەگەڵ ئەو كەسەدا هەڵس و كەوت دەكات و دەجووڵێتەوە)).[٥٧]

بەلأم ئەم جۆرە شتە بۆ ئەو كەسەی كە یەكخواپەرستییەكەی ناتەواو و كەم و كورتە و لە گەڵ چەند جۆرێ شرك تێكەڵی كردووە، لە ئارادا نییە. چونكە هاوڕێ لە گەڵ ئەو یەكخواپەرستییەیدا كە شركی تێكەڵ نەبووە، تاوانێ بەجێ نامێنێ. چونكە (یەكخواپەرستی پاك و بێگەرد) دەبێتە هۆی خۆشەویستی، ڕێزگرتن، گەورەیی و مەزنی، ترس و داواكردن، تەنیا لە پەروەردگار و ئەمە دەبێتە هۆی پاك كردنەوە و لەناو بردنی پیسی و ناپاكی گوناح و تاوانەكان – ئەگەر چی بە ئەندازەی قورسایی و كێشی گۆی زەوی بن، چونكە پیسی تاوانەكان لەمپەر و ڕێگرێكن و هۆكاری پاك بوونەوە لێیان – یەكخواپەرستییەكی تەواو بەهێز و پاك و بێگەردە، كە تاوان و

---

٥٦ (خوف هاوشێوەی گوێرەوییە و مرۆڤی موسڵمان و نوێژكەر دەتوانێ مەسح بەسەرئەو خوفانەدا بكات و نوێژی خۆی بەجێ بهێنێ.

٥٧ بەشێكە لەو فەرموودەیەی كە موسلیم بە ژمارە (٢٦٨٧) گێڕاویەتییەوە و هێناوییەتی.

گوناحەکان لەپاڵ ئەودا — یەکخواپەرستییەکی پاك و بێگەردا — توانای مانەوەی هەتا هەتاییان نییە.

## _ زینا ونێربازی، پیسترین و خراپترین تاوانن:

بەڵام پیسی و خراپی زیناو نێربازی لە ڕووی پلە و پایەوە لە پیسی و خراپی تاوانەکانی تر زیاترە، چونکە دەبنە هۆی پیسی و ناپاکی دڵ و بە توندی ئیمان و یەکخواپەرستی لاواز دەکەن.

بۆیە ئەوانەی کە زیاتر تووشی ئەو دوو گوناح و تاوانە دەبن، زیاتر لە خەڵکانی تر تووشی هاوەڵ بڕیار دانان و شرك دەبن، وە بەو ئەندازە و ڕێژەیەی کە شرك تیایاندا زیاد بکات و تەشەنە بسێنێ، ئارەزووی تووش بوون بەو کارە خراپانە لەناو ئەو کەسانەدا زیاد دەکات، بەڵام بەو ئەندازەی کە پاکی و دڵپاکی ئەهلی یەکخواپەرستی و ئەهلی ئیمان زیاتر بێت، زیاتر خۆیان دوور دەخەنەوە لەو کارە خراپ و پیسانە — زیناو نێربازی — خۆیان دەپارێزن.

بە هەمان شێوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿....كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾ سوورەتی یوسف ٢٤.

واتە: ((ئا بەو شێوەیەمان کرد بۆ ئەوەی هەرچی گوناه و تاوان و خراپەیە لێی دوور دەخەینەوە و بە ڕاستی ئەو لە بەندە هەڵبژاردە و پاکەکانی ئێمەیە)).

حەز لێ کردن و تامەزرۆ بوونی زۆر بە فیلم و وێنە هایەکی حەرام و ناڕەوا، جۆرێکە لە پەرستنیان و بەجۆرێ لە پەرستنیان لە قەڵەم دەدرێن، هەندێ جاریش دەگاتە بەرزترین پلە و پایەی بەندایەتی کردن. بە تایبەتی ئەو کاتانەی کە ئەوحەز و تامەزرۆییە زاڵ بێ بەسەر دڵدا و دەست بگرێ بەسەریدا و بەو جۆرە ڕەگ و ڕیشە دابکوتێ کەوا ئەویندار و حەز لێکەرەکە (عاشق) دەکاتە بەندە و بەردەست و گوێ دێری یار و خۆشەویستەکەی (مەعشووق)، یاد و ستایش کردن و لە گەڵ ئەودا بوون و

هەوڵ و تێكۆشان بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەو بدات بەسەر خۆشەویستی و ڕێزگرتنی پەروەردگار و هەوڵ تێكۆشان بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگار.

هەندێ جار ئیمان و خۆشەویستی بۆ پەروەردگار بە تەواوی لە دڵی ئەودا لادەچێ و نامێنێ و بە تەواوی مانا وابەستە و پەیوەست دەبێ بە یار و خۆشەویستەكەیەوە، ئەو یار و خۆشەویستە دەبێتە خودا و پەرستراوی ئەو ڕەزامەندی و خۆشەویستی و نزیك كەوتنەوە لەو بە باشتر دەزانێ لە ڕەزامەندی و خۆشەویستی و نزیك بوونەوە لە پەروەردگارەوە. لە پێناوی دا شت گەلێ دەبەخشێ كە ئامادە نییە لەپێناو خوادا و لەبەر خاتری خوا بیان بەخشێ و لە تووڕە بوونی ئەودا بە جۆرێ پارێز دەكات كە بەهەمان شێوە لە ترسی پەروەردگار دوورە پەرێزی ناكات و بەم پێیە لە ڕووی ڕێز و خۆشەویستی و ملكەچی و بیستن و پەیڕەوی كردنەوە دەیخاتە پێش پەروەردگاری كارزان و كاربەجێوە و بەشیاوتری دەزانێ. !

## _ پەیوەندی نێوان خۆش ویستن و شرك:

بە سەرنجدانە ئەوەی كە باسكرا: خۆش ویستن و خۆشەویستی بۆ غەیری پەروەردگار و هاوبڕیاردان بۆخودا، پێویست و پێداویستی((لازم و ملزوم)) یەكترین و. پەروەردگار لەم پەیوەندییەدا و سەبارەت بەمە باس لە هەوەس و ئارەزووی گەلی لوت و ئەوینداری و حەزی هاوسەری عەزیزی میسر — ئەو كاتەی كە هێشتاكو باوەڕیان نەهێنا بوو — دەكات.

بە هەمان شێوە كە وترا، بەو ئەندازەیەی كە شرك و هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا لە دڵدا زیاتر بێت، ئەو مرۆڤە زیاتر ڕوو دەكاتە حەز لێكردن و خۆشویستنی وێنەكان، بەڵام بەو ڕێژە و ئەندازەیە كە ئیمان و یەكخواپەرستی ئەو زیاتر بێت، لەو مەسەلە دوور دەكەوێتەوە.

كاری زینا و نێربازی تەواوی خۆشی و تام و چێژیان لە حەز لێكردن و ئەوینداری لاڕێیانە و ڕێگە پێنەدراوەوە سەرچاوە دەگرێ و ئەهلی ئەو كارانەش بە دڵنیاییەوە بەبێ هیچ دوو دڵی و گومانێ ئەهلی هەوا و هەوەس و ئارەزووی پیسن، بەڵام بەهۆی

بەرەڵڵایی و بێ جێ و ڕێی بوونیانەوە خۆشەویستی و وابەستە بوونیان بە یەك مەسەلەو دوو مەسەلە سنووردار ناکرێ و نابێت، بەڵکو وابەستە و تامەزرۆی چەندین بابەت و لایەن دەبێ و هەر کامێ لەوانەش بەشێك لە ئولوهییەتی ئەو دەبات بۆ خۆی.

لە نێو تاوان و گوناحەکاندا هیچ تاوانێ بە ئەندازەی نێربازی و زینا نابنە هۆی پیسی و ناپاکی دڵ و ئایین[58]، لەو تایبەتمەندییانەش بەهرەمەندن کە دەبنە هۆی دوور خستنەوە و تۆراندنی دڵ لە پەروەردگار، چونکە بەشێکن لە خراپترین نزمی و پیسی و ناپاکییەکان و هەرکاتێ دڵ و بیر تووشی ئەو ناپاکییانە بن، لە هەموو شتێکی پاك و خاوێن دوور دەکەونەوە و هەڵدێن و پاکی ڕویان تێ ناکات و بە هەر ئەندازەیەکیش پیسی و چەپەڵی ئەوانە لەدڵێکدا کۆ بێتەوە، زیاتر لە پەروەردگار دوور دەکەوێتەوە و مەودای نێوان ئەو دڵە و خوا زیاتر و زیاتر دەبێت.

لەبەر ئەمەیە کەوا حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لە سەر بێت) لە گێڕانەوەیەکدا لە ئیمامی ئەحمەدەوە لە پەرتووکی (الزهد)دا فەرموویەتی: مرۆڤە بێ کارو بەتاڵەکان نابنە ئەهلی حیکمەت و دەوڵەمەندی و سامان، وە ڕێگە بە زیناکاران نادەن کەوا بچنە جیهانی ئاسمانەکان)).

لەبەر ئەم حاڵ و بارودۆخەی ئەهلی زیناو نێربازانە، کە قورئانی پیرۆز ئەو کارە پیس و خراپەی ئەوان لە شرك نزیك دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿الزَّانِي لا يَنْكِحُ إِلاَّ زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لا يَنْكِحُهَا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ سوورەتی نوور ٣.

واتە: ((پیاوی زیناکەر تەنیا ئافرەتی زیناکەر یاخود موشریك مارە دەکات، ئافرەتی زیناکەریش تەنها پیاوی زیناکەر یاخود موشریك مارەی دەکات، (هاوسەرێتی پیاوان و ئافرەتانێك کە بەردەوامن لەسەر زینا)، ئەوە لەسەر ئیمانداران حەرام کراوە)).

---

٥٨ هەروەها هاوکاری و هاو هەڵوێستی و وابەستە بوون بە دوژمنان و ناحەزانی دینەوە چ جوولەکە و خاچ پەرستەکان و ئەوانی تریش کە بەدوای زاڵ بوون و دەست گرتن بەسەر چارەنووسی موسڵمانانەوە، لەگەڵ یەکخواپەرستی دا ناکۆك و پێچەوانەی یەکترن، وەرگێڕی فارس.

## _ ڕۆڵی زینا له دوورخستنەوەی دڵ له پەروەردگار:

مەبەست ئەوەیە کەوا پەروەردگاری گەورە و مەزن ژنان و پیاوانی زیناکاری وەك مرۆڤ گەلێکی پیس و ناپاك و خراپ ناو بردووە و باسیانی کردووە، تەنانەت دوای کاری سەر جێی کردنی حەلاڵ و ڕێگە پێدراویش ژن و پیاو دەبێ خۆیان بشۆن و خۆیان پاك بکەنەوە و کەسێ کە کاری هاوسەری (سەرجێیی) ئەنجام دەدات لە ڕووی شەریعەتەوە پێی دەوترێت لەش پیسی (جنب)، چونکە دەبێ پێش ئەوەی خۆی بشوات لە قورئان و نوێژ کردن و ڕۆیشتن بۆ مزگەوت دوورە پەرێزی بکات، (واتە کەسێ کە لە ڕێگەی شەریعەتەوە لە گەڵ هاوسەری خۆیدا کاری سەرجێی ئەنجام دەدات نابێ نوێژ بکات و دەست بەقورئانەوە بدات و بەرەو مزگەوتیش بڕوات بە مەبەستی پەرستش، تا ئەو کاتەی خۆی نەشوات و لەش پیسی خۆی دەر نەکات، ئەم کارە ئەو لاوانەش دەگرێتەوە کەوا تووشی (احتلام) دەبن و هەروەها ئەوانەش کە بەدەستی خۆیان هێز و وزەی سێکسی خۆیان بەتاڵ دەکەنەوە کە کوردەواری خۆمان پێی دەڵێت: (دەست پەڕ)، خودای گەورە پەنامان بدات. وەرگێڕی کورد).

بەڵام ئەگەر لە ڕێگەی حەرام و ناڕەواوە ئەنجام بدرێ – واتە کاری سەر جێیی – ئەو دڵە دوور دەخاتەوە لە پەروەردگار و ژیانی دوای مردن و لەمپەر و ڕێگری دروست دەکات لە نێوان کەسی زیناکار و ئیمانەکەی دا و تەنیا دوای پاك کردنەوە و خاوێن کردنەوە دڵ بەهۆی تەوبە و پەشیمانییەوە و پاك کردنەوەی جەستەش بەهۆی خۆ شۆرینەوەیە کەوا ئەو لەمپەر و ڕێگرانە لەناو دەچێ و نامێنێ.

ئەو کەلامەی کە گەلی لوت دەیان وت: ﴿...أَخْرِجُوهُمْ مِنْ قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ سوورەتی ئەعراف ٨٢.

واتە: ((ئەوانە شار بەدەر کەن چونکە ئەوانە کەسانێکن خۆیان پاك ڕادەگرن (داوێن پاکن و وەك ئێمە ناکەن)).

هەروەها ئەم کەلامەی خوای پەروەردگار سەبارەت بە ئەصحابول ئەخدود کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَنْ يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ سوورەتی بروج ٨.

واتە: ((ئـەم ڕق و داخـەیان لـە ئیمانـداران تـەنها لەبـەر ئەوەیـە کـە ئـەوان بـاوەڕی بەتینیان دەهێنا بەخوای باڵادەستی شایستەی سوپاسگوزاری)).

هەروەها سەبارەت بەمە پەروەردگاری مەزن دەفەرموویٚت: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ هَلْ تَنْقِمُونَ مِنَّا إِلَّا أَنْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَاسِقُونَ﴾ سوورەتی مائیدە ٥٩.

واتە: ((ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: ئـەی خاوەنـانی کتێب ئەوە بە چی عەیبدار و لەکەدارمان دەکەن و لێمان تـووڕە دەبن، جگە لەبـەر ئـەوە نەبێت کە ئێمە بڕوای ڕاست و پتەومان هێناوە بە خوا و بەو قورئانەی کـە دابەزیوەتـە خوارەوە بۆ سەر ئێمە و بەوەی کە پێشتر دابەزیوە، یان ئەوەیە کە زۆربـەتان یـاخی و سەرەڕۆ و تاوانبارن؟)).

موشریکیش بەدوای ئەوەوەیە کە لە ئەهلی یەکخواپەرستی بەهۆی نییـەت پـاکی و بیروباوەڕی پاك و بێگەردییانەوە لە هەر جۆرە هاوشێوەیەکی شرك تۆڵە بـسێنێتەوە و ئەو مرۆڤەی ئەهلی تازەگەری و داهێنانە دەیـەوێ. لـە گـەڵ ئەوانـەی کـە پابەنـدن بـە شـەریعەتی پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم) بـەهۆی پـاکی و بێگـەردیان لـە شـوێنکەوتن و تێکـەڵی نـەکردنی لەگـەڵ هــەر جــۆرە بــیرو بۆچـونێکی تـردا و ئـەو کاروبارانەی کە لەگەڵیدا ناکۆك و دژن، دوژمنایەتی و نەیاری هەیە.

خۆڕاگری و تاقـەت و پـشوو درێـژی مرۆڤـی یەکخواپەرسـت و ئـەهلی شـوێنکەوتەی شەریعەت و سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە بەرامبەر دوژمنایەتی و تۆڵە سەندنەوەکانی ئەهلی شرك و تازەگەری تەواو بە سوود و بەکەڵکن بۆی.

ان لم يك بد من الصبر فاصطبر　　على الحق ذاك الصبـر تحمد عقباه

واتە: ((ئەگەر هیچ ڕێگەیەکتان جگە لە ڕێگەی خۆڕاگری لە بەردەما نییـە، ئـەوا لـە ڕێگەی حەقدا خۆڕاگری بکەنە پیشە، چـونکە ئـەو خۆڕاگرییـە ئاکـام و چارەنووسـێکی چاك و لەباری هەیە)).

# بەشی دەیەم

# گەشەسەندن و پاك كردنەوەی دڵ

# تەوەری یەکەم: گەشەسەندن و خاوێنکردنەوەی دڵ

## _ واتای خاوێن کردنەوە "تزكية":

خاوێن کردنەوە لە ڕەگ و ڕیشەی "زكاة" و بە واتای گەشەکردن و بەرەوپێشەوە چوون بە مەبەستی تەواوی و کامڵ بوونە.

پەروەردگاری مەزن دەفەرمووێت: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا...﴾ سوورەتی تەوبە ١٠٣.

واتە: ((لە هەندێ ماڵ و سامانی ئەو ئیماندارانە زەکات و خێر وەربگرە، چونکە دەبێتە هۆی خاوێن کردنەوەی ماڵەکەیان و پاک کردنەوەی دڵ و دەروونیان)).

پەروەردگار لەم ئایەتە پیرۆزەدا پاکی و خاوێنکردنەوە "الطهارة والتزكية" بەهۆی ئەوەی کە پێویست و پێداویستی "لازم و ملزوم" یەکترین پێکەوە باسیانی کردوە.

## _خاوێنکردنەوە دوای پاکییەتی:

نیشانە و شوێنەمای پیسی و ناپاکییەکانی تاوان و سەرپێچییەکان بەسەر دڵەوە، وەکو نیشانە و کاریگەری میکرۆبە بەسەر جەستەوە و هەروەها وەك گژوگیا بێ کەڵك و بێفەڕەکانی نێو مەزرا و کێڵگەکان و ناپاکییەکانی نێو زێڕ و زیو و ئاسنە.

بە هەمان شێوەیەو ڕێژە و ئەندازەی کە جەستە لە میکرۆب و ناپاکی و پیسییەکان پاك بێت، هێز و توانای سروشتی جەستە زیاتر دەکات و سەلامەتی و تەندروستی باشتر دەبێت، بەبێ هیچ لەمپەر و ڕێگری و گرفتێ کاری خۆی ئەنجام دەدات و پەرە بە گەشەسەندن وبەرەوپێشەوە چوونی خۆی دەدات. دڵیش بە هەمان شێوەیە، ئەگەر بەهۆی تەوبە و پەشیمان بوونەوە لە پیسی و خراپی تاوانەکان پاك بکرێتەوە، هێز و توانای دەخرێتە گەڕ و ویست و ئیرادەی دڵ لەپێناو هەنگاو هەڵگرتن بە مەبەستی خێر و چاکەو چاکسازی زیاتر دەبێت و لەدوای ڕاکێشانە لەناو بەرو هۆکارە ناڕەواکان

دەربازی دەبێت، گەشە دەكات و پەرە دەسێنێ و بەهێز و بەتواناو پایەدار و سەقامگیر دەبێ، هەوسار و لغاوی ولاتی جەستە دەگرێتە دەست، كاروبارەكانی خۆی سەبارەت بە ژێر دەستەكانی ئەنجام دەدات و هەموویان پەیرەوی لێ دەكەن.

كە واتە بۆ خاوێن كردنەوە و كامڵ بوونی دڵی مرۆڤ، جگە لە پاكییەتی و پاك كردنەوەی دڵ هیچ رێگە چارەیەكی تر بوونی نییە.

بە هەمان شێوە كە پەروەردگاری گەورە و بە دەسەلات دەفەرمووێت: ﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ سوورەتی نوور ٣٠.

واتە: ((ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە سەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم) هەروەها نامووس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاكتر و پوخت ترە بۆیان (بۆ دڵ و دەروون و ڕوواڵەت و ڕۆح و لەشیان) بە ڕاستی خوا ئاگادارە بەو هەڵس و كەوت و ڕەفتارانەی كە دەیكەن)).

تێبینی دەكرێت كە، خاوێن كردنەوە "تزكية" بە نیشانە و شوێنەمای چاو داخستن و دوور كەوتنەوە لە لادانە ڕەوشتی و ئەخلاقییەكان جێگیر بووە.

## _ سوودەكانی چاو داخستن بەرامبەر كاری حەرام و ناڕەوا:

بەم پێیە ڕوون و ئاشكرایە كە چاو داخستن بەرامبەر بە تاماشا كردنە ناڕەواكان سێ سوودی گەورە و بایەخداری بەدواوەیە.

یەكەم: هەست كردن بە تام و چێژی ئیمان، ئەو چێژ و بەخششەی كە بەهیچ جۆرێ شایانی هەڵسەنگاندن و بەراورد كردن نییە لەگەڵ چێژی ئەو تەماشاكردنەیدا كە لە ئاستیدا چاومان داخستووە.

چونكە هەر كەسێ بە مەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگار واز لە شتێ بهێنێ و ئەنجامی نەدات، پەروەردگار لەوە باشتر و چاكتری پێ دەبەخشێ. نەفسی مرۆڤ

تامەزرۆی تەماشاکردنی دەم و چاو و ڕوومەتە جوانەکانە و چاوەکان نێردراوەکانی دڵن و ڕایان دەسپێرێ بۆ ئاگاداکردنەوەی دڵ لەوەی کە لە دوورەوە دیارە و دەیبینین.

هەرکاتێ دڵیان ئاگادار کردەوە بەبوونی نێو چاو و ئەندامێکی جوان، بۆ چێژ وەرگرتن لە تەماشاکردنی ئەو لێو و چاو و ئەندامە، مەیل و ئارەزوو نیشان دەدات و هەندێ جار سەبارەت بەمە هەم خۆی – دڵ – و هەمیش نێردراوەکەی – چاو – تووشی ناڕەحەتی و گرفت دەکات.

شاعرێك لەم بوارەدا هۆنراوەیەکی هەیە و دەڵێ:

| | |
|---|---|
| وكنت متى ارسلت طرفك رائداً | لقلبك يوماً أتعبتك المناظر |
| رأيت الذي لاكلّه انت قادر | عليه ولا عن بعضه انت صابر |

واتە: ((هەرکاتێ چاوەکانتان وەك دیدەوەر و پێش قەرەوڵانی دڵتان ئازاد و سەربەخۆ بکەن و بەرەڵڵایان بکەن، بینین و تەماشاکردنەکانتان تووشی ماندوو بوون و گرفتان دەکەن، شت گەلێکت بینیوە کە توانای بەدەست هێنانی هەموویانت نییە و لە بەرامبەر هەندێکیشیاندا پشوودرێژی نیشان نادەیت)).

بەڵام هەرکاتێ چاوەکان لە تەماشاکردن و سەیرکردنی ناڕەوا و ڕێگە پێنەدراو و ناپێویست دوورە پەرێزی بکەن، دڵ لە کۆڵی هەم و خەم و هەوڵ و داواکردن ئاسوودە دەبێت، بەڵام هەرکەسێ چاوەکانی بۆ تەماشاکردنی هەرشتێ ئازاد و بەرەڵڵا بکات، تووشی سزا و جەزرەبە و بەدبەختی دەبێت. چونکە تەماشا کردن خۆش ویستنی بەدواوەیە و دڵیش وابەستەی ئەوە دەبێ کە چاو هەواڵی پێداوە و گوزارشتی لێ کردووە و ئەگەر ئەو تەماشاکردنانەی چاو و تامەزرۆبوونانەی دڵیش بەردەوام بێت، دڵ بە تەواوی مانا سەرقاڵی دەبێت و ئەوین و پەیوەندییەکی بەهێزی تێدا دروست دەبێت و سەر هەڵدەدات و هەندێ جار لەوانەیە لەپێناو گەیشتن بەیارەکەی تەواوی دەستهاتە ئیمانی و ئینسانییەکانی خۆی لەدەست بدات و هەندێ جاریش دەست بداتە تاوان و مرۆڤ کوژی خوا پەنامان بدات. بەشێوەیەکی کردەیی ببێتە بەندە و

کۆیلـەی خۆشەویـستەکەی و یارەکـەی، وە خۆشەویـستەکەی ببێتــە پــەروەردگار و پەرستراوی. بە ڕاستی تەواوی ئـەو گێروگرفـت و بـەلاّ و نیشانە و شـوێنەما مـاددییو مەعنەویانەی ئـەم لادانـە لـە تەماشـاو سـەیرکردنە نـاڕەوا و ڕێگـە پـێ نەدراوەکانـەوە سەرچاوە دەگرێ.

لەم بارودۆخەدایـە کـە قاچـی ئـەقڵ و ژیـری دەکەوێتـە داوەوە و لەپلـە و پایـەی دەسەلاّتداری دەکەوێ و بەدیل دەگیرێ و زیندانی دەکـرێ و زمـان بـە هـۆی چـاوەوە دەسـت بـە سـکالاّ و گلـەیی دەکـات! بـەلاّم چـاوەکان پێـی دەڵـێن کـەوا ئێمـە تـەنیا ڕاسپێراوو گوێ بە فەرمانی تۆ بووین و جگە لە کاربەدەست و فەرمان بەرداری خۆمـان کارێکی ترمان نەکردووە!

ئەڵبەتە ئەم بارودۆخە بۆ دڵێ پێش دێت کە خـاڵی بێـت لـە خۆشەویـستی خـودا و پاکی و بێگـەردی بیروبـاوەڕ و کـاروکردەوە، چـونکە سروشـتی دڵ بەجۆرێکـە کـە بـێ گومان دەبێ وابەستە و پەیوەستە بێ بە یار و خۆشەویستێکەوە و ئەگەر پەروەردگار خۆشەویست و پەرستراو و یارمەتی دەری کەسـێ نـەبێ، ڕێگـە چـارەیەك بـۆ دڵ نییـە جگـە لـەوەی کـەوا کەسـێ یـاخود شـتێ بکاتــە خۆشەویـست و پەرسـتراوی خـۆی و بیپەرستێ، خوا پەنامان بدات.

پەروەردگاری گەورە لە بارەی یوسفەوە (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت:
﴿....كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾ سـورەتی یوسـف ٢٤.

واتە: ((ئا بەو شێوەیەمان کرد بـۆ ئـەوەی هەرچـی گونـاه و تـاوان و خراپەیـە لێـی دوور بخەینەوە و بەڕاستی ئەو لە بەندە هەڵبژاردە و پاکەکانی ئێمەیە)).

ئەگەر چی ژنی عەزیزی میسر موشریك بوو و لـە هـەمان کاتیـشدا هاوسـەری هـەبوو قاچی کەوتبوویە ناو داوی هەوا و هەوەسی پیس و ناپاکیەوە! بەلاّم یوسـف (سـەلامی خوای لەسەر بێت) بەهۆی ئیمان و یەکخواپەرستی و نییـەت پـاکی و وێـڕای لاوییـەتی، زگورتی، غەریب و کۆیلە بوون، لەو داوە مەترسیدارە دەرباز و ڕزگاری بوو!

**دووەم: بینایی و بەصیرەتی دڵ و ساغی و سەلامەتی تیژ بیری و تێگەیشتوویی:** باوکی شەجاعی کرمانی دەڵێت: ((هەرکەسێ بەهۆی شوێنکەوتن و پەیڕەوی کردن لە شەریعەت ڕووخسارو ڕواڵەتی خۆی ئاوەدان بکاتەوە و بەهۆی چاودێری بەردەوامەوە دەروون و ناخی خۆی پاك بکاتەوە، نەفسی خۆی لە هەوا و هەوەس دوور بخاتەوە و بیپارێزێ، چاوەکانی لە ئاست نامەحرەم دا دابخات و خوو بگرێ بە جل و بەرگ و خواردنی حەلاڵەوە، بیر تیژی و زیرەکی و وریایی ئەو بەرە و هەڵە ناڕوات)).

پەروەردگاری مەزن ئەو باروودۆخەی کە گەلی حەزرەتی لووتی (سەلامی خوای لەسەر بێت) تێدا بوو باس کردووە و دوای ئەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ﴾ سوورەتی حجر ٧٥.

واتە: ((بێگومان ئا لەو بەسەرهاتەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێك کە پەند و ئامۆژگاری وەرگرن)).

ئەوانە ئەهلی بیر تیژی و تێگەیشتنێکن کە خۆیان لە تەماشا کردنو کاروکردەوەی پیس و ناپاك پاراستووە و دوور خستووەتەوە، پەروەردگاری مەزن دوای فەرمان دان بە ئەهلی ئیمان بۆ دووری کردن لە تەماشاکردنە حەرام و کاروکردەوە خراپ و ناکۆکەکانی پاك داوێنی و ڕەوشت بەرزی دەفەرمووێت: ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ....﴾ سوورەتی نوور ٣٥.

واتە: ((خوا نوور و ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوییە (نوور و ڕووناکی بەخشە پێیان)).

نهێنی و ڕازی ئەم بابەتە لەوەدایە کە پاداشت لەجۆری کاروکردەوەیە و هەر کەسێ چاوی خۆی بنووقێنێ بەرامبەر ئەو شتانەی کە پەروەردگار تەماشا کردنیانی حەرام و قەدەغە کردووە، خوای گەورە پاداشتێکی زۆر باشتری پێ دەبەخشێ و بە هەمان شێوە کە ڕووناکی و بۆشایی چاوەکانی لە حەرامەکان پاراستووە، پەروەردگار ڕووناکی و ڕۆشنایی بینایی و بەصیرەتی دڵی ئەو دوو چەندان دەکات و کاروبار و شت گەلێ دەبینێ کە ئەوانەی سەیری نامەحرەمیان کردوە هیچ کاتێ ئەوە نابینن.

ئەمە ڕاستییەکە کە مرۆڤ هەستی پێ دەکات، چونکە دڵی مرۆڤ وەك ئاوێنە و هەواو هەوەسیش وەك ژەنگی ئاوێنەکە وایە، وەك چۆن کە ئاوێنەیەك لە ژەنگ و تەپوتۆز پاك بکرێتەوە، نێو چاوانی ڕاستەقینە بە هەمان شێوە کە هەیە تیایدا بەدیار دەکەوێت و وەك خۆی دەبینرێ. بەڵام ئەگەر ئاوێنە پیس و ژەنگاوی بێت، وێنە و دەموچاوی ڕاستەقینەی شتەکان بە ڕوونی تێیدا نابینرێن و دڵێکیش کە بەهۆی تەماشا کردنە هەوەس پیسەکانەوە، تووشی ناپاکی و ژەنگاوی بوون هاتبێ، کەلام و کردەوەی سەرچاوەگر لێی گوماناوی و گۆترە دەبن.

**سێیەم:** توانایی و بەرقەراری و لێهاتوویی دڵ: بە هەمان شێوە کە پەروەردگار بە هۆی ڕووناکی و ڕۆشنایی خۆی دڵی بە بینین و بەصیرەت بەهرەمەند کردووە، لە ڕێگەی گەشەپێدان و بەهێزکردنیشەوە لەپلەوپایەی سەرەك وەزیری و میرایەتی کردنی وڵاتی ئادەمی جێگیر دەکات و لە هەردوو هێزەکە بەهرەمەندی دەکات و لەم جۆرە بارودۆخەدا شەیتانەکان بەتوندی لێی ڕا دەکەن و دوور دەکەونەوە، بە هەمان شێوەیە کە لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە: ((کەسێ کە لەگەڵ هەوا وهەوەس وئارەزووەکانی خۆیدا دژایەتی و بەربەرەکانێ بکات،شەیتان لە سێبەر و گەورەیی و شکۆمەندی ئەو دەلەرزێ)).

## _ پەستی و زەبوونی سەرپێچی کردن و سەرفرازی پەیڕەوی کردن:

یەکێ لە یاسا ونەریتە نەگۆڕەکانی پەروەردگار ئەوەیە کە، ئەهلی تاوان و سەرپێچیکەر (پەست و زەبوون و کەساس) دەکات و ئەهلی شوێنکەوتوان و پەیڕەوی کەرانیش سەرفراز و سەربڵند دەکات.

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەلات دەفەرموێت: ﴿...وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ سوورەتی مونافیقون ٨.

واتە: ((ئەو دووڕووانە نازانن کە: عیززەت و دەسەلات و پایەداری هەر شایستەی خوا و پێغەمبەرەکەی و ئیماندارانە)).

هـەورەها فەرموویـەتی: ﴿وَلَـا تَهِنُـوا وَلَـا تَحْزَنُـوا وَأَنْـتُمُ الْـأَعْلَوْنَ إِنْ كُنْـتُمْ مُـؤْمِنِينَ﴾ سوورەتی ئالی عیمران ١٣٩.

واتە: ((ئەی ئیمانداران كۆڵ مەدەن و سارد مەبنەوە و خەفەت مەخۆن، چونكە ئێوە سەربەرز و سەرفراز و سەركەوتوترن، ئەگەر ئیمانداری چاك و ڕاست و درووست بن)).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا...﴾ سوورەتی فاتر ١٠.

واتە: ((ئەوەی سەربەرزی و پایە بڵندی دەوێ، با بزانێت كـە هـەموو سـەربەرزی و پایە بڵندییەك هەر بۆ خوایە)).

واتـە هەركەسـێ بـە دوای سـەرفرازی وسـەربەرزییەوەیە، بـا بەپـەیڕەوی كـردن لـە پەروەردگار لە ڕێگەی كـەلامی درووسـت و كـاری چـاكە و باشـەوە، بەدوایـدا بگـەڕێ و پەیدۆزی بكات.

هەنـدێ لـە پێـشینەكان وتوویانـە: ((هەنـدێ لـە مرۆڤـەكان بـۆ بەدەسـت هێنـانی سـەرفرازی و سـەربەرزی، لـە بـری ڕووكـردن و ڕۆیـشتن بـەرەو پـەیڕەوی كـردن لـە خوداوەنـد، بـە هەڵـە ڕوو دەكەنـە دەسـەڵاتداران و پارەدارەكـان و بـەدوای ئەوانـدا دەگەڕێن و شوێنیان دەكەون!؟)).

ئیمامی حەسەن (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ((ئەگـەر تاوانبارەكـان سـواری هەسپی خۆشبەز و خۆش ڕۆش بن و تاوی بدەن، پەستی و زەبوونی تاوان و سەرپێچی هەر بەو چەشنە لەدڵیاندا جێگیر دەبێت، چونكە ویستی پەروەردگار لەسەر ئەوەیە كە سـەركێش و تاوانبارەكـان پەسـت و بـچووك بكاتـەوە و كەسـانێ كـە گوێڕایـەڵی فەرمانەكانی ئـەون و پـەیڕەوی لێ دەكـەن، سـەربەرز وسـەرفرازیان بكـات، بـە هـەمان شێوە كە لە نزا و پاڕانەوەی (قنوت)ـدا هـاتووە: ((**انـه لايـذل مـن واليـت ولا يعـز مـن عاديت**)). واتە: ((بە ڕاستی ئەو كەسەی كە تۆ سەرپەرشتی بكـەی پەسـت و زەبـوون نابێ و هەر كەسێكیش كە تـۆ لـە گەڵیـدا دوژمنـی و نـەیاری بكـەیت بـە سـەربەرزی و سەرفرازی ناگات)).

## _ پێش مەرجی خاوێن کردنەوەی دڵ:

مەبەست ئەوەیە کە خاوێنکردنەوەی "تزکیة" دڵ، مەرجدارە بە پاک کردنەوەی "تطهير" دڵ، درووست بە هەمان شێوە کە گەشەکردنی جەستەی مرۆڤ، مەرجدارە بە پاک بوونی جەستەی لە نەخۆشی و کەم و کورپییەکان.

پەروەردگاری گەورە و بەدەسەڵات دەفەرموێت: ﴿...وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ سورەتی نور ٢١.

واتە: ((ئەگەرفەزڵ و میهرەبانی خوا نەبووایە لە سەرتان، ئەوە هەرگیز کەستان پاک و پوختە و ڕزگار نەدەبوون (لەدەست بوختان چییەکان، یاخود بە تەوبە پاک نەدەبوونەوە) بەڵام خوا هەرکەسێکی بوێت و شایستە بێت، پاک و پوختەی دەکات و لە گوناهەکانی دەبووڕێت، خوایش هەمیشە بیسەر و زانایە (بە تەوبە و پەشیمانیتان و بە نییەتی دڵ و دەروونتان)).

پەروەردگاری گەورە دوای باس کردنی حەرام بوونی زینا و بوختانی نامووسی و شەرەف و هاوسەرگیری لە گەڵ زیناکەردا، ئەو ئایەتەی باسکردووە و خستنەڕووی ئەم ڕاستییەیە کە خاوێن کردنەوە لە ڕێگەی دوورکەوتنەوە لەو جۆرە کاروبارانە دێتە دی.

هەروەها پەروەردگاری مەزن سەبارەت بەپێویستی مۆڵەت خواستن لە خاوەن ماڵ لەکاتی چوونە ژوورەوەدا فەرموویەتی: ﴿...وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ سوورەتی نوور ٢٨.

واتە: ((مەچنە ژوورەوە هەتا مۆڵەت نەدرێن، ئەگەر پێتان وترا بگەڕێنەوە (کاتمان نییە، یا کارمان هەیە) بگەڕێنەوە (بەبێ دڵگرانی) ئەوە چاکترە بۆتان، چاکیش بزانن کە خوا زانایە بە هەموو ئەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی ئەدەن)).

چونکە کەسانێ کە دەیانەوێ بچنە نێو ماڵانی خەڵکانی ترەوە و ئەگەر مۆڵەتی چوونە ژوورەوەیان پێ نەدرا بەهۆی دوور کەوتنەوەیان لە بینینی ئەوەی کە بینینیان بۆ ئەوان ناڕەوا و نادرووستە، گەڕانەوەیان دەبێتە هۆی پاکی و گەورەیی ئەوان.

هەروەها پەروەردگاری گەورە و بەدەسەلات دەفەرموویت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى (١٤) وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى﴾ سوورەتی ئەعلا ١٤ – ١٥.

واتە: ((بێگومان ئەو کەسە سەرفرازە کە دەروونی خۆی پاك ڕاگرتووە و ناوی پەروەردگاری دەبات و نوێژی بۆ دەکات و کڕنووش و سوژدەی بۆ بردووە)).

پەروەردگار گوتە و قسەکەی حەزرەتی مووسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) کە بە فیرعەونی فەرموو باسی فەرمووە کە دەفەرموویت: ﴿فَقُلْ هَلْ لَكَ إِلَى أَنْ تَزَكَّى﴾ سوورەتی نازعات ١٨.

واتە: ((پێی بڵێ: باشە ئەوە ناکرێت دڵ و دەروون و کردار و ڕەفتارت پاك و جوانو پوختە بێت؟)).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿...وَوَيْلٌ لِلْمُشْرِكِينَ (٦) الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ...﴾ سوورەتی فوصیلەت ٦ – ٧.

واتە: ((چاك بزانن کە، وەیل و سزای سەخت بۆ موشریك و هاوەڵگەران ئامادەیە، ئەوانەی کە زەکات نادەن)).

زۆربەی ڕاڤەکەران و ئەوانەی کە دوای ئەوانیش بوون، لەسەر ئەم باوەڕەن کە: مەبەست لە "زکاة" لەم ئایەتەدا یەکخواپەرستی و شایەتی دانە بە (لا الە الا اللە)و ئیمان و باوەڕێکە کە دەبێتە هۆی خاوێن کردنەوەی دڵ، چونکە یەکخواپەرستی بە مانای دوورکەوتنەوە و لادانی دڵ و کردەوەی ئولوهییەتی غەیرە پەروەردگارە و تەنیا بەم شێوە پاکییەتی ئەو دێتە دی و دەستەبەر دەبێ و ئولووهییەتی ئەو بەسەر دڵ و ژیانی خۆیدا پتەو و پایەدار دەکات. ئەمە بنچینە و بناغە و بنەمای هەر جۆرە گەشەسەندن و کامڵ بوونێکە.

"تزكية" هەر چەندە لە بنچینەدا بە واتای زیاد كردن و گەشەكردن و زۆرییە، بەڵام تەنها دوای لەناو بردنی بەلاّ و لەمپەرەكانەوە بەدەست دێت. كورتەی قسەكە ئەمەیە كە یەكخواپەرستی "توحید"، بنچینە و بناغەی تەواوی ئەو شتانەیە كە دەبنە هۆی خاوێن كردنەوە و گەورەكردنی دڵی مرۆڤ.

## _ جیاوازی نێوان خاوێن كردنەوەی نەفس و خۆ بە خاوێن زانین:

تزكیة بە واتای خاوێن كردنەوە و پاك كردنەوەی شتێ دێت، ئەم پاك كردنەوەیە یا لە خودی مرۆڤدا (دەروونی مرۆڤدا) دێتە دی یاخود تەنیا لە زانست و هەواڵ دانیدا، كە لە بارەیەوە قسە دێتە ناوەوە.

لەسەر ئەم ئەساسەیە كە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿...فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ...﴾ سوورەتی نەجم ۳۲.

واتە: ((كە واتە خۆتان بە چاك مەزانن و خۆتان بە پاڵفتە دامەنێن)).

كە مانای ئەوە جیاوازە لە گەڵ مانای ئەم ئایەتەدا كە دەفەرمووێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا﴾ سوورەتی شەمس ۹.

واتە: ((بە ڕاستی ئەو كەسە سەرفرازە كە نەفسی پاك و پوختە كردووە و ئیمان و ترسی خوای تیادا ڕوواندووە)).

واتە باس لە پاكی و ناپاكی دڵ مەكەن لەلای خەڵكی! وە خۆتان هەڵمەكێشن كەوا ئەهلی تەقوا و خاوێنین! چونكە دوای ئەوە دەفەرمووێت: ﴿...هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى﴾ سوورەتی نەجم ۳۲.

واتە: ((هەر خوا خۆی دەزانێت كێ تەقوای هەیە و پارێزكارە)).

ناوی زەینەب (هاوسەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم) پێشتر"بَرَّة" واتە پاك و چاكەكار بوو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) فەرمووی: ئەم ناوە

گوزارشت لەپاکی و چاکەکاری ئەو دەکات، بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناوی نا زەینەب و فەرمووی: ((**الله اعلم بأهل البر منكم**)).[٥٩]

واتە: ((پەروەردگار خۆی باشتر چاکان و پاکەکانتان دەناسێ)).

هەروەها ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمْ...﴾ سوورەتی نیسا ٤٩.

واتە: ((ئایا نەتڕووانیوەتە ئەو کەسانەی کە خۆیان بە چاك دەدەنە قەڵەم (دەڵێن ئێمە هەڵبژاردەی خواین)!؟)).

واتە باوەڕیان بە خاوێن بوونەوە و گەشەکردنی نەفسی خۆیان هەیە و بۆ خەڵکانی تری باس دەکەن و هەروەها کەسانێکی تر کە لە بارەیانەوە شایەتی بدەن خۆشیان باسی خۆیان دەکەن و خۆیان هەڵدەکێشن.

دوای ئەوە پەروەردگاری مەزن دەفەرموێت: ﴿...بَلِ اللَّهُ يُزَكِّي مَنْ يَشَاءُ...﴾ سوورەتی نیسا ٤٩.

واتە: ((ئەوە وانییە، بەڵکو خوا (بەندەکانی دەناسێت)و هەر کەس شایستە بێت پەسەندی دەکات)).

واتە ئەوە پەروەردگارە کە کەسێ لە سەر ڕێگەی گەشەکردن و گەورەبووندا جێگیر دەکات و لەبارەیەوە قسە دەکات.

ئەو بابەتە لە بەرامبەر ئەم فەرموودەیەی پەروەردگاردا جێگیر بوون کە دەفەرموێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا﴾ سوورەتی شەمس ٩.

واتە: ((بە ڕاستی ئەو کەسە سەرفرازە کە نەفسی پاك و پوختە کردووە و ئیمان و ترسی خوای تیادا ڕواندووە)).

وە ئەمەی کە دەفەرموێت: ﴿هَلْ لَكَ إِلَى أَنْ تَزَكَّى﴾ سوورەتی نازعات ١٨.

واتـه: ((پێـی بڵـێ: باشـه ئـەوە ناکرێـت دڵ و دەروون و کـردار و ڕەفتـارت پـاك و جوانو پوختە بێت؟)).

واتە گوێڕایەڵی و پەیڕەوی لە فەرمانی پـەروەردگار بکـەن، تـاکو بەهۆیـەوە خـاوێن ببنەوە. وە ئایەتی:﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى﴾ سوورەتی ئەعلا ١٤.

واتە: ((بێگومان ئەو کەسە سەرفرازە کە دەروونی خۆی پاك ڕاگرتووە)).

بەم جۆرەیە.

## _ واتـای ئـایەتی﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا﴾:

سەبارەت بە جێناوی بکەری نادیار لە کاری " **زَكَّاهَا** " **بیروڕای جیاواز هەیە هەندێ** دەڵێن: بۆ پەروەردگار دەگەڕێتـەوە، واتـە نەفـسێ کـە خوداوەنـد پـاکی بکاتـەوە، بـە ڕاستی ڕزگاری بووە و نەفسێکیش کە خوداوەند بە حاڵی خـۆی جێـی بهێڵـێ و پـشت گوێی بخات و بیشارێتەوە، تێشکاو و دۆڕاو و بێ هیوا دەبێت.

هەندێکی تر دەڵێن: بۆ جێناوی کاری "أفلح" کە وشەی "من"ـــــــە دەگەڕێتەوە، فەرق ناکات.مەوصول بێ یاخود موصوف "ئاوەڵنـاو" چـونکە ئەگـەر ئـەو جێنـاوە بـۆ پەروەردگار بگەڕایەتەوە، دەیفەرموو: ((**قد أفلح من زكاه وقد خاب من دساه**)).

خاوەنی بیروبۆچوونی یەکەم دەڵێن: وشەی "من" ئەگەر چی دەربڕینەکە نێرینەیە، بەڵام ئەگەر بۆ مێ بەکار هاتبا، دەتوانرێ بۆ ڕەچاوکردنی واتاکەی جێناوی مێینەی بۆ بەکار بێنین و یاخود بۆ ڕەچاوکردنی دەربـڕین دەتـوانین جێنـاوی نێرینـەی بـۆ بـەکار بهێنین و هەردووکیان بەکارهێنانیان پێچەوانەی زمان پاراوییە. لـە قورئـانی پیـرۆزدا هەردووکیان واتە گەڕانەوەی جێناو بە مەبەستی دەربڕین و یاخود گەڕانـەوەی ئـەو بـە مەبەستی واتا هاتووە:

سەبارەت بـە دۆخـی یەکـەم ئـەم ئایەتـە هـاتووە: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ...﴾ سوورەتی ئەنعام ٢٥.

واتە: ((هەندێکیش لەو بێ باوەڕانە گوێت بۆ دەگرن (لە کاتی خوێندنی قورئاندا))).

سەبارەت بە دۆخی دووەم هاتووە كە: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ...﴾ سوورەتی یونس ٤٢.

واتە: ((لەو بێ باوەڕانە كەسانێك هەیە گوێت بۆ هەڵدەخات (كاتێك قورئان دەخوێنیت))).

ئەوانەی كە بۆچوونی یەكەم بە باشتر دەزانن. بۆ سەلماندنی قسەكەیان پشت دەبەستن بەو فەرموودەیەی كە ئەهلی سووننەت لە ئیبن ئەبی مەلیكەوە و ئەویش لە دایكی موسڵمانانەوە خاتوو عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) گێڕاویانەتەوە: عائیشە فەرموویەتی: ((شەوێك هاتمەوە ماڵەوە، بیستم كەوا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەكاتی نزا و پاڕانەوەدایە و دەفەرمووێت: ((**رب اعط نفسی تقواها، وزكها، انت خیر من زكيها، انت وليها ومولاها**)).[٦٠]

واتە: ((پەروەردگارا! خۆپاراستن و پارێزگاری ببەخشە بە نەفسم و خاوێنی بكەوە! چونكە چاكترین پاك كەرەوە و گەورە و سەرداری ئەوی!)).

لە ڕوانگەی خاوەنانی بۆچوونی یەكەم: ئەم فەرموودەیە ڕاڤەی ئەو ئایەتەی كردووە و ئەمە خوایە كە نەفسی خاوێن دەكاتەوە و لە ئاكامدا لە ئاراستە و ئاسۆی گەشەكردن و گەورە بووندا جێگیر دەبێ. واتە پەروەردگار خاوێن كەرەوە و مرۆڤیش خاوێن كراوەیە. جیاوازی نێوان ئەم دووەش وەك جیاوازی نێوان بكەر "فاعل"و نیشانە و كاریگەری كارەكەیە "فعل".

ئەوان دەڵێن: ئەوەی كە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە و خاوێن بوونەوەی "تزكیە" داوەتە پاڵ مرۆڤ لەسەر ئەساس و بنەمای واتای دووەمە. نەك یەكەم. بە هەمان شێوە كە دەفەرمووێت: ﴿فَقُلْ هَلْ لَكَ إِلَى أَنْ تَزَكَّى﴾ سوورەتی نازعات ١٨.

واتە: ((پێی بڵێ: باشە ئەوە ناكرێت دڵ و دەروون و كردار و ڕەفتارت پاك و جوانو پوختە بێت؟!)).

واتە ئایا ڕێگەی خاوێن بوونەوە لەلایەن خوداوەندەوە قبووڵ دەكەن تاكو پاك ببنەوە؟.

---

٦٠ اخرجه مسلم بەژمارە (٢٧٢٢).

دەڵێن: حەق و چاکە ئەمەیە، چونکە هەرکەسێ پەروەردگاری خاوێنی نەکاتەوە، دەرباز و ڕزگاری نابێ، ئەمە بۆچوونی ئیبن عەبباس و ڕاڤەکەران و موفەسیرانی قورئانە و لە گێڕانەوەیەکدا لە باوکی تەلحە و عەتاو کەلبییەوە، ئیبن عەبباس دەڵێت: ((کەسێ ڕزگاری بووە کەوا پەروەردگار نەفسی ئەوی پاک کردبێتەوە)).

ئیبن زەید و ئیبن جەریر دەڵێن: ((کەسێ ڕزگار و قوتاری دەبێ، کە پەروەردگار نەفسی پاک بکاتەوە و خاوێنی کاتەوە)).

ئەوان دەڵێن: ئەم فەرموودەیەی پەروەردگار لە سەرەتای سوورەتەکەوە شایەتی لە سەر درووستی ئەم بۆچوونە دەدات کە دەفەرمووێت: ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ سوورەتی شەمس ٨.

واتە: ((جا توانای خراپە و چاکە و خوا نەناسی و خواناسی تێدا دابین کردووە)).

هەروەها پەروەردگار ئەم ڕاستییەی کە درووستکەری نەفس و سیفەتەکانیەتی، باسکردووە و واتای "تسویە" ئەمەیە.

خاوەنانی بۆچوونەکەی تریش دەڵێن: ڕووواڵەتی ئایەتەکە و ڕێک و پێکی درووستی ئەو دەربڕی گەڕانەوەی جێناوی "زکاها"یە بۆ وشەی "من". واتە کەسێ ڕزگار و قوتاری دەبێ کە نەفسی خۆی خاوێن و پاک بکاتەوە. مانایەکیتر کە زوتر بە بیردا دێتو لەوانەیە جگە لەوەش مانایەکی تر لە ئایەتەکە بەدەست نەیەت، ئەمەیە. ئەوان دەڵێن "نفس" مێینەیە، ئەگەر ئەو جێناوەی کە لە "زکاها" دایە بۆ یەزدان بگەڕایەتەوە و پێکهاتەی قسەکە (کەلامەکە) بەم جۆرە دەبوو کە ((**قد أفلحت نفس من زكاها**)).

واتە: نەفسی کەسێ کە خاوێنی کردبێتەوە ڕزگارو قوتار بووە.

یاخود (افلحت من زكيها)

واتە: ((کەسێ کە خاوێنی بکاتەوە، دەربازی بووە)).

چونکە "من" بۆ "نفس" دەگەڕێتەوە.

هەروەها وتوویانە: ئەگەرچی بەهۆی وشەی "من"ـەوە هێنانی کاری "فعل" بەبێ تای مێینە ڕێگە پێدراوە، بە هەمان شێوە کە دەڵێن: ((**قد أفلح من قامت منكن**)).

ئەمە کاتێکە کە گرفت و هەڵەیەك نەبێتە هۆکار و ڕێگر، بەڵام ئەگەر وای لێهات، هیچ ڕێگە چارەی جگە لە چارەسەرکردنی ئەو بوونی نییە.

هەروەها ئەوان دەڵێن: "من" بە واتای "الذی"، ئەگەر دەوترا ((**قد افلح الذی زكاها الله**)) ڕێگە پێنەدراو نەبوو چونکە لەم کاتەدا جێناوی مێیینە بۆ "الذی" دەگەڕایەوە.

دەڵێن پەروەردگاری گەورە و مەزن ویستوویەتی کەوا ڕزگاری و قوتار بوون بداتە پاڵ کەسێ کە خۆی – خودی مرۆڤەکە – نەفسی خۆی پاك وخاوێن بکاتەوە، لە بەر ئەمەیە کە کاری "زكاها" بە تائی مێیینەی نەهێناوەتەوە (ة)و وشەی "من" کە بە مانای "الذی"یە هێناوییەتی و زۆربەی ڕاڤەکەران و موفەسیرەکان تەنانەت ئیبن عەبباسیش ئەم بۆچوونەیان پەسەند کردووە.

قەتادە دەڵێ: ((**قد أفلح من زكاها**))

واتە: ((هەرکەسێ کارێکی چاکە ئەنجام بدات و پەیڕەوی لە پەروەردگار بکات، بەڕاستی لە ڕێگەی پاك کردنەوەی نەفسیدا هەنگاوی هەڵگرتووە و چاکسازی تێدا کردووە و هانی داوە بۆ پەیڕەوی کردن و گوێڕایەڵی کردن لە پەروەردگار و هەرکەسێ نەفسی بەرەو سەرپێچی کردن و نافەرمانی پەروەردگار هان بدات، تووشی شکست و زەرەر و زیان بووە)).

ئیبن قوتەیبە دەڵێت: ((واتای ئایەتەکە ئەمەیە کە: هەرکەسێ نەفسی خۆی خاوێن بکاتەوە، واتە بەهۆی پەرستش و پەیڕەوی کردنی پەروەردگار و چاکە و چاکەکاری لە ئاراستەی گەشەکردن و بەرەو پێشەوە چووندا جێگیری بکات، ڕزگار و کامەران و بەختەوەر بووە)).

**((وقد خاب من دسها))**

واتە کەسێ کە بەهۆی تاوان و سەرپێچی کردن و وازهێنان و دوورکەوتنەوە لەگوێڕایەلی کردنی پەروەردگار نەفسی خۆی لاواز و ناتەواو کرد و لێهاتوونەبوو تووشی زەرەر و زیان و بێ هیوایی بووە.

مرۆڤی ئەهلی خراپە و خراپەکاری (فسق و فجور)، مرۆڤی بێ ناو و نیشان، خاوەنی کەسایەتییەکی نادیار و شاراوەیە و هەمیشە تووشی کەساسی و پەرێشانی و سەردانەواندن دەبێ. کەسێ کە تووشی تاوان و گوناح دەبێت، کەسایەتی خۆی پیس و سست و لەناو دەبات.

بەلآم مرۆڤە پاك و خۆ پارێزەکان نەفسی خۆیان لە ئاراستەی گەشەکردن و گەورە بووندا جێگیر دەکەن و پەرە بە تواناکانیان دەدەن و تواناکانیان دەردەخەن.

پیاوچاك و کەڵەپیاوەکانی عەرەب بەسەر بەرزاییەکانەوە ماڵەکانیان درووست دەکرد، تاوەکو هەژار و بێ نەواکان ماڵەکانیان ببینن و بۆ چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکانیان سەردانیان بکەن، تەنانەت بە شەویشدا بۆ رێنموونی کردنی موسافیر و رێبوارەکان لەپاڵ ماڵەکانی خۆیاندا ئاگریان دەکردەوە ! ؟.

بەلآم مرۆڤە کەساس و سەرلێشێواو و تاوانبارەکان، شوێنە چەپەڵ و نادیار و قووڵەکانیان دەکرِی، تا کەسێ ماڵەکانیان نەدۆزێتەوە و داوای شتێکیان لێ نەکات.

ئەوان – پیاوچاك و کەڵە پیاوەکانی عەرەب – نەفسی خۆیانیان پاك و بەرز کردووەتەوە، بەلآم ئەمان – مرۆڤە کەساس و سەرلێشێواوەکان و تاوانبارەکان – نەفسی خۆیانیان پیس کردووە و دەیشارنەوە. ! ئەوانەی کە باس کران و خرانەڕوو دوو بۆچوون و ڕاڤە و تەفسیری ناودار بوو لە بارەی ئایەتی﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا﴾، بەلآم بۆچوون و ڕاڤەی سێیەمیش هەیە کە دەڵێ: ((مانای ئایەتەکە بەم جۆرەیە کە هەرکەسێ خۆی بە پیاوچاك و چاکەکار لە قەڵەم بدات و لەوان نەبێت، تووشی زەرەر و زیان و بێ هیوایی دەبێت)).

واحدی ئەمەی گێڕاوەتەوە و دەڵێ: ((واتە ئەو لە نێوان چاکەکاران و صالحەکاندا خۆی شاردووەتەوە و دەیەوێ خەڵکی ئەویش بە پیاوچاك و پارێزکار و چاکەکار لە قەڵەم بدات، لە کاتێکدا کە ئەو لەو رێگەیەدا نییە کە پیاوچاکان و کەسەپاکەکانی تێدا جێگیرە و هەنگاوی تێدا هەڵدەگرن)).

ئەگەر چی ئەم بۆچوونە خۆی لە خۆی دا ڕاست و درووست و حەقە، بەڵام ئەمەی کەوا مەبەستی ئایەتەکە ئەوە بێ، جێگەی مشت ومڕو ڕاوبۆچوونە، تەنیا لە ڕێگەی گشتگیری ئایەتەکەوەیە کە ئەم جۆرە واتایەش دێتە ناوەوە.

چونکە کەسێ کە نەفسی خۆی بە خراپەکاری و گەندەڵکاری دەشارێتەوە، هەر کاتێ لە گەڵ ئەهلی خێر و چاکەدا هاوڕێ بێت و دابنیشێت، هەوڵ دەدات کەوا لە نێوانیاندا جێ و شوێنی خۆی بکاتەوە. خوا پەنامان بدات لەو سیفەتە.

((دڵ تەنیا کاتێ لەخۆشبەختی، تـام و چـێژ، بەخـشش و خێـر و چـاکە بەهرەمەنـد دەبێ کە، تەنیا پەروەردگار بە دروستکەر، خولقێنەر، پەرستراو و ئامانجی ویستراوی خۆی لە قەڵەم بدات و لە هەموو شتێ زیاتر ئـەوی خـۆش بـووێ و خۆشەویـستی بـۆی هەبێ)).

## تەوەری یەکەم: خۆشبەختی ڕاستەقینە کامەیە؟

### _ دەستکەوتی گشتی لە قازانج و زەرەر:

ئـەم بابەتـە زۆر ڕوون و ئاشـکرایە، کـە تـەواوی بوونـەوەر و دروسـتکراوەکان چ مەلائیکە و چ مرۆڤ و چ جنۆکە و چ ئاژەڵ، پێویستیان بە بەدەست هێنـانی سـوود و قازانج و لابردن و دوورخستنەوەی زەرەر و زیان هەیە.

بەڵام ئەمە کاتێك گونجاوە کـە ئەوانـە هەسـتکردنێکی گونجاویـان سـەبارەت بـە سوودو زیان هەبێت، بە وەبیرهێنانەوەی ئەم خاڵە کەوا سوود و بەرژەوەندی لە جۆری خۆشی و کەیفخۆشییە و تام و چێژ و زەرەر و زیـانیش لـە جـۆری دەرد و ئـازارە، بـۆ هەبوونی هەستکردنێکی درووست لەبارەی قازانج و زەرەر و زیان، ڕووکردن بـەرەو دوو بابەت پێویست و گرنگە:

**یەکەم:** ناسـینی ئـەو شـتەی کـە ویـستراو و خۆشەویـستە و قـازانج و کـەڵکێکی لێ بەدەست دێت و دەرك کردن و ناسینی تام و چێژێکی بەدواوەیە.

**دووەم:** ئامراز و هۆکارگەلێ کە هاوکاری و ئاریکاری مـرۆڤ دەکـات بـۆ گەیـشتن بـەو ناسین و ئاشنایەتییە.

لە بەرامبەر ئەو دوو بابەتەشدا دوو بابەتی تر تەرح دەبن:

**یەکەم:** کارووباری ناپەسەند و زەرەردەر.

**دووەم:** ئامراز و هۆکارگەلێ کە دەبنە ڕێگر و لەمپەر لـە بـەردەم ناسـینی بەکـەڵك و زەرەردەر.

لە ئەنجامدا ئێمە سەبارەت بەمە ڕووبەڕووی چوار بابەت دەبینەوە:

**یەکەم:** بابەتێکی خۆش، ویستراو و بەسوود.

**دووەم:** بابەتێکی ناپەسەند و نەویستراو و زەرەردەر.

**سێیەم:** هۆکاری گەیشتن بەکاروباری دڵڕفێن و ویستراو.

**چوارەم:** ئامراز و هۆکاری چارەسەرکردنی کاروباری ناپەسەند و نەویستراو.

ئەم چوار بابەتە نەتەنیا بۆ مرۆڤەکان، بەڵکو بۆ بوونەوەرەکانی تریش زۆر پێویستو گرنگن و مایەی ژیانن و بوون و بەرژەوەندی ئەوان بەبێ ڕەچاوکردن و ڕووکردنە ئەو کاروبارانە ئەگەری نییە.

## _ پەیوەندی ئەم کاروبارانە بە پەروەردگارەوە:

کاتێ کە گرنگی ئەو کاروبارانە بەدیار کەوت بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە، ئامانجی ویستراو و مەبەستی کۆتایی بۆ ئەهلی ئیمان، پەرستش و نزیک بوونەوە و بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگارە و هەر خوایشە کەوا هاوکاری و ئاریکاری مرۆڤ دەکات بۆ گەیشتن بەم ئامانجە.

بەڵام بەندایەتی کردن و نزیك کەوتنەوە و هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی جگە لە ڕەزامەندی خوا، هەمان ئەو مەسەلە و بابەتە زەرەردەر و لەناو بەرەیە کە لە خاڵی بەرامبەریدا جێگیرە و ئامادەیە. پەروەردگار خۆیشی (لە ڕێگەی ڕێنموونی و هاوکاری کردنەوە) مرۆڤ بۆ دوورکەوتنەوە لێی هاوکاری و ئاریکاری دەکات. لەبەر ئەوەیە کە پەروەردگاری مەزن کۆکەرەوە و گردکەرەوەی تەواوی ئەو کاروبارە چوار لایەنانەیە و جگە لەویش بەهیچ جۆرێ وەك ئەمە نییە.

= پەروەردگار خۆی خۆشەویست، پەرستراو و مراز و مەبەستە.

= خوا هاوکاری و یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ بەجێهێنانی ئەرکی بەندایەتی و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خۆی.

= ناڕەوا و ناپەسەند هەمان ئەو شتەیە کە ویست و حیکمەتی ئەو دەیخوازێ و دەیەوێ.

= وە هەر خوداوەندیشە کە لە ڕێگەی ڕێنموونی کردن و حیکمەتی و کارزانی خۆیەوە هاوکاری مرۆڤ دەکات بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لە گەڵ ئەو کاروبارە ناپەسەندانەدا.

بە هەمان شێوە کە خواناسترین مرۆڤ (موحەممەد - صلی الله علیە وسلم) بە پەروەردگار دەفەرمووێت: ((**أعوذ برضاك من سخطك واعوذ بعافاتك من عقوبتك واعوذ بك منك**)).[٦١]

واتە: ((پەروەردگارا ! لە تووڕەبوونت بە ڕەزامەندیت و لە سزا و جەزرەبەکانت بە لێبوردنت و لەخۆت بە خۆت پەنا دەگرم و هاوارت لێ دەکەم)).

هەروەها فەرموویەتی: ((**اللهم انی اسلمت نفسی الیك، ووجهت وجهي الیك وفوضت امري إلیك، وألجأت ظهری الیك، رغبة ورهبة إلیك، لاملجأ ولامنجی منك الا الیك**)).[٦٢]

واتە: ((پەروەردگارا ! خۆم داوەتە دەست تۆ و ڕووم کردووەتە تو کاروبارەکانم سپاردووە بەتۆ و بە مەیل و ئارەزووی خۆم پەنام بۆ تۆ هێناوە (بۆ قوتار بوون و دەرباز بوون لە تووڕەیی و سزات) هیچ پەناگە و ڕێگەیەکی دەرباز بوون بوونی نییە جگە لە پاڵ تۆدا نەبێ)).

سایە و پەناو ڕزگاربوون لە تەواوی خراپە و گومڕاییەکان تەنیا لە (یەکخواپەرستی، ڕووتێکردن، پشت بەستن و بەندایەتی کردنی) پەروەردگاردایە و پەنابردن و تەواوی ئەو شتانەی کە بەهۆی شەڕ و خراپەیانەوە پەنای بۆ دەبرێ، کاری (فعل) ئەون، یاخود درووستکراو گەلێکن کە پەروەردگار بەویست و ئارەزووی خۆی درووستی کردوون و خولقاندوونی.

---

٦١ اخرجه مسلم.

٦٢ متفق علیه.

تـەواوی دەسـتوور و فەرمانـەکان و سـەرجەمی سـوپاس و سـتایش کردنـەکان و تێکڕای سەروەت و سامان و خێر و چاکە لـە ژێـر ویـست و ئـیرادەی پـەروەردگاردان، هیچ کـامێ لـە بەنـدەکانی لـە ئەسـتۆی یـاد و ستایـشی پـەروەردگار بـەو جـۆرەی کـە شایـستەی خودایـە دەرنایـەن و نـاتوانن بەشـێوەیەکی شـیاو و گونجـاو لـە ئەسـتۆی دەربـێن و ئـەو بـە هـەمان شـێوەیە کـە خـۆی باسـی خـۆی دەکـات، (واتـە جگـە لـە پەروەردگار کە توانای ئەوەی هەیە کەوا بە شێوەیەکی گونجـاو بـاس و وەسـفی خـۆی بکات هیچ مرۆڤێکی تر ناتوانێت وەسف و ستایشی خوداوەند بکات، وەرگێـڕی کـورد). گەورەتر و بەرزترە لـە تـەواوی ئـەو سـتایش و وەسـف کردنانـەی کـە بوونـەوەرەکان دەیکەن.

_ ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ **سەرچاوەی خۆشبەختییە:**

بـەم پێیـە ڕوون و ئاشـکرایە کـە بەرژەوەنـدی و خۆشـبەختی و کامـەرانی مـرۆڤ پەیوەست و مەرجدارە بەهێنانەدی واتای: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ سوورەتی فاتحە ٥.

واتە: ((خوایە: تەنها هەر تۆ دەپەرستین، هەر لە تۆش داوای یارمـەتی و پـشتیوانی دەکەین، (لەکاروباری دین و دونیاماندا، بەتایبەت لەو کاروبارانـەدا بـەتۆ نـەبێت، بـە کەسی تر لە بەندەکانت ناکرێت))).

= چـونکە بەندایـەتی کردنـی پـاك و بێگـەردی پـەروەردگار مەبەسـت و داخـوازی درووستکەری جنۆکە و مرۆڤە.

= وە یارمەتی دەر و هاوکاری کەری کەسێکە کە بۆ گەیشتن بە ویست و خواستی، داوا لە خوا دەکات.

یەکەمی: پەیوەندیـدارە بـە واتـای ئولووهییـەوە. وە دووەمـیش: پەیوەندیـدارە بـە واتای ڕەبووبییەتەوە. چونکە "اله" ئەوەیە کە دڵەکان لە ڕووی خۆشویستن، مـەیل و

ئارەزوو گەورەیی، قەدر گرتن و ڕێزگرتن، خشووع، خۆ بە کەم زانین، ترس، داواکردنو پشت بەستن بەخوداوەندەوە ڕوو دەکەنە خواو خۆشیان دەوێ.

بەلآم "ربّ" ئەوەیە کە دروستکراوەکەی دەخولقێنێ، پەروەردە و گەورەی دەکاتو ڕێنموونی دەکات بۆ خێر و چاکە و بەرژەوەندی و ئاشتەوایی، کە واتە هیچ ئیلاهێ جگە لە خوایەك و هیچ خودای "ربّ" شەرعی و ڕێگە پێدراو نییە.

بە هەمان شێوە کە جگە لە پەروەردگارییەتی خوا "ربوبیة" هەرچیتر هەیە لەبێ هوودە ترینی بێ هوودەو بێ خۆکانە. جگە "الوهیة" خودا ئەوانی تر لە بێهوودەترینو گومڕا ترینەکانە.

## _ ئایەتەکانی یەکخوا پەرستی( توحید ):

پەروەردگاری مەزن لە زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئاندا (الوهیة و ربوبیة)ی لەپاڵ یەکتردا داناوە، بە هەمان شێوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَلِلّٰهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ سوورەتی هود١٢٣.

واتە: ((هەر بۆ خوایە نهێنی و نادیارەکانی ئاسمانەکان و زەوی، هەموو کارو فەرمانیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە، دەی کەوابوو ئەو بپەرستە و تەنها پشت بەو ببەستە، هەرگیز حوای پەروەردگارت بێ ئاگا نییە لەوەی کە ئێوە دەیکەن و ئەنجامی دەدەن)).

هەورەها لەسەر زاری شوعەیبیشەوە (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەفەرمووێت: ﴿....وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَى مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللّٰهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ سوورەتی هود ٨٨.

واتە: ((شوعەیب وتی: منیش نامەوێت قەدەغەی شتێکتان لێ بکەم، کەچی خۆم وەك ئێوە نەکەم (چی بە ئێوە بگەیەنم خۆم لەپێشدا ئەنجامی دەدەم) من هیچم ناوێت تەنها چاکسازی نەبێت، بەگوێرەی توانام، ڕێکخستنی کارم بەدەستی کەس نییە

بەدەستی خوا نەبێت، پشت و پەنام هەر بەو بەستووە و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە)).

هەورەها دەفەرمووێت: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ وَكَفَى بِهِ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا﴾ سوورەتی فورقان ٥٨.

واتە: ((تۆ ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پشت ببەستە بەو خوایەی کە هەمیشە زیندووە و هەرگیز نامرێت، بەردەوام تەسبیحات و سوپاس و ستایشی بکە، ئەوەندە بەسە بۆ ئەو کە بە هەموو گوناه و تاوانەکانی بەندەکانی ئاگایە و (هیچی لێ پەنهان نییە))).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿....قُلْ هُوَ رَبِّي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ﴾ سوورەتی ڕەعد ٣٠.

واتە: ((ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تۆ بڵێ: ئەو پەروەردگاری منە و بێجگە لەو خوایەکی تر نییە، من هەر پشتم بەو بەستووە، گەڕانەوەشم هەر بۆ لای ئەوە)).

وە لەسەر زاری شوێنکەوتووانی ئیبراهیمەوە (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەفەرمووێت: ﴿...رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ سوورەتی مومتەحینە:٤.

واتە: ((ئینجا ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێت) وتی: پەروەردگارا هەر پشتمان بەتۆ بەستووە و هەر بۆ لای تۆش گەڕاوینەتەوە، سەرەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە)).

(إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ)و ئەم حەوت ئایەتە، دەرخەری ئەو دوو بنەما کۆکەرەوەیە بۆ یەکخواپەرستی (توحید)، کە بەبێ هێنانەدی ئەوانە هیچ مرۆڤێ تام و چێژی سەرکەوتن و سەربەرزی دونیا و بەختەوەری و خۆشبەختی دواڕۆژ ناکات و هەستی پێ ناکات.

## تەوەری دووەم: خۆش ویستنی دونیا و بینینی دواڕۆژ:

هۆکاری دووەم کە بەختەوەری و کامەرانی مرۆڤ دەستەبەر دەکات، باوەڕ و ئیمانە بەم ڕاستییەی کەوا پەروەردگار بوونەوەرەکانی بەهۆی پەرستش، ناسین، ڕووتێکردن، خۆشەویستی و ڕێزگرتن و نیەت و نیاز پاکی بۆ خۆی درووست کردووە و خولقاندوونی. پەروەردگارێ کە دڵەکان بەیادی ئەوەوە ئارام دەگرن و نەفسەکان ئاسوودە دەبن. (وەك چۆن پەروەردگار لەم بارەوە دەفەرموێت: = الا بذکر الله تطمئن القلوب = واتە: بەبێ یادی خوا دڵەکان ئارام ناگرن، وەرگێڕی کورد).

وە بە بینینی پەروەردگارە لە دواڕۆژدا کە، دڵەکان دەگەنە ئەوپەڕی شادومانی و کەیف خۆشی و ڕۆشنایی و بە تەواوی لە بەختەوەری و بەخششەکان بەهرەمەند دەبن و لە دواڕۆژیشدا خوای گەورە هیچ بەخشش و نعمەتێ گەورەتر و بەرزتر لە بەخششی بینینی خوداوەند و بیستنی کەلام و گفتووگۆکانی بەبێ واسیتە و ناوجیکەر، نابەخشێتە ئەهلی سەعادەت و کامەرانی. لەم دونیایەشدا پەروەردگار هیچ شتێکی تری چاکتر و باشتر و خۆشە ویستر و خۆشبەختتر لە ئیمان، تامەزرۆیی بینین و حەزکردن بە نزیك کەوتنەوە و تام و چێژی یاد و پەرستنیان پێ نابەخشێ.

پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) لە نزا و پاڕانەوەیەکی دا کە ئیمامی ئەحمەد و نەسائی و ئیبن حەبان گێڕاویانەتەوە فەرموویەتی: **((اللهم بعلمك الغيب وقدرتك على الخلق، أحيني ما علمت الحياة خيراً لي، وتوفني إذا كانت الوفاة خيراً لي واسألك خشيتك في الغيب والشهادة، واسألك كلمة الحق في الغضب والرضا واسألك القصد فى الفقر والغنى، واسألك نعيما لاينفد، واسألك قرة عين لا تنقطع، واسألك الرضا بعد القضاء، واسألك برد العيش بعد الموت، واسألك الشوق الى لقائك، فى غير ضراء مضرة ولا فتنة مضلة، اللهم زينا بزينة الإيمان و اجعلنا هداة مهتدين)).**[٦٣]

---

٦٣ اخرجه النسائی، بەژمارە (١٣٠٤ = ١٣٠٥).

واتــه: ((پــهروهردگارا. ! بــههۆی ئاگــایی و توانابیهتــهوه بهســهر گــهردوون و درووستکراوهکانتدا تا ئهو کاتهی که دهزانی ژیان به کهڵك و قازانجی منه بمژێنه، ئهگهر خێرم له مردنمدایه ئهوا بمرێنه. ! وه داوات لێ ئهکهم که له کاتی تووڕه بوون و خۆشحاڵی دا تهنیا وشهی حهق بخهره سهر زارم و. ! له کاتی دهوڵهمهندی و هــهژاری دا میانهڕۆ بم (وه له زیادهڕۆیی و ناشوکری و نا سوپاسی دوورهپهرێزی بکهم و دوور بکهومــهوه). پــهروهردگارا. ! بهخشش و نیعمهتێکی بێ کۆتــام لێت دهوێ و داوای خۆشحاڵی و شادومانی و بهر چاو ڕوونییهکی بێ کوتاشت لێ دهکهم و ڕازی بوون و تهسلیم بوون له دوای قهزا و قهدهرت لێ داوا دهکهم و دهمهوێ و داوای ئارامی و ئاسوودهیی و داوای مردنیشت لێ دهکهم. داوای ئهوین و حهزی بینینت لێ ئهکهم به بێ هیچ جۆره سهختی و گرفتێکی زیاندهڕۆ بهبێ تاقمێکی گومڕاکهر. پهروهردگارا. ! بــهجوانی ئیمــان بمانڕازێنــهرهوه و بمانخــهره زومــرهی ئهوانــهی کــه ڕێنموونیــت کردوون ! )).

پێغهمبهری ئازیزی ئیسلامی (صلی الله علیه وسلم) لهم نزا و پاڕانهوه پڕ بههایهدا داوای بهرزترین و خۆشهویست ترین بهخششی دونیا، واته حهز و تامهزرۆی بینینی خوداوهند و چاکترین تام و چێژ و بهخششی دواڕۆژ، واته بینینی خوداوهند له پهرستراوهکهی = کهپهروهردگاره = دهکات.

لهوێدا که گهورهیی شتێکی وهك ئهمه مهرجداره به پارێزراو بوون له زیان و زهرهرهکانی دونیا و بهلا ئاینییهکان، پێغهمبهری خوا (صلی الله علیه وسلم) دهفهرمووێت: ((جگه له زیان و زهرهر و بێ بهلاو گۆبهندو خراپهیهکی گومڕاکهر و سهرلێشێواو کهر)و به هۆی ئهوهی که گهورهیی و تهواوی مرۆڤ له ناسین و پهیڕهوی کردن لهحهق و ڕێنمــوونی کردنــی خــهڵکانی تــرهوه بــۆ ئــهوه، فهرموویــهتی: ((پهروهردگارا. ! ئێمه بخهره بهر ئهوانهی که ڕێنموونیت کردوون!)) وه بهم ئاراستهی که، ڕهزامهندی و تهسلیم بوونی چاك و به كهڵك و بهدهست هێنانی ئامانج ڕهزامهندیو

ڕازی بوونی دوای ڕووداو قەزای ئیلاهییە، نەك پێش ئەوە، چونكە پێش چارەنووسی (قەزا) ویست و نیاز و بڕیاردان بە ڕازی بوون و ڕەزامەندییەوە لەدوای ڕوودانەكە ئیتر جێگەیەك نامێنێتەوە بۆ ویست و نیاز و ئەزموون و تاقیكردنەوە لەوێوە دەست پێ دەكات، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕازی بوون و ڕەزامەندی و تەسلیم بوونی خۆی لەدوای ڕوودانی قەزا و قەدەری پەروەردگار داوای كردووە.

چونكە سەبارەت بە پڕكێشی و توانایی، دوو مەسەلە تەرح كراوە:

**یەكەم:** داواكردن پێش ڕوودان.

**دووەم:** تەسلیم بوون و ڕازی بوون لەدوای ڕوودان.

كۆكردنەوەی نێوان ئەم دوو نیشانەیە بەختەوەری و خۆشبەختی مرۆڤە. بە هەمان شێوە كە لە مسند و...، لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) هاتووە كە: ((**ان من سعادة ابن آدم استخارة الله ورضاه بما قضى الله وان شقاوة ابن آدم ترك استخارة الله وسخطه بما قضى الله**)).[٦٤]

بۆیە ترس لە پەروەردگار بناغە و ئەساسی تەواوی خێر و چاكە و بەرژەوەندییە لەدونیا و دواڕۆژیشدا، پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست = موحەممەد = (صلى الله عليه وسلم) لە یەزدانی داواكردووە، كەوا ترس و خەوفی خۆی بخاتە دڵییەوە هەم لەكاتی دیار و ئاشكرادا و هەمیش لەكاتی نهێنی و نادیاریدا ترسی خودای لەدڵدا بێ.

وە بەم جۆرەی كە زۆرێك لە خەڵكی لە بارودۆخێكی ویستراو و جێی ڕەزامەندی باس لە حەق دەكەن، بەڵام هەركاتێ كەوا ئەو بارودۆخە گۆڕدرا و بەدڵی ئەوان نەبوو ببێتە هۆی تووڕەیی و ناڕەحەتی ئەوان، ڕوو دەكەنە شتی ناحەق و بێ بەهاو هیچ و پووچ.

هەندێ جاریش بارودۆخی ویستراو و ئارەزوو كراویش هانیان دەدات بەرەو ناحەقی و ناڕەوایی بوون، پێغەمبەری ئازیز (صلى الله عليه وسلم) لە پەروەردگاری

---

٦٤ اخرجه الترمذي (٢١٥١).

داوا کردووه که هاوکاری و ئاریکاری بکات کەوا بتوانیّ له کاتی تووڕه بوون و له کاتی ڕازی بوونیشدا باس له حەق بکات.

له بەر ئەمەیە کەوا هەندیّ له پێشینان (ڕابردووەکان) وتوویانە: ((لەوانە مەبن کە ئەگەر له بارووودۆخێکی ویستراو و دڵکراوە و ڕەزامەندی دا جێگیر بوون ڕوو دەکەنە ناحەقی و خراپەکاری و هەر کاتێکیش لەبارووودۆخێکی نەخوازراو و ناخۆشدا جێگیر بوون، تووڕەیی و نیگەرانی هانیان دەدات بەرەو ناحەقی و هیچ و پووچی و ناڕەوایی)).

بەو پێیە کەوا دەوڵەمەندی و هەژاری هەردووکیان هۆکاری تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندن و پەروەردگار (جل جلاله) بەهۆیانەوە بەندەکانی هەڵدەسەنگێنیّ و تاقیان دەکاتەوە. له کاتی بیّ نیازیدا دەستی کراوەیە و له کاتی نەبوونی و نیازمەندیشدا دەستی دەنووقێنیّ، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) داوای له خوا کردووه که له هەردوو حاڵەتەکاندا (بیّ نیازی و نیازمەندی) له زیادەڕۆیی، لادان و نا سوپاسی و نا ئومێدی بیپارێزیّ و هاوکاری و ئاریکاری بکات بۆ میانڕۆیی و دەست پێوەگرتن.

لەبەر ئەوەیە که بەخششەکان دوو جۆرن:

یەکەم: بەخششە جەستەیی و مادییەکان.

دووەم: بەخششە ڕۆحی و مەعنەوییەکان.

بەهرەمەند بوون له بەخششە ڕۆحییەکان دەبێتە هۆی بەختەوەری و کامەرانی و سەربەرزی و تەواوی و کامڵ بوون، ئەوەش پەیوەستە بە بەردەوامییەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەردووکیانی له پەروەردگار داوا کردووه و فەرموویەتی: ((پەروەردگارا! داوای بەخششێکی هەمیشەیی و بەردەوام و شادمانیو کەیف خۆشییەکی بیّ کۆتات لیّ دەکەم)).

لەبەر ئەمەیە که دوو جۆر جوانی و خۆ ڕازاندنەوە بوونی هەیە:

یەکەم: یەکێکیان جوانی و خۆ ڕازاندنەوەی ماددیی وجەستەیی.

دووەم: ئەوی تریان جوانی و خۆ ڕازاندنەوەی دڵی و مەعنەوی.

ڕازاندنەوە و جوانی دڵ گرنگتر و بە بایەخ ترە و هەرکاتێ ئەو جوانی و خۆ ڕازاندنەوەیەی بۆ دەستەبەر بکرێ، جوانی ڕووالەت بە باشترین شێوە دەستەبەر دەبێ‌و دێتە دیی. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) هەردوو جوانییە دیار و نادیارەکانی لە پەروەردگار داوا کردووە و فەرموویەتی: ((پەروەردگارا. ! بە جوانی ئیمان بمانڕازێنەرەوە !)).

بەو پێیەی کە ژیان لەم دونیا پڕ لە ناڕەحەتی و زەحمەت و مەینەتەدا بە دڵی هیچ کەس نییە و بۆ کەسیش نییە، سەراپای هەر ئەزییەت و ئازاری دیار و نادیارە. داوای لە خوا کردووە: کە لە ئاسوودەیی و ئارامی و کامەرانی پاش مردن بەهرەمەندی بکات.

مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) لەو نزاو پاڕانەوەیدا داوای تەواوی پاکییەکانی دونیا و دواڕۆژی لە پەروەردگار کردووە.

## _ ئایا یەکخوا پەرستی ڕبووبییەت بەسە؟

نیازو پێویستی مرۆڤەکان بە ناسینی پەروەردگارییەتی پەروەردگارو پەرەستنی، وەکو پێویستی و نیازیانە، بە خولقاندن و ڕۆزی و بژێوی دان و تەندروستی و شاردنەوە و داپۆشینی نهێنییەکان و هێورکردنەوەی نیگەرانییەکانی ئەوان لە ڕێگەی پەروەردگارەوە.

نیازو پێویستی مرۆڤەکان بە ئولوهییەت، خۆشەویستی و بەندایەتی کردنی خوا بە ڕاستی لە سەرووی ئەو کاروبارانەشەوەیە. چونکە ئامانج لە درووست کردنی ئەوان و خێر، بەرژەوەندی، تام و چێژ، بەختەوەری و ڕزگار بوونیان لەپاڵ ئەو بەندایەتی کردن و خۆش ویستنەی پەروەردگاردا جێگیرە و بوونی هەیە.

لەبەر ئەوەیە کە "لا الە الا الله" بناغە و بنەمای تەواوی خێر و چاکەکان و کۆڵەکەی سەربەرزی دونیاو بەختەوەری و کامەرانی دوا ڕۆژە.

بەڵام هەم موسڵمان و هەمیش بێ باوەڕ دان بە یەکخواپەرستی ڕەبووبیەتدا دەنێت و وێژەران و زانایان لە پەرتووکەکانیاندا دانیان پێداناوە، بەڵام ئەم دان پێدانانە نەك ئەوەی کەوا بۆ ئەوان بەس نییە، بەڵکو بە بەڵگە و بیانوویەکی دژ بە ئەوان لە قەڵەم دەدرێ و دێتە ئەژمار. ڕاستی و حەقیقەتێ کە پەروەردگار (جلّ جلالّه) چەندین جار لە قورئانی پیرۆزدا باسی فەرمووە: بەم پێیە و لەسەر ئەم ئەساس و بناغەیە،ئەوە حەق و مافی پەروەردگارە بەسەر بەندەکانییەوە کە وا تەنیا ئەو بپەرستن و پەیڕەوی و گوێڕایەڵی تەنیا لەو بکەن و لە پەرستش و یارمەتی داندا کەسێ یاخود شتێ نەکە هاوبەش و شەریکی خوداوەند. بە هەمان شێوە کە لە فەرموودەیەکی صەحیحدا لە موعازی کوڕی جەبەلەوە (خوای لێ ڕازی بێت) هاتووە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرمووە: ((دەزانی حەق و مافی پەروەردگار چییە بەسەر بەندەکانییەوە؟))

وتم: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن. !

فەرمووی: ((حەق و مافی پەروەردگار بەسەر مرۆڤەکانەوە ئەمەیە کە تەنیا ئەو بپەرستن و کەسێ یاخود شتێ نەکەنە هاوبەش و شەریکی!)).

دواتر فەرمووی: ((دەزانی حەق و مافی ئەو کەسانەی کە تەنیا پەروەردگار دەپەرستن بە سەر پەروەردگارەوە چییە؟)).

وتم: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن!.

فەرمووی: ((حەق و مافی ئەمان ئەوەیە کە پەروەردگار (جلّ جلالە) سزایان نەدات)).[٦٥]

لەبەر ئەوەیە کە پەروەردگاری مەزن و بە توانا بە ڕاستی بەندە یەکخواپەرستەکانی خۆش دەوێ و لە تۆبەکردن و پەشیمان بوونەوەیان شادومان و کەیفخۆشە. ئەمە

---

٦٥ متفق علیە.

گـەورەترین و بـەرزترین تـام و چـێژ وخۆشـبەختی و کامەرانییـە کـە مرۆڤـە یەکخواپەرستەکان لێی بەهرەمەند دەبن. چونکە کەسێ لە نێو تەواوی بوونەوەر و کائیناتەکاندا هیچ شت و هیچ کەسێ نادۆزێتەوە کە بە یاد کردنی، دڵی پێی ئارام بگرێ جگە لە پەروەردگار نەبێ و بە هۆی خۆش ویستن و هاودەمی لە گەڵیدا هەست بەخۆشی بکات و خێر و چاکە و خۆشبەختی لە ڕووکردنە ئەو بزانێ. (وەك چۆن پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾ واتە: دڵەکان تەنیا بە یادی خوا ئارام دەگرن. وەرگێڕی کورد).

هەرکەسێ جگە لە پەروەردگار کەسێکی تر بپەرستێ، جۆرێ لە خۆشی و بەرژەوەندی دەست دەکەوێ، خراپە و زەرەرو زیان و چارە ڕەشی ئەو چەند بەرامبەرەو کارەکەی وەك خواردنی چێشتێکی بەتام و خۆش بەڵام ژەهراوی وایە.! بە هەمان شێوە کە ئەگەر لە ئاسمانەکان و زەویدا جگە لە پەروەردگار خودا گەلێکی تر هەبووایەن، ڕێك و پێکی و بەڕێوەبردنیان تێك دەچوو:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا...﴾ ئەنبیا ۲۲.

واتە: ((ئەگەر لە هەردووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبووایە غەیری (الله) ئەوە کاول و وێران دەبوون و تێك دەچوون بەسەر یەکدا!)).

دڵیش وەك ئاسمانەکان و زەوی وایە، ئەگەر جگە لە پەروەردگار، پەرستراو و خۆشەویستێکی تری تێدا جێگیر ببێ و ئامادە ببێت، تووشی لەناو چوون و نەخۆشی و کلۆڵی و وێران بوون دەبێت و تەنیا کاتێك چارەسەر دەکرێ کە ئەو خۆشەویست و پەرستراوە لە دڵی خۆیدا دەربکات و خۆشەویست و یاری ئەو تەنیا پەروەردگاری زاناو کاربەجێ و تەواوی هیوا و داواکردن و پاڕانەوە، پشت بەستن و ڕووتێکردنی بەرەو خوا بێت و بەس!.

## تەوەری سێیەم: نیازو پێویستی مرۆڤ بە پەرستشی پەروەردگار:

هۆکاری سێیەم بۆ دابین و دەستەبەر کردنی بەختەوەری مرۆڤ، ناسینی ئەم حەقیقەت و ڕاستییەیە کە نیازو پێویستی مرۆڤ بە پەروەردگار (جلّ جلاله) ئەمەیە کە، تەنیا ئەو بپەرستێ و لە پەرستش و بەندایەتی کردندا هیچ کەس و هیچ شتێ نەکاتە شەریك و هاوەڵی خودا. چونکە هیچ کەس و هیچ شتێ هاوشێوەی پەروەدگار (جلّ جلاله) نییە و نابێ و ناشبێ.

ئەم نیازو پێویستییەی مرۆڤ لە هەندێ ڕووەوە وەك نیازی ئەو بە خواردن، خواردنەوە و هەناسەدان وایە و تەنیا بەوانە دەچوێنرێ و دەشوبهێ، ئەگەرچی جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە.

بەختەوەری و کامەرانی و بەرژەوەندی ڕاستەقینەی مرۆڤ و چاکسازی دڵ و ڕۆح لەپاڵ ناسینی ئولوهییەتدایە، پەروەردگار و ئیلاهێ کە جگە لەو هیچ پەرستراو یارمەتی دەر و خۆشەویست و یارێکی ڕاستەقینە بوونی نییە و شەرعییەتی نییە.

پەروەردگارێ کە دڵەکان تەنیا بە یادی ئەو ئارام دەگرن و بەناسین و خۆشەویستی ئەو و وابەستە بوون پێیەوە ئاسوودە دەبن.

خوداوەندێ کە ئەهلی یەکخواپەرستی و ناسین کەمتەرخەمی ناکەن لەپێناو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەودا لە دونیادا و بینین و گەیشتن پێی لە دواڕۆژدا.

پەروەردگارێ کە هیچ خێرو بەرژەوەندی جگە لە یەکخواپەرستی، خۆش ویستن، پەرستش و ئومێد و هیوا و ترس لە ئەو ئەگەری نییە و شیاو نییە.

ئەگەر بەرژەوەندی و خۆشی گەلێ جگە لەلایەنی خوداوەندەوە لە لایێکیترەوە دەستەبەریش بێت و بەدەست بێت، زۆر کەم، ڕووالەتی و نا بەردەوامە، لە جۆرێ بۆ جۆرێکی تر و لە کەسێ بۆ کەسێکی تر دەگوازرێتەوە و لە بارودۆخێکدا پێی دڵخۆشو کەیف خۆش دەبن و لە دۆخێکی تریشدا نیگەران دەبن و لە زۆربەی بوارەکاندا ئەو بەخشش و خۆشییە دەبێتە خراپترین زەرەرو زیان و ناڕەحەتی.

بەڵام لە هیچ ئان و ساتێك و لە هیچ بارووودۆخێكدا مرۆڤ، لە پەرستش و خۆش ویستنی پەروەردگار بێ نیاز نییە و یاد و ستایش كردنی ئەو خۆشترین و چاكترین خواردن و هۆی بەهێزی دڵ و پایەداری و بەردەوامی ئیمان و ویست و ئیرادەی ئەوە و بەشایەتی قورئان و سوننەت و دڵ و فیترەت، ئەوە تەنیا ئەهلی ئیمانن كە لەم جۆرە بەخشش و خۆشبەختییە بەهرەمەند دەبن.

## _ پەرستش كارێكی قورس نییە:

بەو جۆرەی كە خاوەن پشكە كەمەكانی زانست و عیرفان و بێ بەشان لە بەخت و پشكی چاكە و چاكەكاری دەڵێن: پەرەستش و یاد و سوپاسگوزاری پەروەردگار كۆڵێكی قورس و كارێكی سەخت و سەخڵەتە، بەهیچ جۆرێ درووست نییە.

_ هەندێكی تریش دەڵێن: پەرستش و زیكرو یادكردنی پەروەردگار تەنیا لە بۆ تاقیكردنەوە و هەڵسەنگاندنە و بەس.

_ یا تەنیا لە پێناو بەدەست هێنانی پاداشتە لە دواڕۆژ و پێویستییەكانی ژیاندا.

_ یا پەرەستش تەنیا لەپێناو خۆ پاراستن و چاك كردنی نەفسی ئادەمیە، تاوەكو لە پلەی ئاژەڵییەوە بگوازرێتەوە بۆ مەنزڵەت و شوێنگەی مرۆڤ.

ئەم قسانە قسەی مایە پووچان و ئەوانەن، كە بەهرەی كەمیان بردووە لە ناسینی پەروەردگاری بە بەزەیی و ئەوانەی كە بێ بەش بوون لە تام كردنی خۆشی ڕاستی ئیمان و ئەوانەشی كە بە پاشماوەی بیرو بۆچوون و زەینی خەڵكانی تر كەیفخۆش و شادومانن.

بەڵام لە ڕاستی دا یەكخواپەرستی و پەرستنی خودای تاك و تەنیا و ستایش كردنی خاوەنی بەخششی سروشت و چۆنییەت وەك تام و چێژ، بەختەوەری، ڕێنموونی و بەسیرەت وایە. گەورەترین هۆكاری ئاسوودەیی ڕۆح و دڵ و خۆشەویست ترین و پایە بەرز ترین بەخششێكە، ئەوانەی كە شیاو گونجاون لێی بەهرەمەند بوون.

دەبێ لەم پێناوەدا (ڕێگەیەدا) داوای یارمەتی و هاوكاری لە خودا بكەین و پشت بە ئەو ببەستین.

ئامانج له پەرستنی خوا بە پلەی یەکەم هێنانە کایەی زەحمەت و ناڕەحەتی و پەرێشانی نییە و ئەگەر تۆزێ ڕەنج و ئازار له پەرستشدا هەبێ، شتێکی لاوەکییە و ئامرازێکی پێویست بووەتە هۆکاری، چونکە هەوڵ و تێکۆشان و بەرگە گرتنی ئەزییەت و ئازار بەشێکن لە ئامرازەکانی ئەم جموجوولەیە.

## _ پەرستن هۆکاری سەلامەتی، گەورەیی و خۆشبەختی:

فەرمانەکانی پەروەردگاری مەزن و ئەو ئەرك و واجیباتانەی کە پێویستی کردوون بەسەر بەندەکانییەوە و ئەو بڕیارە ئایینیانەی کە لە سەر ئەوانی بڕیار داوە، هەموویان هەوێن و پایە و بناخەی بەختەوەری و ئاسوودەیی دڵ و ڕۆحن و تەنیا لەم ڕێگەوەیە کە وا لە دونیاو دواڕۆژدا ڕێگەی کەماڵ و گەشەکردنی خۆی دەگرێتە بەر.

بە ڕاستی هیچ جۆرە کەیفخۆشی و شادومانی و تام و چێژ و بەهرەمەند بوون لە بەخششەکان جگە لە هەنگاو هاویشتن و هەنگاو نان لەم ڕێگەیەدا گونجاو و شیاو نییە.

بە هەمان شێوە کە پەروەردگاری مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ یونس ٥٧.

واتە: ((ئەی خەڵکینە.! بە ڕاستی ئێوە ئامۆژگارییەکی گەورە و گرنگتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە (قورئانە)، شیفاو چارەسەریشە بۆ نەخۆشی دڵ و دەروونەکان و ڕێ نیشاندەر و ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران)).

ئەبوو سەعیدی خودری دەفەرمووێت: ((گەورەیی و مەزنی پەروردگار، واتە: قورئان و میهرەبان و دلۆڤانیشی ئەمەیە کە ئێوەی کردووەتە ئەهل و شوێنکەوتەی قورئان)).

هەلالی کوڕی یساف دەڵێت: ((ئەو ئیسلامەی کە خوداوەند ئێوەی پێ ڕێنموونی کردووە و قورئانێ کە ئێوەی فێر کردووە، نرخ و بەهای لە تەواوی ماڵ و سەروەت و زێڕ و زیوی دونیا زۆرتر و فراوانترە)).

هەندێ لە پێشینان وتوویانە: ((مەزنی و گەورەیی خوداوەند قورئان و میهرەبانی و دلۆڤانیشی ئیسلامە)).

بەڵام دوای لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون و توێژینەوە دەگەینە ئەم ئەنجامە کە هەم لە قورئاندا و هەمیش لە ئیسلامدا هەردوو سیفەتی گەورەیی و میهرەبانی و دلۆڤانی بوونیان هەیە، مەزنی و دلۆڤانییەك کە پەروەردگار بەهۆیانەوە چاکەی لە گەڵ پێغەمبەرەکەی دا کردووە و منەتباری کردووە و فەرموویەتی: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا مَا كُنْتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ....﴾ شورا ٥٢.

واتە: ((ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئا بەو شێوەیەی کە وتمان ئێمە قورئانمان بۆ ڕەوانە کردیت لە لایەن خۆمانەوە (کە ژیان بەخشە بە ڕۆح و گیان و عەقڵ)، تۆ نەتدەزانی قورئان چییە و ئیمان چییە)).

خوداوەند بە هۆی پەرتووك و ئیمانەوەیە کە، گەورەیی و پلە و پایەی بە هەندێ بەخشیوە و هەندێکی تری بە هۆی پشت تێ کردن لێیان و پشت گوێ خستنیان تووشی سەر لێشێواوی کەساسی کردووە.

## _ وەڵامدانەوەی پرسیارێ:

ئەگەر کەسێ بپرسێ و پرسیار بکات، کە واتە بۆچی قورئانی پیرۆز فەرمانەکانی پەروەردگاری وەك ئەرك و ڕوولێنان ناو بردووە و باسی کردوون:

﴿لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا.....﴾ بەقەرە ٢٨٦.

واتە: ((خوای گەورە ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێك مەگەر بە قەدەر توانایی و لێهاتوویی خۆی نەبێت)).

﴿...لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا...﴾ ئەنعام ١٥٢.

واتە: ((جا ئێمە داخوازی لە کەس ناکەین مەگەر بە گوێرەی توانای خۆی نەبێت)).

لە وەڵامدا دەبێ بوترێ: بەهەمان شێوە کە لە ڕوواڵەت و ناوەوەی ئەم دوو ئایەتەدا دیارە، نە پەروەردگار ڕوولێنان (تكليف)و مەینەت و ئازاری ئایین و فەرمانەکانی ڕەدکردووەتەوە بەڵکو ئەوانی بە ڕۆح، ڕووناکی، چارەسەر، ڕێنموونی، بەخشش و میهرەبانی و ژیانێکی پڕ لە خۆشبەختی و پەند و ئامۆژگاری و هتد.... ناو بردووە.

## تەوەری چوارەم: خۆشی بینینی پەروەردگار لە دواڕۆژدا:

## _ گەورەترین خۆشی و بەخشش

لایەنی چوارەم سەبارەت بە خۆشبەختی و کامەرانی مرۆڤ، کە گەورەترین و بەنرخ ترین بەخششە لە دواڕۆژدا، بینینی ڕووی پیرۆز و ڕازاوەی پەروەردگار و گوێگرتنە لە قسە و فەرموودەکانی خوداوەند.

بە هەمان شێوە کە لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە: **((إذا ادخل اهل الجنة نادى مناد: يا أهل الجنـة، إن لكم عند الله موعدا يريد ان ينجذكموه، فيقولون: ماهو.؟ ألم يبيض وجوهنا ويثقل موازيننا ويدخلنا الجنة ويجرنا من النار؟ قال: فيكشف الحجاب فينظرون اليه، فما اعطاهم شيئا احب اليهم من النظر اليه)).**[٦٦]

واتە: ((هەرکاتێ بەهەشتییەکان چوونە ناو بەهەشتەوە، هاوارکەرێ هاوار دەکات و دەڵێ: ئەی ئەهلی بەهەشت، پەروەردگار بەڵێنێکی پێدابوون و ئێستەش دەیەوێ جێ بەجێی بکات.

بەهەشتییەکان دەڵێن: ئەم بەڵێنە کامەیە.؟ مەگەر ئێمەی ڕوو سپی و سەرفراز نەکردووە و ئەندازە و کێشی کردەوەکانی قورس نەکردووین و نەیخستووینەتە ناو بەهەشتەوە و دووری خستووینەتەوە لە دۆزەخ؟! ئەو هاوارکەرە دەڵێ: پەروەردگار ڕێگر و لەمپەرەکان دەخاتە لاوە تاوەکو ئێوە ببینن!.

خوداوەند (جلّ جلاله) هیچ بەخششێ گەورەتر و خۆشتـــــر لە تەماشاکردنی ڕووی پاك و پیرۆزی خۆی بە ئەوانی نەبەخشیوە)).

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: **((فلا يلتفتون الى شيء من النعيم ماداموا ينظرون اليه)).**[٦٧]

---

٦٦ اخرجه مسلم (١٨١).

٦٧ اخرجه إبن ماجه برقم (١٨٤)، وضعفه الالباني.

واتە: ((تا ئەو کاتەی کە چاویان بە پەروەردگار دەکەوێ، ڕوو ناکەنە هیچ یەکێ لە بەخششەکان)).

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) ئەم بابەتەی باس کردووە کە، بەهەشتییەکان لە کاتی بەرخورداری و بەهرەمەند بوونیان لە بەخششەکان و خۆشییەکانی بەهەشت کە پەروەردگار لەو پەڕی کەماڵی و تەواوییەوە ئەوانی لێ بەهرەمەند کردووە، هیچ کامێ لەوانە بە ئەندازەی سەیر کردن و تەماشاکردنی ڕووی پیرۆز و پاکی و بێ هاوتای خوداوەند تام و چێژ وەرناگرن. چونکە گەورەیی و تام و چێژێ کە بە بینینی پەروەردگار هەستی پێ دەکەن تام و چێژێکی ڕۆحی و مەعنەوییەو بە هیچ جۆرێ لە گەڵ تام و چێژ و خۆشی خواردن و خواردنەوە و بوون لە گەڵ حۆرییەکانی بەهەشتدا شایەنی بەراورد و هەڵسەنگاندن نییە.

لەبەر ئەوەیە کە پەروەردگار لە بارەی بێ باوەڕانەوە دەفەرمووێت: ﴿كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ (١٥) ثُمَّ إِنَّهُمۡ لَصَالُواْ ٱلۡجَحِيمِ﴾ موتەففین ١٥ — ١٦.

واتە: ((نەخێر، ڕزگار بوونیان نییە، چونکە بە ڕاستی ئەو ڕۆژە بەربەست هەیە لە نێوان تاوانباران و پەروەردگاریاندا و بێ بەش دەبن لە بینینی ئەو زاتە. لەوەو دوا بێگومان دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە !)).

پەروەردگار ئەوانی تووشی هەر دوو جۆرەکانی سزا کردووە، سزا لە نێوان ئاگری دۆزەخدا و سزای بێ بەش بوون لە بینینی خوای گەورە، بە هەمان شێوە کە ئەهلی یەکخواپەرستی، ئیمان، کردەوەی چاکە و پیاوچاکان و پارێزکارانی، کە ئەولیا و پیاوچاکان و دۆستانی ئەون، لە هەردوو بەخششی (بەهەشت و بینین) بەهرەمەندی کردوون.

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەڵات ئەو چوار جۆرەی — ئەهلی یەکخواپەرستی، ئیمان، چاکەکاران و پارێزگاران، وەرگێڕی کورد — لە سوورەتی موتەففیندا باسکردووە و لە بارەی پیاوچاکان و ساڵحانەوە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٍ (٢٢) عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ﴾ موتەففین ٢٢ — ٢٣.

واتە: ((بەڕاستی چاکان، خواناسان لە ناو نازو نیعمەتدا ژیانی خۆشی و شادی دەبنە سەر، لەسەر کورسی و قەنەفە ڕازاوەکان تەماشای دەورووبەری خۆیان دەکەن

(سەرنجی دیمەنی جوان و باخات و باخچە و گوڵ و گوڵزار و تاڤگە و ڕووبار و ناز و نیعمەتە نەبڕاوە و بێشومارەمان دەدەن)).

کەسانێ کە دەڵێن: مەبەست لەوەی کە سەیر دەکەن و تەماشا دەکەن، تەماشای سزای دوژمنان، یاخود کۆشك و تەلار و باخەکانی خۆیان، یا سەیری یەکتر دەکەن، لە واتای ئایەتەکە دوور کەوتوونەتەوە و نەیانپێکاوە، چونکە مەبەست ئەوەیە کە ئەوان تەماشای ڕووی جوان و پیرۆزی پەروەردگار دەکەن.

بەپێچەوانەی ئەو بێ باوەڕانەی کە لە بینینی پەروەردگاریان بێ بەش دەبن، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَلاَّ إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ (١٥) ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُواْ الْجَحِيمِ﴾ موتەففین ١٥ — ١٦.

واتە: ((نەخێر، ڕزگار بوونیان نییە، چونکە بەڕاستی ئەو ڕۆژە بەربەست هەیە لە نێوان تاوانباران و پەروەردگاریاندا و بێ بەش دەبن لە بینینی ئەو زاتە. لەوەو دوا بێگومان دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە!)).

سەبارەت بەوەی کەوا چۆن پەروەردگاری مەزن قسە و وتەکانی بێ باوەڕانی لە بارەی دوژمنەکانیانەوە لە دونیادا — واتە ئەهلی ئیمان — و گاڵتە پێ کردنیان لە دواڕۆژدا بەپێچەوانەوە هەڵدەسەنگێنێ، لەبەر ئەوەیە کەوا هەرکاتێ بێ باوەڕەکان لە دونیادا باوەڕدارەکانیان ببینیایە و چاویان پێیان بکەوتایە گاڵتەیان پێ دەکردن. (واتە بێ باوەڕەکان لە کاتی بینینی باوەڕدارەکاندا دەستیان دەکرد بە گاڵتە و گەپ کردن پێیان و ئێستەش پەروەردگار تۆڵەیان لێ دەسێنێتەوە. وەرگێڕی کورد).

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوا إِنَّ هَؤُلَاءِ لَضَالُّونَ﴾ موتەففین ٣٢.

واتە: ((کاتێکیش ئیمانداران دەبیننەوە، دەڵێن: بەڕاستی ئەوانە گومڕان و لە ڕێگەی باو و باپیران لایانداوە!)).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ﴾ موتەففین ٣٤.

واتە: ((ئەمڕۆ ئیتر نۆرەی ئیماندارانە، جا ئەمڕۆ ئەوانەی باوەڕدار بوون بە کافران پێ دەکەنن)).

دواتر دەفەرمووێت: ﴿عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ﴾ موتەففین ٣٥.

واتــە: ((لەســەر کورســی و قەنەفــە ڕازاوەکــان تەماشــا دەکــەن، دۆزەخییــەکان دەبینن)).

پــەروەردگار بەشــێوەیەکی ڕەهــا باســی لــە تەماشــاکردن و ســەیر کردنــی ئــەوانی کردووەو ئەوی بە تەماشا کردنێکی سنووردار باس نەفــەرمووە، چونکە گــەورەترین و خۆشترین خۆشی، خۆشی و حەزی بینینی ڕووی پاك و بێگــەرد و پــیرۆزی خوداوەنــدە (جل جلالــە)، ئەمــە گــەورەترین پلــەی بەخــشش و خۆشــبەختییە و پــەروەردگار بــەوە ڕووبەڕووی خۆ هەڵکێشان و بێ باوەڕان دەبێتەوە.

﴿إِنَّ هَؤُلَاءِ لَضَالُّونَ﴾ موتەففین ٣٢.

واتە: ((بەڕاستی ئەوانە گومڕان و لە ڕێگەی باو و باپیران لایانداوە!)).

بــێ گومــان، مەبەســت لــەم دوو بیــنین و تەماشــا کردنــە، بــۆ ڕووی پــیرۆزی پەروەردگارە، یا بە شێوەیەکی تایبەت یاخود بەشێوەیەکی گشتی و ڕەها، هەرکەسێ کە بیر لــە پێکهاتــەی ئایەتەکــە بکاتــەوە تــێ دەگــات و حــاڵی دەبێت کــە ئــەو دووانــە بەشێوەیەکی تایبەت یاخود گشتی دەرخەر و خستنەڕووی واتایەك نین جگە لەمە.

## _ خۆشی بینین، شونەما و شۆنهاتی ناسین:

بە هەمان شێوە کە هیچ تــام و چێژ و خۆشــی و بەخــششێ لــە بەهەشــتدا لــە گــەڵ خۆشی و بەخششی بینینی پەروەردگار (جلّ جلالە) شــایەنی بــەراورد و هەڵسەنگاندن نییــە، لــە دونیاشــدا هــیچ بەخــشش و خۆشــیی لــە گــەڵ ناســین و زیکــر و یــادکردن و پەرستن و تامەزرۆیی بینینی ئەو ناتوانێ شایەنی بەراورد کردن و هەڵسەنگاندن بێت.

تەنانەت خۆشی بینینــی پــەروەردگار شــوێنکەوتەی ناســین و خۆشەویستی ئــەهلی ئیمان و یەکخواپەرستییە، چونکە تام و چێژ شۆنەما و ئەنجامی شعور و هەست کردنــە بەخۆشەویــستی، بــە ئەنــدازەی ناســینی ئەوینــدار (عاشــق) لــە بــارەی دڵدارەکەیــەوە (معشوق) زیاتر بێت، زیاتر خۆشی دەوێت و بەهاودەمی کــردن لــە گەڵیــدا و بــە یــاد و بیرکردنی زیاتر هەست بە خۆشی دەکات و تام و چێژی لێ وەردەگرێ.

## تەوەری پێنجەم: ڕۆزی و سەرکەوتن و ویستی پەروەردگار:

یەکێکی تر لەو بابەتانەی کە پەیوەندی بە خۆشبەختی مرۆڤەوە هەیە ئەوەیە کە، قازانج و زەرەری ڕاستەقینە و بەخشین و وەرگرتن، تەگبیر و گومڕایی، تێشکان و سەرکەوتن، بەرزی و نزمی، سەرشۆڕی و سەربەرزی، لەخزمەت هیچ یەکێ لە درووستکراوەکانی پەروەردگاردا نییە و خوداوەند خۆی بە تەنیا لە هێز و توانا و ویستی تەواوی ئەوانە بەرخوردار و بەهرەمەندە و فەرمانڕەوا و خاوەنی تەواوی کاروبار و شتەکان تەنیا ئەوە.

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەلات دەفەرموویێت: ﴿مَا يَفْتَحِ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِنْ رَحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُ مِنْ بَعْدِهِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ فاتر ٢.

واتە: ((هەر کاتێك خوا دەروازەی ڕەحمەت و بەخششی خۆی لە خەڵکی بکاتەوە، ئەوە هیچ کەس و هیچ شتێك ناتوانێت بەری بگرێت، هەر کاتێکیش دەروازەی ڕەحمەتی بگرێتەوە و دای بخات، کەس ناتوانێت لە دوای گرتنەوەی خوا بێجگە لەخۆی بیکاتەوە، هەر خۆیشی بالآدەست و دانایە)).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ وَإِنْ يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَادَّ لِفَضْلِهِ يُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ یونس ١٠٦.

واتە: ((هاناو هاواریش نەبەیت بۆ کەسێك یان شتێك لە جیاتی خوا، کە نە قازانجت پێ دەگەیەنێت نە زیان (چونکە قازانج و زیان هەر بەدەست خوایە)، خۆ ئەگەر کاری وا ئەنجام بدەیت، ئەوە بەڕاستی تۆ لە ستەمکارانیت!)).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿إِنْ يَنْصُرْكُمُ اللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ وَإِنْ يَخْذُلْكُمْ فَمَنْ ذَا الَّذِي يَنْصُرُكُمْ مِنْ بَعْدِهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ ئالی عیمران ١٦٠.

واتە: ((ئەگەر خوا سەرکەوتنتان پێ ببەخشێت ئەوە هیچ کەس ناتوانێت سەرکەوێت بەسەرتاندا، خۆ ئەگەر پشتتان بەر بدات، ئەوە کێ هەیە دوای ئەو کۆمەکتان بکات و سەرتان بخات، دە با ئەوانەی ئیماندارن هەر پشت بەخوا ببەستن)).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَأَتَّخِذُ مِنْ دُونِهِ آلِهَةً إِنْ يُرِدْنِ الرَّحْمَنُ بِضُرٍّ لَا تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا وَلَا يُنْقِذُونِ﴾ یاسین ٢٣.

واتە: ((ئایا ڕەوایە لە جیاتی خوا چەند پەرستراوێکی تر بۆ خۆم بڕیار بدەم کە هیچیان بەدەست نییە خۆ ئەگەر خوای میهرەبان بیەوێت تووشی ناخۆشییەکم بکات، تکاو پاڕانەوەی ئەو پەرستراوانە هیچ سوودێکم پێ ناگەیەنن و فریام ناکەون و ڕزگارم ناکەن)).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ﴾ فاتر ٣.

واتە: ((ئەی خەڵکینە بیر بکەنەوە لەچاکەی خوا بەسەرتانەوە، ئایا دروستکار و بەدیهێنەرێکی تر هەیە جگە لەخوا، لە ئاسمان و زەوییەوە ڕزق و ڕۆزیتان پێ ببەخشێت..؟! جگە لەو خوایەکی تر نییە، جا ئەوە چۆن لەو بیروباوەڕیە درووستە لادەدرێن..؟ (ڕوو دەکەنە گومڕایی))).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَمَّنْ هَذَا الَّذِي هُوَ جُنْدٌ لَكُمْ يَنْصُرُكُمْ مِنْ دُونِ الرَّحْمَنِ إِنِ الْكَافِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ (٢٠) أَمَّنْ هَذَا الَّذِي يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُ بَلْ لَجُّوا فِي عُتُوٍّ وَنُفُورٍ (٢١) أَفَمَنْ يَمْشِي مُكِبًّا عَلَى وَجْهِهِ أَهْدَى أَمَّنْ يَمْشِي سَوِيًّا عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ مولك ٢٠– ٢١.

واتە: ((ئایا کێیە ئەو کەسە خۆی بە سەرباز و بەرگریکەر لەئێوە دەزانێت و وا دەنوێنێت کە دەتوانێت بەبێ خوای میهرەبان سەرتان بخات و پایەدارتان بکات..؟! نەخێر، کافران تەنها لە خەڵەتاویدان و هیچی تر..؟! یاخود کێیە ئەوەی کە ڕزق و ڕۆزیتان پێ دەبەخشێت، ئەگەر خوا لێتان بگرێتەوە..؟! نەخێر، بەو تاقی کردنەوەیەش بێ باوەڕان هەر لە گومڕایی و سەر لێشێواوی و دوورەپەرێزی لە بەرنامەی خوا ڕۆچوون.! جا ئایا ئەو کەسەی کە دەمەو ڕوو کەوتووەو بەو حاڵەوە دەڕوات، چاکتر ڕێگە دەزانێت؟ یان ئەو کەسەی کە بەسەر شەقامێکی ڕاست و ڕەواندا بە ڕێك و پێکی دەڕوات بەڕێوە؟!)).

پەروەردگاری مەزن ڕۆزی و سەرکەوتنی پێکەوە باسکردووە، چونکە مرۆڤ بۆ لابردن و دوورخستنەوەی شەڕ و خراپەی دوژمنەکەی و بەدەست هێنانی بەرژەوەندی

ڕۆزی و بژێوی پێویستی بە یارمەتی و چاودێری کەسێك هەیە، واتە بە یارمەتی دەرو ڕۆزی دەرێکی زانا و دانا و لێزان کە بەسەر تەواوی کاروبارەکاندا زانای و ئاگاداری هەیە و ئەمە تەنیا پەروەردگارە کە لە هێز و توانا، زانست، کارزانی و حیکمەت و سەروەتی تەواو بەرخوردار و بەهرەمەند و توانای ئەوەی هەیە کەوا ڕۆزی و سەرکەوتنی پێ ببەخشێ.

ئەمە نیشانەی کەماڵ و تەواوی ناسین و بیرتیژی و هۆشیاری مرۆڤە کە، هەر کاتێ خوداوەند ئەوی تووشی بەڵاو موسیبەتێ کرد، کەسێ یا شتێ توانای چارەسەر کردنی ئەوی نییە — جگە لە ڕێگەی شەریعەت و فەرمانەکانی خوداوەند نەبێ — وە هەرکاتێ بەخششێکی پێ ببەخشێ: هیچ کەسێ ناتوانێ لێی زەوت بکات و لێی بسێنێتەوە.

پەروەردگاری گەورە و بە دەسەڵات لە بارەی جادووگەرەکانەوە دەفەرمووێت: ﴿...وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ...﴾ بەقەرە ١٠٢.

واتە: ((هەرچەندە ئەو جادووگەرانە ناتوانن هیچ زیانێك بە کەس بگەیەنن، مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت)).

ئەوە تەنیا پەروەردگارە کە خۆی بەوە ئەستۆدار و ئۆدەداری ڕۆزی و سەرکەوتنی بەندەکانی دەزانێ (لە ڕێگەی ڕێنموونییەکان و شەریعەتەکان و هەندێ جارییش بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ).

ئیمام ئەحمەد دەفەرمووێت: عبدالرزاق لە عیمرانەوە گێڕاویەتییەوە کە لە وەهبی بیستووە کە پەروەردگار لە یەکێ لە پەرتووکە ئاسمانییەکاندا[٦٨] فەرموویەتی: ((سوێند بە گەورەیی و شکۆمەندیم.!! گەر کەسێ ڕوو بکاتە من و پەیوەست بێت پێمەوە، ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەشی کە لەناویاندایە دژ بە ئەو یەك بگرن، من (پەروەردگار) لە نێوانیاندا ڕێگە چارەیەکی پیشان دەدەم.

٦٨ دیارە مەبەست لەو پەرتووکە ئاسمانیانە، قورئانی پیرۆز و تەورات و ئینجیل و زەبوورە، خودای گەورە خۆیشی باشتر دەزانێ، وەرگێڕ کورد.

بەڵام هەر کەسێ کە ڕوو نەکاتە من و پەیوەست نەبێ (بەڕێنموونییەکانمەوە) ئەوا لە بەرامبەر تەواوی ئامرازەکانی ئاسمانەکان و زەویدا بێ بەشی دەکەم و زەوی لە ژێر پێیدا دەقڵیشێنمەوە، لە نێو هەوادا ئاوێزانی دەکەم و دواتر بە حاڵی خۆی بەجێی دێڵم.

من خۆم بەندەکەم تێر دەکەم بە تایبەتی ئەو کاتەی کە ئەو گوێڕایەڵی من بکات. پێشتر ئەوەی شتێکی لەمن بوێت و داوا بکات ئەو شتەی پێ دەبەخشم و پێش نزاو پاڕانەوە خواستەکەی قبووڵ دەکەم و جێ بەجێی دەکەم، چونکە من بە ئاگاترم لەو نیاز و خواستانەی کە ئارامی و ئاسوودەیی بە ئەو دەبەخشن)).

ئەم بابەتە – واتە بژێویی و سەرکەوتن و سەرشۆڕیی و سەرفرازی – تەنیا لە پەروەردگاریان دەزانی و لەو بابەتەی کە لە بەشی پێشوودا خرایە ڕوو باسی لێوە کرا – واتە ناسینی ڕەبووبیبەت و ئولوهییەتی خوداوەند – لەژیانی تێکڕای خەڵکی دا کاریگەرییەکانیان ڕوونتر و دیارترە، بۆیە لەم بارەیەوە لەپێش بابەتە پێشووەکەی تردا ئەوان خراونەتە بەر بانگ کردنی قورئانی پیرۆزەوە و پێغەمبەرەکان (سەلامی خوایان لەسەر بێت) پێش ئەم بابەتە بۆ فێر بوونی ئەوان بە بابەتەکەی پێشووەوە هەوڵ و کۆششیان کردووە.

هەرکاتێ کەسێ بە جوانی لەقورئان تێ بگات و تێ بفکرێ، بۆی دەردەکەوێ و دەزانێ کەوا خوداوەند لەم مەسەلە و بابەتەدا خەڵکی بانگ دەکات بۆ فێر بوونی بابەتەکەی پێشوو پێویستی ئەم مەسەلەیە پشت بەستن، داوای یارمەتی کردن، نزا و پاڕانەوە، داواکردن، خۆشەویستی و پەرستنی تەنیا پەروەردگارە و بەس. چونکە تەواوی بەخشش و نیعمەت و چاکەکان هی خوداوەندە. هەرکاتێ لەم ڕێگەیەوە ئەویان خۆش بوێ و بیپەرستن و پشتی پێ ببەستن، بە ئاراستە و ڕەهەندی یەکەم واتە یەکخواپەرستی (ئولوهیەت و ڕوبووبیەت) دەگەن. بۆ نموونە ئەگەر بەلا و پێشهاتێکی گەورە بۆ کەسێ بێتە پێشەوە، یا بە توندی تووشی هەژاری بێت، یاخود ترس و دڵەڕاوکێ دایبگرێ، بەڵام ئەو لە بارەگا و دیوانی پەروەردگاردا دەست بە نزا و

پاڕانـــەوە بکـــات و بلاڵێتـــەوە و بگریـــت (وە لـــە ڕێنموونییـــەکان و شـــەریعەتەکانی پەروەردگار بۆ لابردنی و چارەسەرکردنی گرفتەکانی کەڵك وەربگرێ) پەروەردگار تامو چێژی موناجات و نزا و پاڕانەوەی پێدەبەخشێت و گرفت و نیگەرانییەکەی چارەسەر دەکات و لای دەبات.

## تەوەری شەشەم: زیانەکانی وابەستە بوون بە غەیری خواوە:

یـەکێکی تـر لـە هۆکـارە پەیوەندیـدارەکان بـە خۆشـبەختی و کامـەرانی مرۆڤـەوە ناسینی ئەم حەقیقەت و ڕاستییەیە کە، وابەستە بوون بە غـەیری خـواوە – ئەگـەر لـە ڕادەبەدەر و زیاد لە ڕێـژەی پێویـست و لـە دەرەوەی سـنووری شـەرعی بێـت – زیـان گەلێکی زۆری بۆ مرۆڤ بەدواوە دەبێـت و لـە ڕێگـەی بەندایـەتی کردنـی پـەروەردگاردا تووشی گرفتی دەکات.

هــەرکاتێ ئینـسانێ زیـاد لـە پێویـست بەخواردنـەوە، پۆشـین و خـەوتن لـە گـەڵ هاوســەرەکەی دا وابەســتە بێــت و خۆشــی بووێــت، ئــەو کاروکردەوانــە لــە ڕێگــەی گوێڕایەڵی، پەرستش، پاك کردنەوە و چاکسازی گرفت گەلێ دێنێتە پێشەوە.

مرۆڤ هەر کەس و هەر شتێکی جگە لە پـەروەردگار خـۆش بووێـت، دەبـێ ڕۆژێ لـە ڕۆژان وازی لێ بهێنێ یاخود لە دەستی بدات، هیچ چارەیەکی تـری نییـە. ئەگـەر ئـەوی بەپێچەوانەی ڕەزامەندی خوداوەندەوە خۆش ویستبێ، بەدڵنیاییەوە ئەو خۆشویستن و ئەویندارییە بە زەرەری ئەو دەبێت و هەمان ئەو ئەویندار و خۆشەویستە لە دونیا یا لـە دواڕۆژدا دەبێتە مایەی ڕەنـج و ئـازار و مەینـەتی ئـەو و بـە زۆری لـە هـەردوو دونیـادا ڕەنجو ئازاری تووش دەبێت.

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەڵات دەفەرموێت: ﴿...وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (٣٤) يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى

بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ﴾ تەوبە ٣٤– ٣٥.

واتە: ((جا ئەوانەی کە ئاڵتوون و زیو کۆ دەکەنەوە و قایمی دەکەن و لەپێناوی ڕێبازی خوادا و بۆ ڕەزامەندی ئەو نایبەخشن و ئەوە مژدەی سزایەکی پڕ ئێشیان بدەرێ..!! (ئەو سزا سەختە) لە ڕۆژێکدا دەبێت ئەو پارە و سامانەی کۆیان کردووەتەوە، لە دۆزەخدا سوور دەکرێتەوە، ناو چاوان و لاتەنیشت و پشتیانی پێ داخ دەکرێت، ئینجا پێیان دەوترێت: ئەمە ئەو سامانەیە کە کۆتان دەکردەوە بۆ خۆتان، دە بچێژن سزای ئەوەی کە بۆ خۆتان کۆ دەکردەوە)).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ بِهَا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَافِرُونَ﴾ تەوبە ٥٥.

واتە: ((ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەی ئیماندار! نە ماڵ و سامان و نە نەوەیان سەر سامت نەکات بە باشیان بزانیت، چونکە بە ڕاستی خوا دەیەوێت لە ژیانی دونیادا تووشی بەلاّ و سزایان بکات لە ڕێگەی ماڵ و سامان و نەوەیانەوە و گیانیان دەربێت، لە کاتێکدا کە ئەوان بێ باوەڕن)).

## _ زەرەر و زیانەکانی دونیا ویستی (وابەستەبوون بە دونیاوە):

دونیا ویستەکان بەردەوام تووشی سێ شت دەبن:

* سەرقاڵ بوونی بەردەوام.
* ڕەنج و ئازاری هەمیشەیی.
* پەرۆشی و پەشیمانی بێ کۆتا.

ئەمە لەو ڕووەوەیە کە خۆش ویستوانی دونیا بەو ئەندازەیەی کە ماڵ و سەروەت کۆ بکەنەوە، چاویان لە دوای بەدەست هێنانی ماڵ و سەروەتی زیاترە و تەماشای دەوڵەمەندەکانی سەرووی خۆیان دەکەن. (دەتوانین بڵێین سروشتی مرۆڤ بەجۆرێکە

كەوا حەز بە زیادە دەكات لەماڵ و سەروەتدا و بەهیچ شتێ تێر نابێت، مەگەر خۆڵ تێری بكات!. وەرگێڕی كورد)

بە هەمان شێوە كە لە فەرموودەیەكی صەحیحدا لەپێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) هاتووە كە فەرموویەتی: ((لوكان لإبن آدم واديان من مال لابتغى لهما ثالثاً)).[٦٩]

واتە: ((ئەگەر مرۆڤ هێندەی دوو شیو (دۆڵ) سەروەت و سامانی هەبێ، ئارەزوو دەكات كە خۆزگە شیوێكی ترم هەبووایە، واتە داوای شیوی سێیەمیش دەكات!)).

ئیبن أبی دنیا دەگێڕێتەوە كە: حەسەنی بەصری (خوای لێ ڕازی بێت) بۆ ئەم مەبەستە نامەیەكی بۆ عومەری كوڕی عەبدوالعەزیز (خوای لێ ڕازی بێت) نووسی: ((دونیا ڕێگەی سەفەرە، نەك شوێنی مانەوە، مرۆڤ بۆ سزادان و تۆڵە سەندنەوە هاتووەتە ئەم دونیایەوە.! (دیارە مەبەست لەوەی كە مرۆڤ بە مەبەستی تۆڵە سەندنەوە ڕەوانەی دونیا كراوە.! بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە كاتێ باوە ئادەم و دایە حەوا دەكەونە ژێر كاریگەری پیلان و فرِوفێڵەكانی شەیتان و لەبەری دارێ دەخۆن و دواتر بە مەبەستی نا فەرمانی كردن بەرامبەر بە فەرمانەكانی خودا، پەروەردگار بەو مەبەستەوە ڕەوانەی سەر زەوی كردن. وەرگێڕی كورد).

ئەی سەركردەی باوەڕداران.! چاكترین توێشووی دونیا واز هێنانە (لەخۆش ویستن‌و وابەستە بوون بەدونیاوە)، بێ نیاز بوون لەدونیادا وەك نیازمەند بوون وایە، دونیا هەر جارە و كەسێ دەكاتە قوربانی، ئەوەی كە دونیای خۆش دەوێ و دونیا ویستە، بچووكی دەكاتەوە و ئەو كەسەیش كە بەدوای كۆكردنەوەی ماڵ و سەروەتەوەیە (بەبێ گوێدانە هاوكێشە شەرعییەكان لە ویست و نییەت و كڕین و فرۆشتنەكانیدا)، لە دواڕۆژدا هەژار و بێ بەش دەبێت.

---

٦٩ متفق عليه.

دونیای (كە هەمووی ببێتە مایەی هەم و خەم و وابەستە بوونی ئادەمی و زیادە لە پێویست دڵی پێ خۆش كات) وەك ئەوە وایە كە یەكێ لە ئێمە ئاگایانە جامێ ژەهر بخواتەوە و گیانی خۆی لەدەست بدا!.

ئەی گەورەی باوەڕداران.! تۆ لە دونیادا وەك كەسێ وابە كە برین و زامی خۆی چارەسەر دەكات و بۆ ڕاكردن و دەربازبوونی لە مەینەت و ئازاری درێژخایەن خۆڕاگرو ڕاوەستاو دەبێ لە بەرامبەر دەوا و دەرمانی تاڵ بە مەبەستی چارەسەر.

ئەی گەورەی باوەڕداران.! لەم دونیا هەڵخەڵەتێنەرە، پڕ لە داو و تەڵە و خەیاڵ و پەرێشانی و كەساسییەیە بە ئاگابەو وریابە.! دونیایەك كە بە جۆرەها فرو فێڵ و كەساسی و پەرێشانی خۆی ڕازاندووەتەوە و مرۆڤەكانی هەڵخەڵەتاندووە و بەتوندی تامەزرۆی چاوپێكەوتن و بینینی خوازیارەكانییەتی و وەك كچێكی ڕازاوە وایە كە چاوەكانی سەرسام و دڵەكانی گیرۆدەی خۆی كردووە و تەواوی خوازبێنەكانی تووشی شەڕ و شۆڕ دەكات، ئەگەر تۆزێ مەجالی بینین و گەیشتن بە ئەویندار و عاشقێ بدات، هەڵی دەخەڵەتێنێ و تووشی لەخۆ بایی بوون و سەریاخی بوونی دەكات و دواڕۆژی لە بیر دەباتەوە و دڵی ئەو سەرقاڵ دەكات بەخۆیەوە و بەرەو ڕێگەی گومڕایی هانی دەدات و بەرەو پێشەوەی دەباتو لە كۆتاییدا پەشیمانی و ڕەنج و ئازارێ بەقورسایی شاخێك دەخاتە سەر شانیو لە ژێر ناڕەحەتییەكانی مردنو پەشیمانییەكانی لەدەست دانی هەموو شتێ لەناوی دەبات و تێكی دەشكێنێ.

بەڵام ئەوینداری كە پێی نەگات و نەیبینێت، ژیانی خۆی لە نێو غەم و پەژارە و نیگەرانی دا نقووم دەكات و تووشی تەواوی ناڕەحەتییەكانی دەبێتەوە، بەڵام هیچ كات بە ئامانجی خۆی ناگات و لە كۆتایی دا بەبێ توێشوو بەجێی دەهێڵێ و لە قیامەتیشدا لە شوێنی ویستراو بێ بەش دەبێت.

ئەی گەورەی باوەڕداران.! لە بری چاوچنۆكی و چڵێسی بۆ بەدەست هێنانی دونیا، بە توندی لێی دوور بكەوەرەوە و دوورە پەرێزی لێ بكە.! چونكە هەر كاتێ كە دونیا

پەرستان دەکەونە نێو خۆشی و کەیف خۆشییەکەوە، زۆری پێ ناچێ کە دەکەونە نێو چەرمەسەری و ناڕەحەتی و ئەزییەت و ئازارەوە. ئالوودە بوون و دڵ ڕەنجان و دەوڵەمەندی و هەژاری لە دونیادا پێکەوە گرێ دراون و لەناو چوون تێیدا لە گەڵ مانەوە مەودایەکی کەمیان هەیە و کەیفخۆشی و خەم و ناڕەحەتی دونیا پێکەوە تێکەڵی یەکتر بوون.

ئارەزووەکانی هەموویان درۆ و دەلەسەن و هیوا و ئومێد بوون پێی وەك نائومێدی‌و بێ هیوایی وایە، پاکییەتی ئەو شتێ نییە جگە لە پیس بوون و ژیان تێیدا شتێ نییە جگە لە ڕەنج و ئازار و دەردی سەری نەبێ.

ئەگەر پەروەردگاریش هەواڵێکی لێ نەدابای و نموونەیەکی لێ نەدەهێنایەوە، ئەوا فەوتاوی و نابوودی خودی دونیا خۆی، خەوتووەکانی لە خەو ڕادەپەڕاند و نەزان و بێ ئاگاکانیشی هۆشیار دەکردەوە، لە کاتێکدا کە پەروەردگار (جلّ جلالە) سەبارەت بە پەیوەست بوون و سەرقاڵ بوون (زیاد لە پێویست وەك هۆکارێ لەپێناو پەرستشدا) ئاگاداری داوە (ئاگاداری کردوونەتەوە).

بەلای پەروەردگارەوە دونیای (بە بێ ئیمان و باوەڕ) هیچ نرخ و بەهاو پلە و پایەیەکی نییە و لەو ساتەوە کە درووستی کردووە، بەچاوی بە بەزەیی و میهرەبانییەوە تەماشای دونیا پەرستانی، نەکردووە، (واتە ئەو کەسانەی کە دونیا دەپەرستن و پشتیان کردووەتە پەروەردگار و ناپەرستن و فەرامۆشیان کردووە، وەرگێڕی کورد) کلیلی تەواوی سەروەت و سامان و خەزێنەکانی دونیایان دایە دەست پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەڵام ئامادە نەبوو کەوا قبووڵی بکات. ! چونکە نەیدەویست شتێکی خۆش بووێت کەوا ببێتە هۆی کەمکردنەوەی خۆش ویستنی خودا لە دڵیدا. ! وە بیخاتە سەرتر لەو شوێنەی خوداوەند دایناوە. !

بۆیە ئەوەی – خۆش ویستنی سەروەت و سامان لە ڕادەبەدەر – لە چاکەکاران و پارێزکاران و کەسە پاکەکان دوور خستووەتەوە، بەڵام بۆ هەڵخەڵەتاندنی دوژمن و

ناحەزەکانی بواری پێداون و هەڵخەڵەتێنراوەکان، ئەوانەی کە سەروەت و سامانیان بەدەست هێناوە، هەست دەکەن و گومان دەبەن کە پەروەردگار بەهۆی دەوڵەمەندییانەوە ڕێزی گرتوون و پلە و پایەیانی بەرز کردووەتەوە و لە بیریان چووەتەوە کە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەندێ جار لە تاو برسییەتی دا بەردێکی دەبەست بە سنگی خۆیەوە!)).

حەسەنی بەصری لە شوێنێکی تردا فەرموویەتی: ((کەسانێ کە دونیایان زیاد لە پێویست و بەشێوەیەکی لە ڕادەبەدەر خۆش بووێت، ئەوا دونیا بە دارا هەڵیاندەواسێ و لەناویان دەبات.! دونیا بە هیچ و پووچ و بچووك بزانن، چونکە ئاسوودەترین و ئارامترین باروودۆختان بۆ دەستەبەر دەکات و فەراهەم دەکات)).

قسە لەسەر دونیا و سزا و تۆڵەی دونیا پەرستان و شوێنکەوتووانی دونیا (کە تەواوی هەم و خەمیان کۆکردنەوەی سەروەت و سامانە و بەس) زۆر فراوان و گەلێ زۆرە.

گەورەترین خەم و پەرێشانی ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە دونیای پاش مردن و بینینی پەروەردگار نییە، ئەوەیە کەوا بە هەمان ئەندازەی کە لە هەوڵ و کۆشش دابوون بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سەروەت لە دونیادا، ئەوا بە هەمان ئەندازەش تووشی پەشیمانی و خەم و خەفەت دەبن.

گەر دەتەوێت ئاگات لەو ڕەنج و ئازار و ناڕەحەتییە بێت کە دونیا پەرستان تووشی دەبن، ئەوا باروودۆخی ئەوانیش وەك باروودۆخی کەسێکی ئەویندار و گیرۆدە هەست پێ بکە، کە هەر کاتێ لە یارەکەی نزیك دەبێتەوە، ئەوا یارەکەی ڕووی لێ هەڵدەچەرخێنێ و بەڵێنەکەی خۆی ناباتە سەر، وازی لێ دەهێنێ و بەجێی دێڵێت و لەپێش چاو خۆشەویستەکەی دا لە گەڵ دوژمنەکەی دا دەبێتە هاوڕێ و ئەو لەو کاتەدا و لەو باروودۆخەدا لە خراپترین و سزادارترین باروودۆخی ژیانی دا جێگیر دەبێت.! چونکە ئەو یارەی کە ئەو ئامادەیە لەپێناوی دا گیانی خۆی بەخت بکات و

بیبەخشێ، بێ وەفا و پڕە لە ئازار و دڵ ئێشان، لە گەڵ هەرکەسێکدا کە دەبێتە هاوڕێ خێرا بۆ لای خۆی ڕایدەکێشێ، تەواو خیانەت کار و کەسێکی ناپاکە و ڕەگ و ڕیشەی نییە و هەر جارە و بەجۆرێ ڕەنگی خۆی دەگۆڕێ. دڵدار و یارێ کە لە گەڵ ماڵ و سەروەت و گیانی ئەویندارەکەی — کە پەرێشان و گیرۆدەی ئەوە — ناپاکی دەکات، ئەوینداری کە هیچ کەس و هیچ شتێ نابینێ جگە لە ئەو و هەروەها جگە لە ئەویش کەسی تر ناناسێ و جگە لە گەیشتن و بوون لە گەڵ ئەودا هیچ هەم وخەمێکی نییە. ئەگەر ئەو ئەویندار و عاشقە جگە لەم عەودال و شەیدا بوون و وابەستە بوونە بەو دڵدار و یارە لەدەست چووەی هەم و خەمێکی تری نەدەبوو ئەمە بۆ ئازاردانی ئەو بەس بوو لە کاتێکدا ئەو دڵدارە ئەوی لە تەواوی خۆشی و تام و چێژەکانی تر بێ بەش کردووە و سەدان بەرامبەری ئەو خۆشی و کەیف خۆشییەی ئەویندارەی لە ڕەنجو ئازاردا دەبێت و لە هەمووی خراپتر لە کۆکردنەوەی توێشووی دواڕۆژ و هەوڵ و تێکۆشان بۆ بەرژەوەندی دونیا و بەختەوەری و کامەرانی دواڕۆژ بێ ئاگای کردووە.

## _ ڕەنج و ئازاری هاودەمی لە گەڵ غەیری پەروەردگاردا:

مەبەست ئەوەیە ئەگەر بێت و کەسێ یاخود شتێ لەپێناو غەیری پەروەردگاردا خۆش دەوێت و لەپێناو بەندایەتی کردن، پەیڕەوی کردن و پەرستنی دا بەکاری نەهێنێت، هەمان ئەو خۆشەویستە دەبێتە هۆی سزا و ڕەنج و ئازار و دەردی سەری و پێش ئەوەی دونیای پاش مردنی بێت، ئەو لەم دونیایەدا تووشی سزا و بەلا گەلێکی زۆر دەبێت.

هەرکاتێ کە ڕۆژی دوایی بێتە پێشەوە، تەواوی خۆشەویستان جگە لەوانەی خۆی، دەسپێرێتە دەستی یار و خۆشەویستەکانیان و لە گەڵ ئەواندا لەخۆشگوزەرانی یاخود سزا و بەهەشت و دۆزەخدا دەکاتە هاوڕێ.

لەم پەیوەندییەدایە کەوا ماڵ و سەروەتی کەسێکی دەوڵەمەند — بێ ئیمان و ناپارێزکار — وەك مارێکی ترسناکی لێ دەکات و وە پێی دەڵێن (من هەمان ئەو

سەروەت و سامانەی تۆم، بڵێسە و کڵپەی ئاگر دەکا بە ڕوویدا کە، نێو چاوان و برۆ و پشتی ئەو دەسووتێنێ). [٧٠]

ئەوانەی کە تەواوی هەم و خەم و ئەوین و تامەزرۆییان بۆ کەسانی جوان و سەرنجڕاکێشە لە ڕێگەی حەرام و ناڕەواوە و بۆ تەماشاکردن و بەدەست هێنانی لە ڕێگەی ناڕەوا و ڕێگە پێ نەدراوەوە کەڵك وەردەگرن، لە گەڵ یار و دڵدارەکەیدا (معشوق) لە جەهەننەمدا لەپاڵ یەکتردا دایان دەنێن. (بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، مەبەست لەوەی سەرەوە ئەوەیە کەوا ئەو کەسانەی کە لە ڕێگەی ناڕەوا و حەرامەوە، تەماشای کەسانی ڕوومەت جوان و دەم و چاو جوان دەکەن و خۆشیان دەوێن،خۆشەویستییەکی وەها کە تووشی تاوان و لادانیان دەکات. کە لێرەدا زیاتر مەبەستی ئافرەتانە، چونکە پیاوان زیاتر دەکەونە ژێر کاریگەری جوانی و ناسکی ئافرەتانەوە، ئەوا لە دواڕۆژدا لە گەڵ ئەو کەسانەدا کۆ دەکرێنەوە. وەرگێڕی کورد).

پەروەردگاری گەورە و بەدەسەلاّت دەفەرمووێت: ﴿الأَخِلاَّءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلاَّ الْمُتَّقِينَ﴾ زوخرەف ٦٧.

واتە: ((دۆستان و برادەران هەر هەموو لەو ڕۆژەدا دوژمنی یەکترن، هەموو ڕقیان لە یەك دەبێتەوە، جگە لەو کەسانەی کە لەسەر بنچینەی تەقوا و خواناسین کۆبوونەتەوە و برایەتیان بەرپا کردووە)).

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەلاّت ئاماژەی بەم ڕاستی و حەقیقەتە کردووە کەوا کەسانێ کە لەم دونیایەدا لە سەر بناغە و بنەمای هاوەڵ بڕیاردان و بێ باوەڕی (شرك وكفر) یەکتریان خۆش دەوێ، لە ڕۆژی دوایی دا نەفرین لە یەکتر دەکەن و بەبێ ئەوەی کەسێ یاخود شتێ چاودێرییان بکات و ئاگای لێیان بێت، دەخرێنە نێو ئاگری جەهەننەمەوە.

---

٧٠ اخرجه البخاري (١٤٠٣).

دڵدار و یار (عاشق) لە دونیا و دواڕۆژدا لە گەڵ ئەویندار و خۆشەویستەکەی (معشوق) خۆیدا هاوڕێ دەبێت. لە بەر ئەوەیە کە پەروەردگاری مەزن و بەدەسەڵات لە دواڕۆژدا بە بەندەکانی خۆی دەفەرموێت: ((مەگەر نادادپەروەرانەیە، کە ئەگەر بێت و هەر کەسێك لە گەڵ ئەو کەسەیدا کە کردوویەتی بە گەورە و خۆشەویستی خۆی لە دونیادا، بکەیتە هاوڕێ و هاودەمی یەکتر)).

(لێرەدا مەبەست ئەوەیە کەوا ئەو کەسەی کە لە دونیادا لە گەڵ کەسانی تاوانبار و ملهووڕدا هاوڕێ و هاودەم بووە و کردوونی بە گەورە و خۆشەویستی خۆی، ئەوا پەروەردگار لە دواڕۆژیشدا هەر دەیانکاتە هاوڕێ و هاودەمی ئەو کەسانە و لە گەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا هەڵس و کەوتیان لە گەڵ دەکات و حەشریان دەکات و ئەمەش هیچ نادادپەروەرانە نییە، بەڵکو بگرە کارێکی دادپەروەرانە و ڕەوایە. وەرگێڕی کورد).

پێغەمبەری خوداش فەرموویەتی: ((المرء من احب)).[٧١]

واتە: ((مرۆڤ لە گەڵ خۆشەویستەکەی دا هاودەم و هاوڕێ دەبێ)).

پەروەردگاری مەزن و بە توانا دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلا (٢٧) يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا (٢٨) لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنْسَانِ خَذُولًا﴾ فورقان ٢٧ — ٢٩.

واتە: ((ڕۆژێك دێت ستەمکار قەپ دەکات بە هەردوو دەستی خۆیدا و گاز لە هەردوو دەستی خۆی دەگرێت (لە پەشیمانی داو) دەڵێت: خۆزگە لە گەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ڕێبازی ئیمانم بگرتایە.! مەرگ بۆ خۆم، خۆزگە فلاّن کەسم نەکردایەتە هاوەڵ و دۆستی خۆم (چونکە سەری لێ شێواندم). بەڕاستی گومڕا و سەر لێشێواو و وێڵی کردم لە بەرنامەی خوا، دوای ئەوەی کە پێم ڕاگەیەنرابوو شەیتان هەمیشە و بەردەوام هانی مرۆڤ دەدات بۆ گوناه و تاوان، لە کاتی تەنگانەشدا پشتی بەر دەدات!)).

---

٧١ اخرجه مسلم (٢٦٤٠).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ (٢٢) مِنْ دُونِ اللَّهِ فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ (٢٣) وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ (٢٤) مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ﴾ صافات ٢٢ — ٢٥.

واتە: ((خوای گەورە فەرمان دەدا بە فریشتەکان هەموو ئەوانەی ستەمیان کردووە کۆیان بکەنەوە، خۆیان و هاوسەرانیان، خۆیان و هاوشێوەیان و ئەو شتانەش کە دەیانپەرست... لە جیاتی خوا، ئینجا ڕێنماییمان بکەن بۆ ڕێگەی دۆزەخ، چونکە بێ باوەڕ و تاوانبارن. لە کاتی ڕاپێچ کردنیاندا فەرمان دەدرێت: ئادەی بیانوەستێنن، بێگومان ئەوان پرسیار لێکراون. پێیان دەوترێت: ئەوە چیتانە بۆ پشتی یەکتر ناگرن، بۆ بەرگری لە یەکتر ناکەن؟!)).

حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب فەرموویەتی: ((ازواجهم! واتە: هاوشێوە و هاو ڕێبازانی ئەوان)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ﴾ تەکویر ٧.

واتە: ((کاتێ گیانی هەرکەسێ دەگەڕێتەوە بۆ لاشەی و جووت دەبێتەوە لەگەڵیدا)).

هاوشێوە و هاوڕێکان لەپاڵ یەکتردا دادەنێن و دەیانکەنە هاودەم و نزیکی یەکتر، چاکان لە گەڵ چاکاندا و خراپەکارانیش لە گەڵ کەسانی خراپدا کۆ دەکەنەوە و دەیانکەنە هاودەم و هاوڕێی یەکتر.

مەبەست ئەوەیە کەوا هەر کەسێ، کەسێ یا شتێکی تری جگە لە پەروەردگار (زیاد لە پێویست و ڕێگە پێدراو) خۆش بووێت، ئەگەر بەدەستی بهێنێ، یاخود نەتوانێ پێی بگات، بەو ئەندازە و ڕێژەیەی کە پەیوەندی و خزمایەتی و نزیکی لە گەڵی دا هەیە، تووشی ڕەنج و ئازار و پەرێشانی دەبێت.بۆ بەدەست هێنانی، تووشی ڕەنج و ئازارگەلێکی زۆر دەبێت و گەر لە دەستیشی بدات، هێندە داخ و خەفەتی بۆ دەخوات، دە بەرامبەر ئەو تام و چێژ و خۆشییەی کە لێی بینیوە.

فمـا فی الارض اشقی من محب   وان وجد الهدی حلو المذاق
تراه بـاكيـا فی كـل حـال   مخـافـه فـرقة او لاشتيـاق
فيكـی ان نــأوا شـوقـا اليهـم   ويبكی ان دنوا حذر الفـراق
فتسخـن عينــه عنـد التـلاقي   وتسخن عينه عنـد الفـراق

واته: ((چاره ڕەشتر لـه ئەوینـدار (عاشق) لـه سـەر ڕووی زەوی کەسـی تـر نییـە، ئەگـەر چـی وا گومـان دەبـات و هەسـت دەکـات کـەوا شـوێنکەوتنی هـەوا و ئـارەزوو شـیرینه. بـەڵام هەمیـشه لـه بـاروودۆخی گریانـاوی دا دەیبینـی.! چـونکه بـه هـۆی تامەزرۆیی بینینی یار، یاخود دوورکەوتنەوه لێـی، هەمیـشه لـه تـرس و دڵەڕاوکێدایـه. هەرکاتێ یارەکەی (معشوق) ڕووی لێ هەڵدەچەرخێنێ و لێی دوور دەکەوێتـەوه لـه تـاو تامەزرۆیی بینینیدا دەست دەکات بـه گریـان و فرمێـسك ڕشـتن و هـەر کاتێکیش کـه دڵدارەکەی لەپاڵیدا بێت بەهۆی ترس و دووری و دابـڕان تووشـی نیگـەرانی و پەرۆشـی دەبێت. له کاتی بینینیدا چاوەکانی له تام هەنسك و فرمێسكدا گەرم دەبن و له کـاتی فیراق و دابڕانیشدا دووباره چاوەکانی پڕ دەبن له فرمێسك و دەگریت)).

لێکۆڵینەوه، به دواداچوون، ئەزموون و پەند وەرگرتن، ئەم ڕاستی و حەقیقەتـەمان بۆ پشت ڕاست دەکەنەوه. بۆیه پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفـەرموویت: ((جگه له زیکرو یاد (بەندایەتی و پەیڕەوی کردن لـه ڕێنـوێنی پـەروەردگار) هـەروەها ئەوەی که دەبێته هۆی کامەرانی و خۆشبەختی مرۆڤــ، تـەواوی دونیـا و ئـەوەش کـه لەدونیادایه، نەفرینیان لێ کراوه)).

زیکـرو یـادی خوداوەنـد بـه واتـای تـەواوی جۆرەکـانی بەندایـەتی و پـەیڕەوی کردنەکانـه، هەرکەسـێ لـه هـەر بوارێکدا لـه فەرمانـەکانی پـەروەردگار (جلّ جلالـه) پەیڕەوی بکات و له قەدەغـەکراوەکانی (نـەهی) دوورەپـەرێزی بکـات، ئـەو کـارەی بـه زیکر و یاد و پەرستشی پەروەردگار له قەڵەم دەدرێ، ئەگەرچـی زمانیـشی بـه زیکـری خوداوەند پاراو نەبێت و سەرقاڵ نەبێت لەو کاتەدا.

بەڵام هەرکەسێ لە ژیانی دا ڕێگەی بەندایەتی پەروەردگار بگرێتە بەر (وە لە کاروباری بژێوی ژیانیدا هاوتەریب و هاوکێشە ئاینییەکان لەبەرچاو بگرێت) بە هیچ جۆرێ ناکەوێتە بەر ئەو نەفرین و لەعنەتەوە.

## _ بچووکی وهیچ وپوچی وابەستە بوون بە دروستکراوەکانەوە:

هۆکاری حەوتەم سەبارەت بەخۆشبەختی مرۆڤ، ئەوەیە کە لە پشت بەستن و ڕوو تێکردن بۆ غەیری پەروەدگار (جل جلاله) کە بە دڵنیاییەوە خراپە و خراپەکاری و زەرەر و زیانی زۆری بەدواوەیە دەبێ دوورە پەرێزی بکات و لێی دوور بکەوێتەوە.

خەڵکانێ کە بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندی و لابردنی زەرەر و زیان لە ژیان و دواڕۆژیاندا — دونیا و قیامەت — جگە لە ئاین و ڕێنموونی پەروەدگار، لە بیروباوەڕ و کاروکردەوەدا پەیوەست دەبن، بە پێچەوانەی هیوا و ئارەزووەکانیان ڕووبەڕووی گیرو گرفت، لەمپەر و چارەنووسێکی تەواو خراپ دەبنەوە، وە لە هەمان لایەنەوە چاوەڕێی سەرکەوتنیان لێوە دەکرد، تووشی شکست و تێشکان دەبنەوە و لە بری ستایش و پیاهەڵدان، خراپە باسکردن و بچووك کردنەوە و پاش ملە دەبیستن. تەواوی ئەوانەی کە وتران، خاوەنی نیشانە گەلێکن لە قورئان و سوننەتدا و لێکۆڵینەوە و ئەزموون ئەوانەی سەلماندووە.

پەروەردگاری مەزن و بەدەسەلات دەفەرموێت: ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا (٨١) كَلَّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾ مەریم ٨١ — ٨٢.

واتە: ((ئەو بێ باوەڕانە لە جیاتی خوا جۆرەها شتی تریان کردوّتەوە خوای خۆیان تا پایەداری و دەسەلاتیان (بە خەیاڵی خۆیان) دەست بکەوێت. نەخێر، وا نییە (خەیاڵیان خاوە)، ئەو شتانەی ئەوان دەیپەرستن، (لە ڕۆژی قیامەتدا) باوەڕیان بە پەرستنی ئەوان نییە و ناڕەزایی دەردەبڕن، بەڵکو بە سەختی دژایەتیان دەکەن و بەرپەرچیان دەدەنەوە)).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لَعَلَّهُمْ يُنْصَرُونَ (٧٤) لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُنْدٌ مُحْضَرُونَ﴾ یاسین ٧٤ — ٧٥.

واتە: ((سەرەڕای ئەم هەموو ناز و نیعمەتە ئاشکرایە، نەفامان: لە جیاتی خواپەرستی، بت و شتی تر دەپەرستن و بۆ ئەوەی لە تەنگانەدا کۆمەکی بکرێن و سەر بخرێن. بەڵام ناتوانن سەریان بخەن بەڵکو هەر ئەمان بوونەتە سەرباز و پاسەوان بۆ بتەکان و هەمیشە لە خزمەتیاندا ئامادە کراون)).

واتە ئەوانە بە هۆی خوا ناڕاست و درۆزنینەکانیانەوە تووڕە دەبن و درووست وەك ئەوەی کە چۆن سەربازێ بەرگری لەخاك و وڵات و گەلەکەی دەکات، لە گەڵ نەیارانیدا دەجەنگێ، لە کاتێکدا ئەو خودا درۆزنینانە بە هیچ جۆرێ توانای بەرگری کردن لە خۆیان و سەرخستنی ئەوانیانی نییە و جگە لە بارو بارگرانییەك بەسەریانەوە هیچی تر نین.

پەروەردگاری مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِنْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمُ الَّتِي يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ لَمَّا جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ﴾ هود ١٠١.

واتە: ((ئێمە ستەممان لێ نەکردن بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد، ئەوسا ئەو پەرستراوانەیان کە لە جیاتی خوا هاواریان لێ دەکردن، فریای هیچ شتێکیان نەکەوتن کاتێك فەرمانی پەروەردگاری تۆ هات، هیچیان بۆ زیاد نەکردن جگە لە تیاچوون نەبێت!)).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿فَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ فَتَكُونَ مِنَ الْمُعَذَّبِينَ﴾ شوعەرا ٢١٣.

واتە: ((کە واتە ئەی ئیماندار، لە گەڵ خوادا هانا و هاوار بۆ بەناو خوایەکی تر مەبە، چونکە بە هۆی ئەوەوە تۆش لە سزا دراوان دەبیت)).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿لَا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَخْذُولًا﴾ ئەسرا ٢٢.

واتە: ((ئەی ئینسان هەرگیز نەکەیت خوایەکی تر بکەیتە هاوتای خوا و هاوەڵی بۆ بڕیار بدەیت، چونکە بەو کارەت زەبوون و خەجاڵەت دەبیت)).

مرۆڤی هاوەڵ بڕیاردەر (موشریك) لەو خوایەی کە کردوویەتی بە پەروەردگاری خۆی، هەندێ جار چاوەڕێی سەرکەوتن و یارمەتی دان و هەندێ جاریش چاوەڕێی ستایش و هاندانی دەکات. پەروەردگاری مەزن (جلّ جلاله) ئێمە و ئەوانی ئاگادار کردووەتەوە و تێی گەیاندووین کە، درووست پێچەوانەی پێشبینی و چاوەڕوانییەکانی خۆیان دەبینن و تووشی سەر لێشێواوی و نەگبەتی و چارەڕەشی دەبنەوە.

مەبەست ئەوەیە کە: ڕووتێکردن و پشت بەستن بە پەروەردگار لە بیروباوەڕو کارو کردەوەدا (بیروباوەڕی یەکخواپەرستی و کاروکردەوەی شەرعی و ڕێگە پێدراو) هۆکارو بناغەی ئەساسی سەرکەوتن و سەربەرزی مرۆڤەکانە لە هەردوو دونیادا، بەڵام ڕووتێکردن بۆ لای کەسێکی تر جگە لە (الله)و هەڵمژینی بەختەوەری و خۆشبەختی جگە لە ڕێگەی ڕێنموونی دا، دەبێتە هۆ و بناغەی سەرلێشێواوی و چارەڕەشی و کلۆڵی و سزای دونیا و دواڕۆژ.

لە ڕاستی دا، خێر و چاکەی دڵ و بەختەوەری و کامەرانی و دەرباز بوونی دڵ لە (بەندایەتی کردن و داوای یارمەتی کردن) لە پەروەردگاردایە و بەس!.

وە بەدبەختی و چارەڕەشی و لەناوچوون و زەرەر و زیانهای کە لە ئێستە و داهاتوودا تووشی دەبن، لە (بەندایەتی کردن و داوای یارمەتی کردن) لە درووستکراوەکانەوە سەرچاوە دەگرن.

## تەوەری حەوتەم: دەسکەوتی دروستکەر و دروستکراو:

هۆکاری هەشتەم سەبارەت بە بەختەوەری و خۆشبەختی مرۆڤ، ناسینی ئەم حەقیقەت و ڕاستییەیە کە، پەروەردگار تەواوی بەخشش و نیعمەتەکانی لە خزمەت مرۆڤەکاندا داناوە و خۆی بە تەواوی لێیان بێ نیازە و پێویستی پێیان نییە. پەروەردگاری بێ نیاز، بەخشندە، بە بەزەیی ومیهرەبانە و لە گەڵ بێ نیازیدا تێکڕای ئەو شتانەی کە پێویستە، لە خزمەت دروستکراوەکانیدا داینـاون، بەرامبەر بە دروستکراوەکانی ویست و ئیرادەی خێری هەیە و شەڕی لێ دوور خستوونەتەوە، ئەوەش نەك لە بری ئەوەی کەوا دروستکراوەکانی قازانج و سوودێکی بۆ فەراهەم بکەن و شەڕ و خراپەیەکی لێ دوور بخەنەوە. چونکە پەروەردگار بەو بۆنەیەوە دروستکراوەکانی خۆی بەدی نەهێناوە، تا کەم و کوڕی خۆی بە تەواوی ئەوان و لاوازی خۆی بە هێزو توانای ئەوان چارەسەر بکات و فەراهەمی بکات و بە هیچ جۆرێ پێویستی بە دروستکراوەکانی نییە و لێیان بێ نیازە، سەبارەت بەوەی کەوا ڕۆزی ئەو بدەن و کەڵك و قازانجێکی پێ بگەیەنن و یاخود بەرگری لێ بکەن.

پەروەردگاری مەزن و بە توانا دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ (٥٦) مَا أُرِيدُ مِنْهُمْ مِنْ رِزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَنْ يُطْعِمُونِ (٥٧) إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ زاریات ٥٦ — ٥٨.

واتە: ((بێگومان من پەری و ئادەمیزادم درووست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن. نە ڕۆزیم لێیان دەوێت نە خواردن و خواردنەوە. ! چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی ڕۆزی بەخشە و خاوەنی هێز و دەسەڵاتی پتەوە)).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ وَلِيٌّ مِنَ الذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا﴾ ئەسرا ١١١.

واتە: ((بشڵێ: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە کەسی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی و ڕۆڵەشی هەر نییە، هەروەها لە موڵك و مەملەکەتیدا کەسی نەکردووە بە شەریك و هاوتای خۆی، هەرگیز بە هۆی بێ دەسەڵاتی و کەم توانینەوە کەسی

نەکردووە بە یاوەر و یاریدەدەری خۆی، لەبەر ئەوە هەمیشە (الله اکبر) بڵێ و ئەو بە گەورە و مەزن بزانــە)).

سەرپەرشتی و ئاگاداری کردن لە درووستکراوەکان لە لایەن پەروەردگارەوە هیچ کات و بە هیچ جۆرێ بە هۆی لاوازی و کەم و کوڕی خۆیەوە – خودی خوداوەند – نییە، بە پێچەوانەی سەرپەرشتی و خۆش ویستن و ئاگاداری کردنی مرۆڤەکان لە یەکتر، خوداوەند تەنیا لە سەر پایە و بناغەی ڕەحمەت، خۆشەویستی و بە بەزەیی و چاکەی خۆیەوەیەتی کە هەواداران و شەیدایانی خۆی خۆش دەوێت و لە گەڵیاندا بە بەزەیی و میهرەبانە.

بەڵام مرۆڤەکان بەو جۆرەن کە پەروەردگار لە بارەیانەوە دەفەرموویت: ﴿...وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنتُمُ الْفُقَرَاءُ...﴾ موحەممەد ٣٨.

واتە: ((هەر خوا خۆی دەوڵەمەند و بێ نیازە، هەر ئێوەن هەژار و نەدار و کەم دەست و بە نیاز)).

مرۆڤەکان بە هۆی لاوازی و پێویستی و نیاز لە ئێستە و داهاتوودایە کە چاکە لە گەڵ یەکتردا دەکەن، ئەگەر بە ئامانجی بەدەستهێنانی بەرژەوەندی و قازانجێکی ماددیی و مەعنەوی نەدەبوو هیچ کاتێ چاکەیان لە گەڵ یەکتردا نەدەکرد و ئاگایان لە یەکتر نەدەبوو. لە ڕاستی دا کەسی ئاگاداری کەر و چاودێری کەر، ئاگاداری لە خۆی دەکات و چاکە و چاکە کردن لە گەڵ خەڵکی دا بەهۆکارێ دەزانێ بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندی و دوورخستنەوە و لابردنی زەرەر و زیان و خراپە. ئامانج و مەبەستی ئادەمی کەوا ئاگاداری و چاودێری خەڵکانی تر دەکات و هاوکارییان دەکات لە دوو شت زیاتر نییە، یا ئەمەیە کەوا چاوەڕووانی ئەوەیە کەوا ڕاستەوخۆ لەلایەن ئەو کەسانەی کە چاودێری و هاوکاری کردوون، بکەوێتە بەر چاودێری و هاوکارییانەوە، یاخود لەگەڵیدا ببێتە کەسێکی چاکەکار و بکەوێتە بەر چاودێری و هاوکارییانەوە، یاخود لەگەڵی دا ببێتە کەسێکی چاکەکارو بکەوێتە بەرستایش و پیا هەڵدانییانەوە، واتە

لەبەر ئەوە ئاگادار و چاودێرییان دەکات و پێویستییەکەیان جێ بەجێ دەکات، کە خودی ئەویش پێویستی بە هەمان چاودێری و هاوکاری و پێویستی دەبێت. لە ڕاستیدا بە چاودێری کردن و هاوکاری کردن و جێ بەجێ کردنی پێویستی و نیازەکانیان هاوکاری و چاودێری خۆی کردووە.

یاخود ئامانج و مەبەستی ئەو ئەوەیە کە لە دواڕۆژدا ئەجر و پاداشتی پەروەردگار بەدەست بهێنێ و لەم کاتەشدا دیسان ئەو کەسە چاکەی لە گەڵ خۆیدا کردووە و چاوەڕێی ئەوە دەکات، لە ڕۆژێکدا کە هیچ سەروەت و سامان و ماڵ و منداڵێ کە کێش‌و قورساییەکی وەهایان نییە، ئەو کارە چاکە و جێ بەجێ کردنی پێویستی و نیازی خەڵکییە، ببێتە هۆی بێ نیازی و ڕزگار بوونی، بەڵام ئەو بە هیچ جۆرێ لەبەر ئەم مەبەست و ئامانجە ناکەوێتە بەر تانە و توانج و سەرکۆنەی خەڵکییەوە، چونکە ئەو لەو ڕۆژەدا بە تەواوی نیازمەندە و هەژارە و پێوییستی و نیاز بەشێکە لە پێویستییەکانی ئەو و کەماڵی و تەواوی ئادەمی ئەوەیە کە سەبارەت بە بەدەستهێنانی بەرژەوەندی و لابردن و دوورخستنەوەی زەرەر و زیان و خراپە لە خۆی، کارا و پێداگر بێ.

پەروەردگاری مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ الْآخِرَةِ لِيَسُوءُوا وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا الْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا مَا عَلَوْا تَتْبِيرًا﴾ ئەسرا ٧.

واتە: ((ئەگەر لە کاتی دەسەڵاتدا چاکە بکەن، ئەوە هەر بۆ خۆتان چاك و بەسوودە، ئەگەر خراپە و تاوانیش بکەن ئەوە هەر یەخەی خۆتان دەگرێتەوە، جا کاتێك کە نۆرەی ئەنجامدانی بەڵێنی دواجار دێت، ئیمانداران کارێکتان پێ دەکەن کە لە ڕووخسارتاندا ڕەنگ بداتەوە (چونکە ئەوان دڵنیان کە هەموو ئەو بەڵا و ناخۆشییانەی بەسەر گەلانی موسڵماندا بە گشتی، هاتووە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەستی ئەوانی تیایە))، ئەوسا دەبا ئیماندار بچنە مزگەوتەوە وەکو

یەكەمجار چوونە ناوی، دەبا ئیتر ئیمانداران تۆڵەی خۆیان بكەنەوە و دەستیان بەسەر هەرچییەكدا دەڕوات دریغی نەكەن (چونكە ئەوان لە ستەم و زۆرداری و خوێن ڕێژی دریغیان نەكرد))).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿لَيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنْفُسِكُمْ وَمَا تُنْفِقُونَ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لَا تُظْلَمُونَ﴾ بەقەرە ٢٧٢.

واتە: ((ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) هیدایەت و ڕێنموونی و موسڵمان كردنی ئەو خەڵكە لەسەر تۆ نییە (چونكە تۆ تەنها گەیاندنی پەیامەكەت لەسەرە) بەڵام خوا هیدایەت و ڕێنموونی هەر كەسێكی بووێت دەكات، (بە مەرجێك ئەو كەسەش ڕووی دڵی بكاتە ئیمان) هەر خێرێكیش ئەنجام بدەن، ئەوە قازانجەكەی بۆ خۆتانە، ئێوە (ئەی بڕواداران) هیچ شتێك نابەخشن مەگەر بۆ ڕەزامەندی خوا نەبێت و هەر خێرو چاكەیەكیش ئەنجام بدەن پاداشتەكەی دەستتان دەكەوێتەوە، ئەوسا ئێوە بە هیچ شێوەیەك ستەمتان لێ ناكرێت)).

وە پەروەردگاری مەزن (جل جلالە) لە فەرموودەیەكی قودسیدا، كە پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیە وسلم) باسی كردووە و خستوویەتییە ڕوو دەفەرمووێت: ((یا عبادی.! أنكم لن تبلغوا نفعی فتنفعونی ولن تبلغوا ضرری فتضرونی)).

یا عبادی.! انما هی أعمالكم أحصیها لكم، ثم أُوَفّیكم ایاها، فمن وجد خیراً فلیحمد الله، ومن وجد غیر ذلك فلا یلومّن إلا نفسه.[٧٢]

واتە: ((ئەی بەندەكانم.! لە ڕاستی دا ئێوە ناگەنە جێ و شوێنێ تاكو كەڵك و قازانجێكم پێ بگەیەنن و ناگەنە جێ و شوێنێكیش، كە زەرەر و زیانێكم پێ بگەیەنن.!

ئەی بەندەكانم.! ئەوەی كە ئەنجامی دەدەن كاروكردەوەی خۆتانە، كە بۆتانی دەژمێرم و تۆماری دەكەم بۆتان و كاروكردەوەكانتان دەكەمە هۆكاری موعامەلە

---

٧٢ اخرجە مسلم (٢٥٧٧).

کردن لە گەڵتاندا، هەرکەسێ خێر و چاکە ئەنجام بدات، سوپاس و ستایشی پەروەردگاری بکات و هەر کەسێ بە پێچەوانەوە کاری کرد و جووڵایەوە، جگە لە خۆی کەسێکی تر نەخاتە بەر سەرزەنشت و لۆمە کردنەوە)).

## _ ئامانجی خەڵکی کەڵك و قازانجی تۆ نییە:

ئامانج و مەبەستی خەڵکی لە هاوکاری و یارمەتی دان و چاودێری کردنی تو بە پلەی یەکەم خێر و چاکە و بەرژەوەندی تۆ نییە، بەڵکو پێش ئەوە، بەدوای کەڵك و قازانج و بەرژەوەندی ئێستە و داهاتووی خۆیانن!. بەڵام پەروەردگاری بێ نیاز و دەهەندە، ئامانجێکی جگە لە کەڵك و قازانج گەیاندن بە تو ئامانج و مەبەستێکی تری نییە، کەڵك و قازانجێکی پاك، کە هیچ دوودڵی لە بەدەست هێنانی قازانج و بەرژەوەندی و لابردن و دوورخستنەوەی زەرەر و زیان بۆ ئەو بەدواوە نییە. بەڵام ئەو سوود و قازانجەی کە خەڵکی دەیەوێ بەئێوەی بگەیەنێ، هەندێ جار بە زەرەر و زیانی تۆ تەواو دەبێت. ئەگەر چی تەنیا منەت خستنە سەر بێ بە سەر ئێوەوە.

لەم بارەیەوە تێ بفکرە و بیر بکەرەوە.! چونکە ڕووتێکردن و سەرنجدان و تەگبیر کردن لەم بارەیەوە، لە پارێزگاری کردن و دوور کەوتنەوە لە ڕووتێکردن بەرەو درووستکراو و پشت بەستن پێی دوورت دەخاتەوەو دەتپارێزێ و وات لێ دەکات کە بەپێچەوانەی ڕێنموونی شەریعەتی پەروەردگار چاوەڕووانی بەدەست هێنانی کەڵك و قازانج و دوورخستنەوەی زەرەر و زیانیان لێ چاوەڕێ نەکەیت و وابەستەیان نەبیت و دڵیان پێ خۆش نەکەیت، چونکە خەڵکی پێش ئەوەی بەدوای خێر و چاکە و بەرژەوەندی تۆوە بن، بەدوای قازانج و بەرژەوەندی خۆیانەوەن.

ئەمە شتێکە کە لە نێوان زۆربەی خەڵکی دا باوەو لە پەیوەندی و هەڵس و کەوتیاندا ڕوون و ئاشکرایە. منداڵ لە گەڵ دایك و باوکی دا و ژن لە گەڵ هاوسەرەکەی دا و کرێکار لە گەڵ خاوەن کارەکەی دا و شەریك لە گەڵ هاوکار و شەریکەکەیدا، هەمان ئەم ئامانج و مەبەستیان هەیە و دەیگرنە بەر.

کەسێ خۆشبەخت و کامەرانە کە: تەنیا لەپێناو ڕەزامەندی خوداوەندا (جلّ جلالـه) چاودێری و هاوکارییان بکات و چاکەیان لە گەڵ دا بکات و سەبارەت بە ئەوان ترسیان لە پەروەردگار هەبێ، لە ترسی پەروەردگاردا ئەو نەکەنە شەریکی ئەو و هیوا و ئومێدی تەنیا بە خوداوەند هەبێ، لەم هیوا و ئومێدەدا ئەوانی لە گەڵ خوداوەندا هاوتەراز و هاوسان نەکات، ئەوانی لەبەر ڕەزامەندی و خاتری خوا خۆش بووێت و لە خۆشەویستیان لە گەڵ پەروەردگار دوورە پەرێزی بکات و دوور بکەوێتەوە.

بە هەمان شێوە کە دۆستان و خۆشەویستانی پەروەردگار دەڵێن: ﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا﴾ ئینسان ٩.

واتە: ((دەڵێن: بێگومان ئێمە ئەم خۆراکەتان هەر لەبەر خوا و بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەو پێ دەبەخشین، نە پاداشتمان لێتان دەوێت و نە سوپاس)).

## _ خەڵکی کەڵك و قازانجی تۆ نازانن:

هۆکاری نۆیەم ئەوەیە کە: خەڵکی تەنیا کاتێ کەڵك و قازانج و بەرژەوەندی تۆ دەزانن، کەوا پەروەردگار پێیان ئاشنا بکات و تەنیا کاتێ ئەو توانایییەیان هەیە کە خوداوەند تواناییان پێ ببەخشێ و تەنیا کاتێ دەتوانن لە ئەستۆیدا دەربێن کە پەروەردگار ویست و ئیرادەیان تێدا دەستەبەر بکات و بێنێتە دی.

کە واتە تەواوی کاروبارەکان لە کۆتاییدا بۆ پەروەردگارێ دەگەڕێتەوە کە: هەموو شتێ لە ئەوەوە دەستی پێ کردووە و تێکڕای خێر و چاکەکان لەخزمەت ئەودایە و بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە.

لە ئەنجامدا وابەستە بوون و پەیوەست بوون، ترس و پاڕانەوە و دڵەڕاوکێ و ئومێد، ڕووتێکردن، پشت بەستن و بەندایەتی کردن و پەرستشی ئەوان، هەمووی زەرەر و زیانە و کەڵك و قازانجێکی نییە و هەر قازانج و سوودێکیش کە بەدەست بێت، درووست هەمان ئەوەیە کە پەروەردگار بڕیاری لەسەر داوە و خستوویەتییە خزمەتت.

## _ بەرژەوەندخوازی خەڵك:

هۆکاری دەیەم ئەوەیە کە: خەڵکی بەدوای جێ بەجێ کردنی نیاز و پێویستییەکانی خۆیانەوەن لە ڕێگەی ئێوەوە!، ئەگەرچی بە زەرەر و زیانی ئایین و دونیاشتان کۆتایی پێ بێت و بەدوای کەڵك و قازانج و بەرژەوەندی خۆیانەوەن، ئەگەرچی زەرەرو خراپەشی بەدواوە بێت بۆ ئێوە.

بەڵام پەروەردگاری مەزن خێر و چاکە و قازانجی ئێوەی دەوێت و بەدوای ئەوەوەیە کەوا زەرەر و زیان و شەڕ و خراپەتان لێ دوور بخاتەوە، کەواتە چۆن ڕێگە دەدەن کە جگە لە خوا هیوا و ئومێدتان بە کەسێکی تر هەبێ و جگە لە ئەو لە کەسێکی تر بترسن.؟!

کورتەی تەواوی ئەو شتانەی کە باس کران و خرانەڕوو ناسینی ئەم حەقیقەت و ڕاستییەیە کە: ((ئەگەر تەواوی خەڵکی کۆ ببنەوە و هاوکاری و ئاریکاری یەکتر بکەن بۆ ئەوەی زەرەر و زیانێکتان پێ بگەیەنن، ناتوانن پێتان بگەیەنن جگە لەوەی کە پەروەردگار (جل جلالە) بڕیاری لەسەر داوە ناتوانن زەرەر و زیانێکتان پێ بگەیەنن)).[٧٣]

پەروەردگاری مەزن دەفەرموێت:

﴿قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَانَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ سورەتی تەوبە:٥١

واتە: ((ئەی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" تۆش بڵێ: هەرگیز لەوە زیاترمان بۆ پێش نایەت و تووشمان نایەت جگە لەوەی کە خوا بۆی نوسیووین (هەرچیش بۆمان پێش دێت هەر خێرە بۆمان)، ئەو هەمیشە یارو یاوەر و پشتیوانمانە، دەبا ئیمانداران هەر پشت بەو خوایە ببەستن)).

---

٧٣ بەشێکە لە فەرموودەیەك کە ترمزی بەژمارە (٢٥١٦) گێڕاویەتییەوە.

## تەوەری هەشتەم: بەشی کۆتـایی ئەم پەرتووکە:

نە تەنیا مرۆڤ بەڵکو تەواوی گیانلەبەران بـەهۆی ویـست و ئـیرادەوە دەژیـن و هـیچ یەکی لەوانە لە (زانست و ویست و ئیرادە)و کارێ کە لەو ئیرادە و ویـستەوە سەرچـاوە دەگرێ، بێ بەهرە نین و هەر یەکێکیان خاوەنی خواست و بۆ گەیشتن پێی ڕێگەیـەك دەگرنە بەر.

هەندێ جار لە هۆکارێکی تایبەت بەخۆی و هەندێ جاریش لە ئامراز و هۆکارگەلێ لـە دەرەوەی بـوونی خـۆی و لـە هەنـدێ بابـەت و بواریـشدا لـە ئـامراز و هۆکارگـەلێکی دەروونی و دەرەکی پێکەوە بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستەکەی کەڵك وەردەگرێ.

بەگشتی سروشتی تەواوی گیانلەبەرەکان بە تایبـەتی مـرۆڤ بـە جۆرێکـە کـە: داوای شتێ دەکەن و دەتوانن پێی بگەن و لـە ئەستۆی دەربێن و بـۆ گەیـشتن بـە ئامـانج و مەبەستی خۆیان پشت بە شتێ دەبەستن.

ویست و ئامانجیش دوو جۆرە:

**یەکەم:** ئەوانەی کە لە خودی خۆیاندا (لە زاتی خۆیاندا) ئامانج و مەبەستن.

**دووەم:** ئەوەی کە بەهۆی شتێکی ترەوە وەك ئامانج ومەبەستیان لێ دێت. ئـامراز و هۆکارگـەلێ کـە بـۆ هاوکـاریی و ئاریکـاریی لـە پێنـاو گەیـشتن بـەو ئامـانج و مەبەسـتە بەکاری دێ و بە واتایەکی تر یارمەتی و دەست گرۆییان لێ داوا دەکرێت، ئـەوانیش دوو جۆرن:

**یەکەم:** ئەوانەی کە لە خودی خۆیاندا یارمەتی دەروهاوکارن.

**دووەم:** ئەوانەی کە بە شوێنکەوتەوە و ئامرازی ئەو دێنە ئەژمار.

کە واتە سەبارەت بەمە چوار بابەت تەرح دەکرێن:

١. شتێ کە لە زاتی خۆیدا ئامانج و مەبەستە.

٢. کارووبـارێ کـە لـە پەیوەنـدی لـە گـەڵ کارووبارهایـەکی تـر دەکەونـە بـەر سەرنجدانەوە.

٣. شتانێك كە لە زاتی خۆیاندا یارمەتی دەرو هاوكاریكەرن.

٤. لە پەیوەندی بە ئامراز و هۆكار بوونەوە و بە شێوە و جۆرێكی تر دەكەونە بەر سەرنجدانەوە.

مەبەست ئەوەیە كەوا گەر دڵێ ئامانجێكی هەبێ و پێی ئاسوودە ببێت و بەدرووستی خۆشی بووێت و پێویستی بە شتێكە كە بۆ گەیشتن پێی كەڵكی لێ وەربگرێ و داوای یارمەتی لێ بكات.

یارمەتی دانیش داواكراوە و بەكارهێنراوە. پەرستش و داوای یارمەتی كردن لە زۆرێك لە بوارەكاندا (مەسەلەكاندا) پێویست و پێویستكراوی (لازم و ملزوم) یەكترین.

هەر شتێ كە دڵ لە پەیوەندی لە گەڵ ژیان و گوزەران و یارمەتی دان وكەڵك و قازانجی خۆی وابەستەی بێت و دڵی پێ بدات، لە بەرامبەری دا گوێڕایەڵ و تەسلیم دەبێت، ئەگەر چی لە بەر زاتیشی خۆشی نەوێت، لە ڕووەوە خۆشی دەوێت، بەڵام هەندێ جار باروودۆخ بەسەریدا زاڵ دەبێ و دەستی بەسەردا دەگرێت و لەبەری زات و جەوهەر و كەسایەتی (ماهییەتی) خۆشی دەوێت و ئەو ئامانج و مەبەستەی كە لێی هەبووە فەرامۆشی دەكات.

هەندێ جار دڵ شتێكی خۆش دەوێت و بە ئامانج و مەبەستی خۆی لە قەڵەمی دەدات و دەیژمێرێ، بەڵام داوای یارمەتی و هاوكاری لێ ناكات و بۆ گەیشتن پێی پشت بە شتێكی ترەوە دەبەستێ. وەك كەسێ كەوا كەماڵ، پلەو پایە یاخود ژنێكی خۆش بووێت و گیرۆدە و عەودالی ببێت، ئەگەر بزانێ دڵدارەكەی (معشوق) توانای فەراهەم كردنی ئامانج و مەبەستی ئەوی هەیە، پشتی پێ دەبەستێ و لەم كاتەدا و بەم شێوەیە (خۆش ویستن و یارمەتی دانی) ئەو لەسەر یەك ئامانج و مەبەست كۆ دەبێتەوە. لە ئەنجامدا مەسەلەكە چوار تەوەر پەیدا دەكات:

**یەكەم:** خۆشەویست و دڵدارێ كە لەبەر زات و نەفسی خۆی، هەم خۆشەویست و هەمیش یارمەتی دەر دەبێت، ئەمە بەرزترین و گەورەترین جۆرە و هیچ كەس و هیچ

شتێ جگە لە پەروەردگار (جلّ جلالّه) بەم جۆرە نییە و جگە لەو دەبێ لە پەیوەندی لە گەڵ خۆشویستنی ئەودا ببنە خۆشەویست و وەك ئامراز و هۆكار یارمەتی و هاوكارییان لێ وەربگیردرێ.

**دووەم:** شتێ كە بەهۆی زاتی شتێكی ترەوە خۆشەویستە و داوای یارمەتیشیان لێ دەكرێ، وەك دڵدارێ كە توانای ئەوەی هەبێ كەوا ئامانجی خۆشەویستەكەی (عاشق) بەجێ بهێنێ.

**سێیەم:** خۆشەویست و كە بۆ گەیشتن پێی، لە كەس و شتێك داوای یارمەتی بكرێت.

**چوارەم:** هاوكار و یارمەتی دەرێ كە داوای یارمەتی لێ كراوە، لەبەر خاتری خۆی نییە كە ببێتە خۆشەویست.

كاتێ كە ئەم كاروبارانە بناسرێن، ئاشكرا دەبێت كە، كامە لەم چوار جۆرە شایانو شایستەی (بەندایەتی و داوای یارمەتی كردنیان) هەیە و خۆش ویستن و داوای یارمەتی كردن لە غەیری ئەو ئەگەر هۆكارێ نەبێ بۆ خۆش ویستن و یارمەتی دانی ئەو دەبێتە مایەی زەرەر و زیان و شەڕ و خراپەی مرۆڤ و زەرەر و زیانی لە كەڵك و قازانجی زیاترە.

پێویستە لە كۆتایدا بڵێم: "هەرچی كەموكوڕی و ناتەواوی وخەوش و نیازمەندی هەیە، لە پەروەردگاری گەورە و زانا و كاربەجێ و بێ نیاز و بە دەسەلاتەوە دوورە و تەواوی و كامڵی و بێ خەوش و غەشی و بێ كەموكوڕی تەنیا بۆ ئەوە و بەس".

وەرگێڕ

٢٠١٠/٧/٢٤زایینی (خورماڵ)

١٢/شعبان/١٤٣١كۆچی

# ناوەڕۆك